# کاروان عومەر کاکەسوور

# سەدەی یەکەمی خەیاڵ

کۆمەڵەچیرۆک

2003

## پێرست

## ساتێ گوێگرتن لە فرانز کافکا:

«هەر وەک بلێی وشەکان لە هەوای بەتاڵدا کێش بکەم».

١٣ ی دیسەمبەری ١٩١١ «بیرەوەریەکان»

«چی ڕوودەدات گیانەکەم ئەگەر نەمنووسی..؟ لەوە دەچێت کاتی ئەوە بەسەر چووبێ. حەفتەیەک زیاترە هیچم نەنووسیوە. توانیم لەو دەرۆژەی ڕابردوو (لە کاتی کارکردن، ئەگەرچی زۆر پچڕپچڕیش بوو) یەک جار بنووسم. ئەمەش هەموو شتێک بوو. تۆ ناتوانی خۆشت بوێم، لەبەرئەوە نا کە هیچم بۆ خۆم نەنووسیوە، بەڵکو لەبەرئەوەی لە ڕێی «نە»نووسینەوە دەگۆڕێم بۆ پیاوێک، بەد، هیوابڕاو و نیگەران، کە هەرگیز شایانی تۆ نەبێ».

بۆ فلیس.. براغ ٢٣/٢٤ی کانوونی یەکەم ١٩١٢«*»

«وابزانم تۆ چاک دەرکت بەوە نەکردووە، کە نووسین تاقە ئەگەری ناوەوەی بوونمە».

بۆ فلیس.. براغ ٢٠ ی نیسانی ١٩١٣

«پەیوەندییم بە خەڵک و نووسینەوە، پەیوەندییەکی بەتینە.... پێویستم بەوەیە بۆ گۆشەگیریەکان بنووسم، نەک وەکو سۆفییەک، ئەمە بەس نییە، بەڵکو وەکو مردووێک. مانای وایە نووسین خەوێکی قووڵە. کەواتە مردنە».

بۆ فلیس.. براغ ٢٦ ی حوزەیرانی ١٩١٣

«پێویستە زۆر تەنیا بم، ئاخر هەرچیم بەرهەم هێناوە، تەنها دەسکەوتی تەنیاییە».

٢١ی تەمووزی ١٩١٣ «بیرەوەریەکان»

«بایەخدانی ئەدەبییم نییە، بەڵکو من هەر خۆم ئەدەبم.. من بێجگە لەوە نە شتێکی دیکەم و نە شتێکی دیکەش دەبم».

بۆ فلیس.. براغ ئابی ١٩١٣

«فلیس» ئەو کچە بوو، کە کافکا لە براغ ناسی و لە ماوەی ساڵانی ١٩١٢ ــ ١٩١٧دا نزیکەی ٧٠٠ نامەی بۆ نارد.

## هەندێ بیرەوەرییم لەگەڵ نووسینی چیرۆکدا

سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێم، کە من حەز لە ڕووبەڕووبوونەوە ناکەم. پێم خۆش نییە لە بارەی بەرهەمەکانمەوە بدوێم. چاوپێکەوتن لای من مانای جۆرێک لە کۆتایی دەگەیەنێت، ئەوە لە کاتێکدا هەمیشە وا دەزانم لە سەرەتای ڕێگاکەم. ئەگەر هەندێ جاریش وام زانیبێت چەند هەنگاوێکم ناوە و شوێنێک هەیە بەرەو ڕووی دەچم، ئەوا گومانە زۆرەکانی ناو سەرم خێرا پەشیمانیان کردوومەتەوە و ناچار بەرەو سەرەتا گەڕاومەتەوە، بەڵام هەموو جارێ وا هەست دەکەم ئەمە هەمان سەرەتای جاران نییە، کە من لێیەوە هاتووم، بۆیە ڕێگایەکی جیاوازتریش لەوەی پێشوو دەگرم.. ئیدی من دەتوانم ئەوەندە بڵێم، کە نازانم هەنگاو بنێم، یاخود نازانم هەنگاوەکانم دەیانەوێ بەرەو کوێم بەرن. کاتێکیش ئاوڕ لە دواوەی خۆم دەدەمەوە، هەستدەکەم ڕێگاکان نەماون و شوێنپێکانم نابینم. ئەو دیمەنانەم بیرناکەوێتەوە، کە بە لایاندا تێپەڕیوم. کەواتە ئەگەر لێم بپرسن لە کوێ هاتووم و چۆن هاتووم و چییم بینیوە، هیچ وەڵامێکم بۆ خۆشم پێ نییە، چجای بۆ ئەوانەی پرسیارم لێ دەکەن. بەڵێ، من لە چاوپێکەوتنەکان دەترسم و ڕقیشم لێیانە. دەترسم چونکە پرسیارکردن شێوەیەکە لە شێوەکانی کۆنترۆڵ. ئەو تەکنیکانەی لە چیرۆکدا پەنایان بۆ دەبەم و بە ئارەزووی خۆم مەوداکان لە هەر لایەک خۆم بمەوێ فرەوانتری دەکەم، لێرەدا ناتوانم بەکاریانبهێنم و دەبێ لە ڕێگەی وەڵامەوە خۆم بە دەستەوە بدەم. مەبەستم ئەوەیە دەترسم تەعبیر لە بەشێکی خۆم بکەم و بەشەکانی دیکەم هەر بە پەنهانی بمێننەوە، چونکە پرسیاری ئەوانی دی بۆ ئێمە هەمیشە مەرجدارە و جۆرێک لە چاوەڕوانیی خاوەنی پرسیار ئامادەیە،

ئەمە بێجگە لەو مەرجانەی، کە لۆژیکی ڕۆژنامەگەرییش دەیسەپێنێت و داوای بەســەروبەری و شـێـوازی کـۆنکرێتـیـمـان لێ دەکـات. مـن هەمـیـشــە لە پرسیارەکانی خۆمەوە دەست پێدەکەم و دنیای خۆم و کارەکتەرەکانم لەواندا دەخـولّقـێنم. ڕقـیـشم لە چاوپێکەوتنە، چونکە پرسـیـارەکان بۆ ئەو شـوێنانە ئاڕاستەم دەکەن، کە وەکو وتم من تێیاندا نەماوم و ئەو گرنگیەیان لام نەماوە. ڕوونتر بڵێم من تەنها ئەو کاتە هێز لە بەرهەمی خۆمدا دەبینم، کە لەگەڵمدا دەژین و تەواوم نەکردوون، ئیدی دوای ئەوە ئەو بایەخەی جارانیان نامێنێت، بۆیە ناشــتـوانم لە بارەیانەوە بدوێم. ڕەنگە چاوپێکەوتنی هـەندێ نووســەری پێش خۆشم ترسی ڕادەربڕینیان خستبێتە دڵمەوە. ترسی ئەوەی نەبادا منیش خـەرمانەیەک بە دەوری خـۆمدا بکێشم و هەسـتی گوێگر یان خـوێنەر بە لاڕێدا بەرم. هەندێ نووسەر بۆ شاردنەوەی کەموکوڕیی نووسینەکانیان، چاوپێکەوتن بە ڕێگایەکی چاک دەزانن. «ڕۆلان پارت» بە پـێـچــەوانەی زۆر لـە نووســەرانی ئێـمـە لـە چاوپێکەوتن دەترسێ، چونکە وا هـەست دەکـات خـۆی لـەنێـوان دوو مەترسییدا دەبینێتەوە، یەکەمیان لە بارەی هەندێ شتی ئاسایی و ئاشکرا ڕا دەربڕێت و خـەڵک وابزانن ڕۆشـەنبیرە، دووەمیشـیـان زۆر ڕاناوی تاکی یەکەم بەکاربهێنێت و وابزانن ئیگۆیستە. من پێم خـۆشـە پرسـیـار لەبری ئەوەی ئەو خەرمانەیەم بۆ بخولّقێنێت، ڕووتم بکاتەوە.

من لە کاتێکی زۆر دژواردا پێگەیشتم، واتە ساڵی ٨٥ لە قۆناغی ئامادەیی. کـاتێک بوو، سـانسـۆر دەسـتی بەسـەر هەمـوو کون و کـەلەبەری دەزگـاکـانی ڕاگەیاندندا گرتبـوو. گۆڤار و ڕۆژنامـەکان زۆر بە دەگمـەن بەرهـەمی بەپێزیان بڵاودەکـردەوە. نووســەرە چاکــەکــان هەندێکیــان ڕاونرابوون و هـەندێکیــان دەمـکوت کــرابـوون. گــۆڕەپانەکــە بۆ ئەو نووســـەرانە مـــابووەوە، کـــە لـە دامـودەزگاکانی ڕژێمەوە نزیک بـوون، یاخود ئەوانـە بوون، کە بەرهـەمەکـانیـان هیچ کاریگەرییەکیان بەجێنەدەهێشت و دووربوون لە تەنگوچەڵەمە زۆرەکانی ئەو کاتە. دیارە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت، کە لەو سەردەمـەدا جار جار نووسەران یان هونـەرمـەندان مـوغـامـەرەیان نەکـردووە و بەرهـەمی چاکـیـان پێـشکەش نەکردووە، بەڵام ئەو هـەولانە زۆر کـەم بوون. مـەسـەلەکـە بۆ من ئێجگار سـەخت

بوو، چونکە لەو ڕۆژگـارەی کـەمـێ ئازادیی دەربڕین هـەبـوو، من نەناسـرابووم، بۆیە نـەمـدەتوانی لە کـاتێکی ئاوادا خـۆم بسـەپێنم. من هـەر لە سـەرەتاوە وا ڕاهـاتبـووم لە بارەی ئەو بابەتانەوە بـنووسم، کە لـە کۆمـەڵگای ئێمـەدا بە تابوو حـیسـابیـان بۆ دەکـرێت، بۆیە هیچ بەرهـەمـێکم بۆ ئەو گـۆڤـار و ڕۆژنـامـانە دەستـیـان نەدەدا. من یەکـەم چیرۆکم لە پۆلی شـەشـەمی ئامـادەیی نووسی و هـەندێ لە هـاوڕێکانم خـوێندیانەوە. دواتریش کـە لە زانکۆی مـووسڵ وەرگیـرام، کـۆمـەڵێکی دیکەم نووسی، بەڵام نەمـدەتوانی لە هـیـچ ڕۆژنامـە و گـۆڤـارێکدا بڵاویان بکەمەوە. ئەو سانسـۆرەی خۆشم خستبـوومە سەر خۆم قورسـاییەکەی لەوەی دەزگـاکـان کـەمـتـر نەبوو، بەتایبـەتی دوای ئەوەی بووم بە کـۆمـۆنیست. هـەروەها ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەکان هـەمیشە ئەرکیان ئەوە بووە کۆمەڵێ دەمـامک بۆ وشـە دابتاشـن و وا لە خـوێنەر بکەن نووسـەر وەکـو تەلیـسـمـێک ببـینێت. ئەمـەش ئـەو مـەرجـانە دەسـەپێنێت، کـە کێ بۆی هەبێ نووسـەر بێت. ئەمـانە تێکڕا خـوێنـەر دەخـەنە سـەر ئەو باوەڕەی، کـە ئەو وشـانەی لـەسـەر لاپەڕەی ڕۆژنـامــە و گـۆڤـار و کـتـێـبـدا دەنووسـرێن، یان لە ڕادیۆ و پشت مـایکرۆفۆنەوە دەبیسـترێن، هـەرگیز وشـەی ئەوان نین و دەنگی ئەوان مەحاڵە لەوان بچن. ئەوانـە سـەر بە مـەرجـەعێکن، کـە نابێ پرسـیـاریان لێوە بکرێت و گومـان هـەڵناگـرن. جـا ئـەو مـەرجـەعە ئاینە یان ئایدۆلۆجـیا یان خـێڵ و هەر شـتێکی دیکە. ئەمڕۆ تێکشکاندنی ئەم مـەرجـەعە و لابردنی ئەو مـەرجـانە لە بـەردەم خــوێنـەری ئێـــمــــە بـۆ بـەشـــداریکـردن لە پـرۆســــەی نووسـین و تەعبیـرلەخۆکردن، بەشێکە لە ئەرکی ئەو نووسـەرانەی، کە دەیانەوێت گۆڕان لە ئەدەب و فکردا بکەن. گـێـڕانـەوەی ئیـعـتـیـبـار بـۆ ئەدەب و فکری زارەکی «شـفـهی»، کـە خـەڵکانێک بەرهـەمی دەهـێنن و دەزگـاکـان ڕێگای دەربڕینیـان لێ گـرتوون، فـەزایەکـی فرەوان لە جـیـهـانی نووسـینی ئێمـەدا پێکدەهێنێت و زۆر ناوی سـاختـەش، کە زمـانی ڕۆژنامـە خـوڵقـاندوونی، دەکەونە ژێر پرسـیـارەوە. ئێمە ڕۆژانـە دەیان نوکتـەی سـەیر سـەیر دەبیسـتین، کە هـەر یەکـەیان هەڵگری کـۆمـەڵێک قـوولّی و ڕەهەندی فکری و هـونەرییـە، دەیـان تەکنیکی بـەهێـزی گێڕانەوەیان تێدایە. خاوەنی ئەو نوکتـانە، هیـچیان نووسـەر نیین، چونکە ئەگەر

وابووایە نەماندەبیستن و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا لە شێوەی کورتیلەچیرۆک و چیرۆکدا دەمانخوێندنەوە. ئەوانە زۆر لەو نووسەرانە داهێنەرترن، کە بە زمانێکی ساکار ڕووداوەکانی بەرچاوی خۆمانمان بۆ دەگێڕنەوە. من پێم وایە کاتی ئەوە هاتووە خۆمان لە بەردەم ئەوانەدا ڕووتکەینەوە و هەموو ئەو خەرمانانە تێکبشکێنین، کە ئەو جیاوازییە وەهمییەی بۆ ئێمە و بۆ ئەوان خوڵقاندووە. دەیان شیعر و چیرۆک و ڕۆمان بە زمانی زۆر ساکار و دوور لە چێژی هونەری دەکەونە کتێبخانەکان و ناوی شاکاریان لێ دەنێن. دڵنیام ئەو دەنگانەی چاوبەست کراون و بوارەکانیان لە بەردەم تەنیون زۆر لەو نووسەرانە هونەرمەندترن. ڕەنگە ئەمە مەسەلەیەکی گرنگ بێت و ئێمە نەتوانین لێرەدا هەموو گۆشەکانی بخەینە بەر ڕۆشنایی، بەڵام دەمەوێ بڵێم منیش یەکێک بووم لەو خوێنەرانەی تەلیسمم لێ کرابوو و لەژێر ئەو کاریگەرییەدا نووسینم بە هەقی خۆم نەدەزانی. من ئەگەرچی لە ساڵی هەشتاوپێنجەوە دەنووسم، بەڵام تا کۆمەڵەچیرۆکی «ئەسپیدیلۆن»م بە چاپ نەگەیاند، بێجگە لە هەندێ نووسەر و ئەدەبدۆست نەیانناسیبووم. دەبێ ئەوەش بڵێم پێش ئەوە هەر خۆم بە شێوەیەکی زۆر خراپ هەندێ لە چیرۆکەکانم لەژێر ناونیشانی «ئەستێرە»دا چاپ کرد و برادەرێکیش بە هەمان شێوە چیرۆکی «ئەسپیدیلۆن»ی بۆ بڵاوکردمەوە، کە پێی وابوو دەبێ بە ڕۆمان حیساب بکرێت نەک چیرۆک. من بە شەرمەوە بۆ هەندێ نووسەر و ئەدەبدۆستم ناردن. یەکێ لەوانە کاک «ڕەفیق سابیر» بوو، کە لە نامەیەکیدا سەرسامیی خۆی لە ئاستی ئەو بەرهەمانەدا دەربڕی بوو. ئەمە بۆ منێکی شەرمن هێزێکی گەورە بوو. هەر کاک «ڕەفیق سابیر»یش ئامادەیی خۆی پیشان دا، کە ئەو چیرۆکانە و هەندێکی دیکەم لە بەرگێکی جواندا بۆ چاپ بکات. من ددانی پێدا دەنێم، کە ئەگەر کاک «ڕەفیق سابیر» نەبووایە تا ئەمڕۆش نەمدەتوانی وەکو نووسەرێک خۆم بناسێنم. «ئەسپیدیلۆن» دەرگای لەسەر دنیای داخراوی من کردەوە و لەو ڕێگایەوە پەیوەندیم لەگەڵ زۆر نووسەر چ لە کوردستان و چ لە دەرەوە پەیدا کرد. هەندێ نووسەریش دەربارەی ئەو بەرهەمەیان نووسی لەوانە مامۆستا ئەحمەد محەمەد

ئیسماعیل، ئارامی کاکەی فەللاح، بەختیار عەلی، جەبار جەمال غەریب، عەبدوڵموتەڵیب عەبدوڵلا. زۆریشیان بە نامە ڕاوبۆچوونی خۆیان بۆ نووسیوم. پێشتریش هەندێ لە هاوڕێکانم چ لە قۆناغی دواناوەندی و چ لە زانکۆ چیرۆکەکانمیان دەخوێندنەوە و هانیان دەدام. لەوانە فرسەت زوبێر ڕۆژبەیانی و عەزیز حەسەن مەولان. من قەرزاری فرسەت زوبێر ڕۆژبەیانیم، کە لە قۆناغی ئامادەیی و زانکۆ پێکەوە بووین. خوێنەرێکی زۆر چاکی ڕۆمان و چیرۆک بوو و تا ئێستاش بەردەوامە. ئەو زۆر هانی دەدام، هەندێ جار گلەییشی لێ دەکردم، کە من ئەوەندە سانسۆر دەخەمە سەر خۆم و بەرهەمەکانم بڵاوناکەمەوە. کاک «سابیر ڕەشید»ی چیرۆکنووس، کە لە ڕێگای یەک دوو برادەرەوە زانیبووی من چیرۆک دەنووسم، بووە هاوڕێم و زۆر حەزی دەکرد من لە نووسین بەردەوام بم و بەرهەمەکانم بڵاوکەمەوە، بەڵام من هەرگیز نەمدەتوانی خۆم بە چیرۆکنووس بزانم. هەرچۆنێ بێت ئەو بایەخدانەی کاک «سابیر» بۆ من وزەیەک بوو. جارێکیش کتێبی «شەپۆلی هۆش لە ڕۆمانی تازەدا»ی «ڕۆبەرت هەمفری»م لێ قەرز کرد، کە یارمەتیدەرێکی باش بوو بۆئەوەی پەرە بەو شێوازەی نووسینی خۆم بدەم.

ئەو فەزایەی لەگەڵ ڕاپەڕیندا هاتە کایەوە، ڕۆشنبیریی ئێمەی گەیاندە قۆناغێکی تر. هەندێ نووسەری جددی هاتنە گۆڕەپانەکە و بەرهەمەکانیشیان کاریگەریی چاکیان بەجێدەهێشت. بێگومان ئەوانە کاریگەریی زۆر زۆریان هەبوو نەک لەسەر من، کە ددانی پێدا دەنێم، بەڵکو لەسەر ئەوانەیش، کە نکوڵیی لێ دەکەن و بەشێوەیەکی شاراوە دژایەتییان دەکەن. زمانی ئێمە پێشتر هەرگیز ئەو هەموو گۆڕانەی بە خۆیەوە نەدیبوو. ئەو نووسەرانە بەر لە هەرچی ئەو تێگەیشتنەی ئێمەیان لە بارەی زمانەوە گۆڕی. تا پێش ڕاپەڕینیش ئێمە هەندێ پێناسەی زۆر نارێکمان هەبوو بۆ زمان، بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنی ئەوان نەدەکرا چیتر ئیشیان پێ بکەین. ئیدی زانیمان زمان خۆی بوونی نییە و دەخوڵقێنرێت. بۆئەوەی نووسەرێکیش هەبێت، ئەوا پێویستە لە ڕێگای زمانی خۆیەوە دەرکەوێت. من ئەوەش دەزانم ئەوەی خۆی نووسەر نەبێت، کەس ناتوانێت بیکات بە نووسەر، بەڵام لەگەڵ هەموو بزافێکی

ڕۆشنبیری، کۆمەڵێک بەهرە دەتەقنەوە و وزەی زیاتر وەردەگرن. من دەبێ لێرەشدا ئەوە بڵێم، کە سەرەتا بە دژایەتیەکی ساکارانەی ئەوان دەستم پێکرد، تەنانەت لە نامەیەکمدا، کە لە ئەڵمانیا بۆ نووسەرێکی ناسیاومم ناردووە، وتوومە دەبێ ڕێ لەو دەنگانە بگیرێت. ئەو سەردەمە من دژی زۆر نووسەری باش بووم، کە دواتر بە ئاگا هاتمەوە و ئەو دژایەتیەی خۆشمم لێ نەشاردنەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی من هێشتا لەژێر کاریگەریی ئایدۆلۆژیادا بووم. من نامەوێ بڵێم پێش ئەوان ئێمە نووسینی چاکمان نەبووە، بەڵام گۆڕانی نەوەدەکان لە هەموو گۆڕانەکانی پێش خۆی گەورەتر بوو و تا ئێستاش بەردەوامە. هەروەکو چۆن بە دیوەکەی دیکەشیدا شکستەکانی لە هەموو شکستەکانی پێش خۆی گەورەتر بوون. ئەو نووسەرانەیش تەنها ئەوانە نیین، کە ئێستا گۆڤاری «ڕەهەند» دەردەکەن، بەڵکوو لە دەرەوەی ئەو گۆڤارەیەش کۆمەڵێ نووسەری دیکەی چاک دەرکەوتوون و پێشتریش هەبوون، کە من پێم وایە دەتوانن درێژە بەو ڕەوتە بدەن. من لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە تا سەرەتای نەوەدەکان لەژێر کاریگەریی ریالیزمی سۆسیالیستیدا بووم، بەڵام لە نووسیندا هەمیشە هەندێ سەربەستییم بە خۆم ڕەوا دەبینی و هەرگیز باوەڕم بە ئەدەبی زۆر زەق نەبووە. ڕاستە هەندێ لە چیرۆکەکانم، بەتایبەتی دوای ساڵی ٨٧ بە ناچاری چوونە ئەو قاڵبەوە، بەڵام زۆریشیان دەرباز بوون. لە بواری خوێندنەوەشدا هیچ دەقێکم بە حەرام نەدەزانی و زۆر نووسەرم بە داهێنەر دەزانین، کە دژ بە بیروباوەڕەکەی من بوون. هەر چۆنێک بێ ئەمە بۆ من ئەزموونێکیش بوو، کە پێم وایە ناکرێ تەنها هەر لایە خراپەکەی ببینم، بەڵکو لە نزیکەوە لەگەڵ توێژێکی دیکەی خەڵک ژیام و وەک چیرۆکنووسێک زۆر لایەنی شاراوەی دیکەی ژیانی ئەو کۆمەڵگایەی خۆمم بەسەر کردەوە.

زانکۆ بۆ من گۆڕانێکی گەورە بوو لە ژیانی نووسینمدا. یەکەمجارم بوو دوور لە کەسوکارم بژیم و متمانە بکەمە سەر خۆم. هەستم بە جۆرێ لە سەربەستی دەکرد و دەمتوانی زۆر شتی تازە ئەزموون بکەم، کە پێشتر لەژێر سانسۆری باوکدا نەمدەتوانی. هەروەها خەڵکی شوێنی جۆراوجۆرم ناسی و

بە دیالێکتیکەکانی دیکەی زمانی کوردی و عەرەبی ئاشنا بووم. هەر لەوێ زیاتر لە ڕەگەزی ئافرەت نزیکبوومەوە. ئەگەر پێشتر تەنها لە ڕێگای بینینەوە مامەمەڵەم لەگەڵ ئەو ڕەگەزەدا دەکرد و کۆمەڵێ ئایدیام لەسەر خولقاندبوون، ئەوسا بە هۆی زمانەوە دەمتوانی ئەو ئایدیایانە تێکبشکێنم و هی دیکەیان لە جێگا دابنێم. جاران وەکو گشتێک مامەمەڵەم لەگەڵ چەمکی ژن دەکرد، بەڵام لە ڕێگای ئەو پەیوەندیانەمەوە فێری جۆرێک لە جیاکاری بووم، کە ئەمە هەر خۆی یەکێکە لە تەکنیکەکانی نووسینی چیرۆک. شێوەی قسەکردن و لەرەی ناو دەنگی ئافرەتێک لە هی یەکێکی دی جیاواز بوو و سەرنجیان ڕادەکێشام. وشەکان هەر وشە بوون، بەڵام جۆری دەربڕینەکان لە یەکتریان جیا دەکردنەوە. بە دیقەتەوە گوێم لێ دەگرتن و بە وردی بەراوردم دەکردن. جارێکیان عەیارێکی خەڵکی سلێمانی بەو شێوە ناسکەی خۆی پێی وتم: «شەو بەدەم ئازارەوە خەبەرم بووەوە». ئەوە چ پاردۆکسالێکی سەیر بوو..؟! چۆن توانی بەو شێوە خۆشە باسی نەخۆشی بکات..؟! چۆنی توانی لە ناخەوە هەڵمەتەکێنێ و لەناو خەیاڵەکانمدا نغرۆم بکات..؟! ئێرەییم پێی برد و لە دڵی خۆمدا وتم: «ئەی خوایە گیان کەی بێت منیش ئاوا بەدەم ئازارەوە خەبەرم بێتەوە..!!». بەڵام نا، مەحاڵ بوو من وەکو ئەو بتوانم تەعبیر لە نەخۆشی و خۆشیەکانی خۆم بکەم، بۆیە دەبووایە کەسێکی دی بخولقێنم تا لەجیاتی من ئاوا بە ناسکی بدوێ. کاتێکیش هەستم دەکرد تێیدا سەرکەوتوو نیم، یەکێکی دی و دووانی دی و دەی دیم دەخولقاند. ژیانم پڕی بوو لە ئافرەت و هەر نەمتوانی کەسێکی وەکو ئەو بخولقێنم. ماڵی قوتابیان «قیسمی داخیلی» جوانیی خۆی هەبوو و خەڵکم لە حاڵەتی زۆر تایبەتدا دەدی. دەمەوێ بڵێم ئەو کۆت و پەیوەندەی ئەوان بە ڕۆژ لە ترسی ئەوانی دیکە لەسەر خۆیان دادەنا، هەر لە پۆشینی جلوبەرگی ڕێک و بۆیەکردنی پێڵاو و بایەخدان بە قژ و بە دەموچاو، لەوێ، لە ماڵی قوتابیان نەدەما و دەمتوانی هەقیقەتەکانیان بەبێ هیچ رتووش و ماکیاژێ ببینم. ماڵی قوتابیانی ژمارە ١٥ کۆنە کەنیسەیەک بوو و لە شوێنێکی زۆر چەپیشدا بوو. لە تەنیشت ئەو کۆنە کەنیسەیەوە ماڵی کچێکی عازەبی شێت هەبوو، کە ڕۆژانە سەری شۆڕدەکردەوە و قوتابییەکان

گاڵتەیان لەگەڵدا دەکرد. دیمەنێکی زۆر ترسناکی هەبوو. وا بڵاوبووەوە کە ئەو کەنیسەیە جنۆکەی تێدایە. ئەوە بوو یەک دووانێکیان «بینیان!!» و بوورانەوە. هەر لەو ماوەیە یەک دوو کوڕ لە ماڵی قوتابیانی شوێنێکی دی خۆیان سووتاند و بوون بە قەرەبرووت. ئەم ڕووداوانە زۆر کاریان کردە سەر فەنتازیای من و هەر ئەوسا چیرۆکی «خێو»م نووسی، کە دوایی لە ۹٥ هەندێ دەسکارییم کرد و لەگەڵ کۆمەڵەچیرۆکی «ئەسپیدیلۆن»دا بڵاوم کردەوە.

هاوڕێیەکم پرسی ئەسپیدیلۆن کە بنیاتنانەوەی فەزای هەشتاکانە لە نەوەدەکان. ئایا نەدەکرا لە کاتی خۆیدا بنووسرایە؟

کۆمەڵەچیرۆکی ئەسپیدیلۆن لە مەنفا نووسراوە، لە ئەڵمانیا و لە دانیمارک، بەڵام لە ڕاستییدا ئەسپیدیلۆن دنیای ئەو کارەکتەرانەیە، کە دەیانەوێت لە ڕێگای یادەوەرییەوە ژیانی بەسەرچووی خۆیان بخوڵقێننەوە. تێکچوونی هارمۆنیەتی نێوان جەستە و بیر بابەتی هاوبەشی چیرۆکەکانە. بۆیە ناکرێت دەستنیشانی کات و شوێنێکی دیاریکراوی بۆ بکەین. فۆرمی چیرۆکەکانیش بە شێوەیەکە، کە سنوورەکان دەبەزێنن و خۆیان بە دەست هیچ پێناسەیەکەوە نادەن. جیاوازی زۆرە لەنێوان بەرجەستەکردنی کات لە ئانی خۆی و بیناکردنەوەی لە ڕێگەی یادەوەرییەوە. ئەمە ئەو هزرەیە، کە «مارسێل پرۆست» ڕۆمانی «گەڕان بە دوای کاتی ونبوودا»ی لەسەر بنیاتناوە. جیاوازی زۆرە لەنێوان «مارسێل»ی ئێستای حیکایەتخوان کە ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە لەگەڵ «مارسێل»ی ڕابردوو، هەروەها لەگەڵ «مارسێل پرۆست»ی نووسەری ڕۆمانەکە. جیاوازیەکی دیش هی شوێنەکانە، وەکو خۆی دەڵێت مەحاڵە ڕۆژێک لە ڕۆژان بتوانین بۆ ئەو شوێنانە بگەڕێینەوە، چونکە ئەوان لە شوێندا نەماون و چوونەتە ناو کاتەوە، بۆیە ئەنجام دوای ئەو هەموو بەش و لاپەڕەیە، دوای ئەوەی بە هەموو کونوکەلەبەری ساتەکانیدا دەچێتەوە، کەچی هەستدەکەین نەیتوانیوە ژیانی خۆی بخوڵقێنێتەوە. ئەمەش لەبەرئەوەیە، کە زمان جۆرێک وەهمی هەڵخەڵەتێنەر لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت. ڕابردوو دەبێت بە خەون، ئیتر گێڕانەوە لە ئارادا نامێنێت، بەڵکو هەموو هەوڵێک بۆ گەڕانەوە لە ڕێگەی لێکدانەوە مەیسەر دەبێت.. لە بەردەم لێکدانەوەی خەونیشدا وەکو «فرۆید»

بۆی چووە، کۆمەڵێ بەربەست هەن، یەکێ لەوانە بوون بەویدی «تقمص»ە. جا ئەو بوون بەویدی «تقمص»ە لە کارەکتەر بێت، یان ڕووداو یاخود کات و شوێن. «ئەسپیدیلۆن» دەتوانێت کۆمەڵێ سیگناڵی کات و شوێنی هەشتاکان دەربخات، بەڵام مەحاڵە بتوانێت ئەو سەردەمە و بەتایبەتیش زانکۆی مووسڵ و قەڵای هەولێر و گەڕەکەکان، کە شوێنی ڕووداوی زۆربەی چیرۆکەکانن، بخوڵقێنێتەوە. ئەگەر واش بکات لەوە دەردەچێت، کە چیرۆک بێت و دەگۆڕێت بۆ شتێکی دیکە. هەر ئەمەشە تامەزرۆیی دیکەم لا دەخوڵقێنێت و وام لێدەکات لە نووسینی چیرۆکی تر بەردەوام بم. ئەو بەردەوامییەش بە جۆرێکی زۆر جیاواز چ لە ڕووی بابەت و چ لە تەکنیکی گێڕانەوە، چ وەکو زمان و چ وەکو کارەکتەر لە ڕۆمانی ئای لەڤیلیا لەڤیلیادا دەردەکەوێت. کەچی ئەو بەرهەمەم بە پێچەوانەی ئەسپیدیلۆن مشتومڕی نەهێنایە کایەوە. ئای لەڤیلیا لەڤیلیا..!! بە شایەتیی هەندێ لەوانەی خوێندوویانەتەوە، تێکستێکی ئاسان نییە. من لێرەدا خۆم لەوە دەپارێزم، باسی ئەو تەکنیکانە بکەم، کە لەو ڕۆمانەدا بەکارهاتوون و دەست ناخەمە سەر بیرۆکەکان و بەلای سومبولەکانیشدا ناچم و هیچیش لە بارەی زمانەکەیەوە نادوێم، چونکە نامەوێ تێگەیشتنی ئەوانە بەرەو چەند گۆشەیەک ئاڕاستە بکەم، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەیانەوێ لێی بکۆڵنەوە، بەڵام بە بۆچوونی من ئەو بێدەنگییە زیاتر لە هۆیەکی هەیە و دەکرێ من لێرەدا یەک دووانێکیان دەستنیشان بکەم. ئەو ڕۆمانە تەنها چوارسەد دانەی لێ چاپکراوە و بەشێکی کەم خوێندوویانەتەوە. ئەو تابلۆیەی کراوە بە بەرگی کتێبەکە هی «نەوال»ی هونەرمەندە، کە لەگەڵ ناوی کارەکتەری سەرەکیی ڕۆمانەکە جۆرێ موفارەقە دێنێتە کایەوە، بەڵام برادەرانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ناوەکەیان لابردووە. ئەمە لەبەر هەر هۆیەک بێت، کاری کردۆتە سەر ناوەڕۆکی تێکستەکە، چونکە «نەوال»یش بێجگە لەوەی گۆرانیبێژە، هونەرمەندی شێوەکارییشە. بێجگە لە «نەوال» زۆربەی کارەکتەرەکانی دیکەش هەر عەرەبن و شوێنی سەرەکیی ڕووداوەکان شاری بەغدایە. ڕۆمانەکە پێشکەش بە دوو نووسەر کراوە و ئەوانیش وەکو ئاگامان لێیە دژایەتییان زۆر دەکرێت. ئەم تێکستە لە کاتێکدا چاپدەبێت، کە

ئەدەبی شارەکان لە بڕەودایە و بیری خێڵەکیانە و تایفەگەرێتی و شارگەرێتی لە هەموو سەردەمێکی دیکە زیاتر لە ئەدەبی ئێمەدا زاڵە. هەروەها ئەو تێکستە هەموو تابووەکان تێکدەشکێنێت و شەڕ بە قەناعەتەکان دەفرۆشێت. گومان دەخاتە ناو کولتووری ئێمە. من دەمتوانی ژیانی واقیعیی «نەوال جابر» وەکو خۆی بنووسمەوە، کە زۆر کەسی دیکەش وەکو من ڕۆژێک لە ڕۆژان ناسیویانە، بەڵام هونەری نووسینی ڕۆمان ڕێگر بوو لە بەردەمی ئەو کارەدا. پێشتریش چیرۆکی «دەرگای چواردەری»م پێشکەش بە خۆی و بە «فەریال»ی خوشکی کردووە. «فەریال» دەیوت: «تا ئەو ڕۆژەی بستێ خاکی کوردستان لەژێر دەستی نەتەوەکەمدا بێت، من کوردم و عەرەب نییم»، بەڵام هەرگیز نەدەکرا بەو شێوەیەی هەیە، خەڵقی بکەمەوە، چونکە دەمزانی من لە بەردەم کارێکی هونەرییدام. نەوال شایانی ئەوە بوو بکرێت بە کارەکتەری ئەو ڕۆمانە، چونکە مرۆڤێکی ئاسایی نەبوو و ژیانی پڕی بوو لە موفارەقە. دواجار من پێم وانییە هێزی تێکستێک لەوەدابێ، کە زۆر لەسەری دەنووسرێت. ئەو بەرهەمانەیش کەس پەسەندیان ناکات، مانای وانییە لاوازن. جیمس جۆیس کاتێ لە سەرەتای سەدەی ڕابردوو ڕۆمانەکانی دایە دەزگای چاپ، بۆیان ناردەوە و نووسەرانی وەک لۆرانس و فەرجینا ۆلفیش گاڵتەیان پێ کرد، کەچی لە کۆتایی سەدە لە دوو ڕیفراندۆمدا، کە دەزگای ترستۆن و راندۆم هاوس پێی هەستا بوون، یەکەمی هێنا و لە سێیەمدا چوارەم بوو.. مارسێل پرۆستیش بە هەمان شێوە لە ریفراندۆمی ١٩٩٩ بە دووەم دەرچوو. لەم چەند ساڵەی دواییدا هەندێ بەرهەمی زۆر لاوازیان لە ئێمە کردۆتە شاکار، بەڵام دڵنیام ئەوانە بەرگەی چەند ساڵێکی دیکە ناگرن.

من هەر لەو ڕۆژەوە چیرۆک دەنووسم، باوەڕم وابووە دوو جۆر شت هەن، ئەوانەی گیانیان لەبەرە و مانایان هەیە، ئەوانەی بێگیانن و مانایان نییە، من هەمیشە ئەوەی دووەمیانم مەبەست بووە. واتە خوڵقاندنی گیان و مانام بە ئەرکی سەر شانی خۆم زانیوە. هەرگیز نەمویستووە لاسایی واقیع بکەمەوە، چونکە واقیع لای من چیرۆکنووسێکە و هەموو ساتێ چیرۆکەکانی خۆی دەنووسێ، بۆیە من وەکو چۆن نامەوێ لاسایی هیچ چیرۆکنووسێکی دی

بکەمەوە، هەر بەم شێوەیەش نامەوێ لاسایی واقیعیش بکەمەوە. فەنتازیا بۆ من ئەو دنیایەیە، کە لە نەبوونەوە دەبێ بیخوڵقێنم و پێش هەر کەسێکی دیکە، خۆم لە ئاستیدا سەرسام بم. لای من جیاوازیی نێوان چیرۆکی فەنتازی و هی واقیعی ئەوەیە، کە یەکەمیان هەموو شتێک لە هەرە بچووکەوە تا هەرە گەورەی دەبێ چیرۆکنووس خۆی خەڵقی بکات، دیارە ئەمەش بەر لە هەرچی پێویستی بە زمانێکی جیاوازە، بەڵام لە چیرۆکی واقیعییدا شتەکان هەن و چیرۆکنووس دەستنیشانیان دەکات. دەتوانم بڵێم نووسینی چیرۆکی فەنتازی وەکو ئەوە وایە دنیایەکی جیاواز لەو دنیایە بخوڵقێنی، بەڵام چیرۆکی واقیعی ئەوەیە تۆ لە دنیایەکدا ماڵێک هەڵدەبژێریت، دەشێ ئەو ماڵە زۆر جوان بێت، بەڵام تۆ دروستت نەکردووە، بەڵکو خۆی هەیە. هەر بەم پێودانگە ئەو چیرۆکنووسەی لە نووسینی چیرۆکێکی واقیعیدا سەرکەوتووە لای من هەرگیز ئەوەندەی ئەو چیرۆکنووسە دەستەڵاتی نییە، کە لە نووسینی چیرۆکێکی فەنتازییدا سەرنەکەوتووە، چونکە پێم وایە ئەوەی دووەمیان هەموو کاتێ دەتوانێ لەو جۆرە چیرۆکانە بنووسێ.. بەڵام بۆ واناکات..؟! ئەمە نهێنیی نووسینە. نموونەش ئەو چیرۆک و ڕۆمانانەن کە دەربارەی ئەنفال و هەڵەبجە نووسراون. مێژوو هەمان مێژوو و شوێن هەمان شوێن و کارەکتەر هەمان کارەکتەری ناو واقیعە. ئەوە بێجگە لەوەی بە زمانێکی زۆر ساکار و دوور لە هەموو جوانکاری و قووڵییەک نووسراون. لەم ساڵانەی دواییدا هەندێ لە سەرکردە و لێپرسراوەکانی شۆڕش بیرەوەریی خۆیانیان نووسیوەتە. دەرکەوتووە ئەوان خۆیان زۆر لەو چیرۆکنووسانە هونەرمەندترن، کە ساڵەهایە لە پەنا گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەوە لافی چیرۆکنووسین و ڕۆماننووسین لێ دەدەن.

چیرۆکنووسین بۆ من پرۆسەی گەڕانە بە دوای نهێنیەکان، بەڵام هەرگیز دۆزینەوەم مەبەست نییە، چونکە دۆزینەوە واتە دەستنیشانکردنی سنوورەکانی تێکست. بۆیە زۆر جار لەسەر ئەو کەسانە دەنووسم، کە هەرگیز نەمناسیون. ئەو شوێنانە هەڵدەبژێرم، کە شارەزاییم کەمە لەسەریان، یان بە هیچ شێوەیەک نەمدیون. ئەمە ناچارم دەکات خۆم هەموو شتێ خەڵق بکەم. تەنانەت ئەو بابەتانەی لە ژیانی تایبەتیی خۆشمەوە وەریاندەگرم، تێکەڵ بە

هەندێ ڕووداوی دیکەیان دەکەم و هەوڵ دەدەم ئەتمۆسفێرێکی وا بخوڵقێنم، کە بە لای خۆشمەوە سەیر بێت. ڕۆمانی ئای لەڤیلیا لەڤیلیا..!!شم هەر لەو تێڕوانینەوە نووسیوە. ویستوومە لەو شتانەی کەس بە گرنگیان نازانێ، دنیایەک بخوڵقێنم.

ماوەیەکە لە هەموو کاتێکی دیکە زیاتر باس لەوە دەکرێت، گوایە هەندێ نووسەر بەناوی ئەدەبەوە وڕێنە و شتی هەلەقومەلەق دەنووسن. ئەمە شێوازێکی دیکەی سڕینەوەی جیاوازیەکانە. ئەگەر بڕوانیتە مێژووی ڕەخنەی ئێمە، ئەوا بۆت دەردەکەوێ کە هەمیشە هەندێ تەکنیکی ساکار هەن، ڕەخنەگری ئێمە دەیەوێ لە ڕێگایانەوە دەست بەسەر تێکستێکدا بگرێت و هەموو بەهاکانی ناوی بکوژێت. یەکێ لەو تەکنیکانەش ناولێنانە. عەبەسیەت و وجوودیەت و سریالیزم و کۆمەڵێ ناوی دیکە دەکرێنە قاڵبی تێکستێک و بە زمانێکی هەژارانە سادەیان دەکەنەوە. ئەمڕۆش هەر تێکستێک لێی تێنەگەن و بە ئاسانی نهێنیەکانی دەرنەکەوێ، بە وڕێنەی دەزانن. بەڵام خۆ وڕێنە هەر خۆی ئەو چەمکەیە، کە دەبێت لێی بکۆڵینەوە. وڕێنە بەپێی تێگەیشتنی «فرۆید» یەکەم ئەو جۆرە نەخۆشیەیە، کە کاریگەریی ڕاستەوخۆ ناکاتە سەر جەستە و تەنها بە سیمای سایکۆلۆژی دەردەکەوێت، دووەم وڕێنە خەیاڵپڵاوێک بۆ نەخۆش دەخوڵقێنێت، کە کۆنترۆلی دەکات و دەبێتە بکەری هەڵسوکەوتەکانی. کەواتە وڕێنە دەتوانێت کاریگەر بێت، هەر بۆیە «فرۆید» باسێکی گرنگی بە ناوی «وڕێنە و خەون لە هونەردا» نووسی. وڕێنە لەو چیرۆک و ڕۆمانانەی بە شێوازی شەپۆلی هۆش نووسراون و لە ئەدەبی سریالیزمیشدا کاریگەرییەکی گەورەی هەیە و چاوگی داهێنانە. من خۆم لە چیرۆکی «دەرگای چواردەری»دا وڕێنەم وەکو تەکنیک بەکارهێناوە و زمانی دوو کارەکتەرم پێ گۆڕیوەتە سەر هێما. لە «ئای لەڤیلیا لەڤیلیا..!!»شدا بە شێوەیەکی دی تەوزیفم کردووە، کە وەکو پێشتر وتم نامەوێ لێیەوە بدوێم. هیچ دەقێک نییە مانای لەگەڵ خۆیدا هەڵنەگرتبێت. جا ئەو مانایانە چەند قووڵن، چەند کاریگەرن، ئەمەیان شتێکی دیکەیە و دەبێت بە شێوەیەکی تریش لێیانەوە بدوێین. وەرە سەیری هونەری فۆتۆگراف بکە، کە ڕەنگە سادەترین

هونەر بێت. کامێرایەک بەشێکی شتەکان وەکو خۆی دەگوازێتەوە سەر پارچەکارتۆنێک، بەڵام هەر یەکێ لەو وێنانە بەبێ ویستی ئێمە دەیان مانایان بە خۆیانەوە گرتووە. تۆ ئەگەر بێیتە ژوورەکەی من، ئەوا هەر خێرا نیگای چاوت دەکەوێتە سەر وێنەی دەبابەیەک و وادەزانی من عەشقی چەک و تەقەمەنیم، بۆیە ئەو وێنەیەم بە دیوارەوە هەڵواسیوە، بەڵام کاتێ جوان دەڕوانیت و دەبینیت ژنێک منداڵێکی هەشت نۆ مانگانی خستۆتە سەر لای پێشەوەی ئەو دەبابەیە و بە کەوچک ماستی بە دەمەوە دەکات، ئەوا یەکسەر تووشی ڕاچەنینێک دەبیت. ناکرێ بە ئاسانی بەسەریدا تێپەڕی و بیر لەو هەموو مانایانە نەکەیتەوە، کە ئەو وێنەیەیان پێکهێناوە. ئیدی تۆ کامێرا و فیلم و هەموو شتێکت لە بیردەچێتەوە. دەبێت بەراوردی نێوان پاکیی منداڵ و میهرەبانیی ژن و دڵڕەقیی پیاو و مەترسیی دەبابە بکەیت. دەبێ بەدوای جیاوازیی نێوان شتەکاندا بگەڕێیت. کەوچکێک پڕیەتی لە ماست و لە دەستی ژنێکەوە بۆ ناودەمی منداڵێک دەچێت، گوللەیەک پڕیەتی لە بارووت و بە ئاڕاستەیەکی پێچەوانەوە لە دەستی پیاوێکەوە بەناو ئەو لوولەیەدا تێدەپەڕێت. ئەمە ئەو هونەرەیە، کە «نەوال جابر» هەموو ژیانی خۆی بۆ تەرخان دەکات. ئایا ئەم ژنە لە ئاگاییەوە ئەمەی کردووە و ئەو وێنەگرە پلانی بۆ ئەو وێنەگرتنەی هەبووە..؟ بێگومان نەء... من بەرگریی لە نووسینی ساکار ناکەم، بەڵام ئەوانەی لە پشت ئەو سادەکارییەوە دەقەکان دەبینن، تەنها تەمەڵیی خۆیانمان بۆ ئاشکرا دەکەن. ئەوانە نەک هەر جورئەت ناکەن ئەو تۆمەتە بدەنە پاڵ دەقی هیچ نووسەرێکی ڕۆژئاوا، بەڵکو بۆئەوەی سەر لە خوێنەر بشێوێنن، ناوی دەیان لەو نووسەرانە دەهێنن، ئەگەرچی من گومانم هەیە هیچ کامێکیانیان خوێندبێتەوە. باوەڕ ناکەم یەکێ تەنها جیمس جۆیس و فۆلکنەری خوێندبێتەوە، ئاوا مامەڵە لەگەڵ هیچ تێکستێکدا بکات. ئەمە ڕوویەکی مەسەلەکەیە، ڕووەکەی دیکەشی ئەوەیە ئایا تێگەیشتن چ مانایەکی هەیە..؟! تێگەیشتن تەنها مانای کۆتایی دەگەیەنێت. تێگەیشتن سنووردانانە بۆ بیرکردنەوە و دۆزینەوەی نهێنی. مەگەر تەنها ئەو دەقانە تێگەیشتن هەڵبگرن، کە زۆر بە سادەیی نووسراون و نووسەرەکانیان مەبەستیانە لێیان

تێبگەین.

من سەربەستیەکی زۆر دەدەمە پاڵەوانەکانم. لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵێکدا قسەی خۆیان دەکەن و گوێ بە هیچ عورف و عادەتێک نادەن. هنری میللەر لە چاوپێکەوتنێکیدا دەڵێت لە سەدەکانی زوودا سێ مەیموون هەبوون، لەسەر یەکەمیان هیچ مەبینە و لەسەر دووەمیان هیچ مەڵێ و لەسەر سێیەمیان هیچ مەکە نووسرا بوو، بەڵام ژیان ڕێک بە پێچەوانەی ئەمەوەیە. دەبێ هەموو شتێ ببینیت و بڵێیت و بکەیت... منیشیش هەموو هەقێ بە کارەکتەرەکانم ڕەوا دەبینم، تەنانەت زۆر جار بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتیان تەواو بە پێچەوانەی قەناعەتی خۆمەوەن، مەگەر هونەری نووسین ڕێگایان لێ بگرێت و بیەوێت جوانتر دەریانخات، ئەگینا هەرگیز دەست ناخەمە ناو کاروباریانەوە. دواجار ئەو سەربەستیەی ئەوان دەبێتە هی خۆم و لە ڕێگای ئەوانەوە ئەو شتانە دەڵێم، کە ڕەنگە خۆم لەبەر هەر هۆیەک بێت نەتوانم بیانڵێم.«*»

زۆربەی ئەو چیرۆکانەی لێرەدا بڵاویان دەکەمەوە، ڕۆژگارێک هەر بۆ زەوقی تایبەتیی خۆم نووسراون و هاوڕێکانم خوێندوویانەتەوە، یاخود بۆم خوێندوونەتەوە. هەندێکیان پێشتر لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە. مەرجیش نییە ئێستا لێیان ڕازیی بم، بەڵام بمەوێ و نەمەوێ هی قۆناغی سەرەتای نووسینی من و خۆشیشمدەوێن. لە ڕووی ڕێنووسیشەوە دەسکاریيم کردوون. ئەڵبەتە چیرۆکی دیکەشم هەن، بەڵام ئەوانەن، کە بە قاڵبی ئایدۆلۆژیا داڕێژراون و ناچنە ریزی چیرۆکی هونەرییەوە. ئەگەرچی برای ئەدەبدۆستم کاک «ئاراس وەهاب» لە ساڵی ٩٣ یەکێ لەو چیرۆکانەمی، کە ناونیشانی «قەرەج»ی هەڵگرتووە و لە ٨٦ نووسیومە، بۆ گۆڤاری «گزینگ»ی نارد و لەوێ بڵاوکراوەتەوە.

کانوونی دووەمی ٢٠٠١
دانمارک

«*» تا ئێرە لە کۆڕێکدا خوێنراوەتەوە، کە (٢٠٠١/٦/١٣) یەکێتیی نووسەرانی کورد، لقی هەولێر بۆی ڕێکخستبووم.

## خولەکانی فێرکردن

پێشکەشە بەو قوتابیانەی لە خۆپیشاندانی ساڵانی ٨١ و ٨٢دا بەشداربوون«*»

«ویسام حیسام» تازە ئەو خولەی تەواوکردووە و لە هەموو ژیانیدا کەسی نەکوشتووە، بەڵام بەیانی دەبێ چەکێ بە دەستەوە بگرێت و لە پەنا یەکێ لە دیوارەکانی سەر شەقامی «ئیسکان» بوەستێت، بۆئەوەی تەقە لەو کچ و کوڕانە بکات، کە نیازیان وایە قوتابخانە بەجێبهێڵن و خۆپیشاندان ساز بکەن.. یەکەمجاریشە ئەم شارە دەبینێت و هیچ شوێنێکی شارەزا نییە.. ئێوارە بە ئۆتۆمۆبیلێکی جامتەڵخ بردیان بۆ شەقامی «ئیسکان» و ئەو شوێنەیان پیشان دا، کە دەبێت بەیانی لێیەوە بوەستێت و شان بە شانی هەڤاڵەکانی کاری خۆی ئەنجام بدات.. ماڵێک دەناسێت و ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆنەکەشی لایە، بەڵام قەدەغەیە شوێنەکەی بەجێبهێڵێت و بەملا و بەولادا بڕوات.. هیچ دوور نییە بەیانی «هێمن»ی هاوڕێی منداڵیی و کوڕی گەڕەکەکەی لەناو خۆپیشاندەرەکاندا ببینێت و لوولەی چەکەکەی ئاڕاستەی سەر گۆی دڵی بکات.. ئەو قوتابییەکی زیرەک بوو لە قوتابخانە و هەموو ساڵێ بە پلەی باش دەردەچوو، بۆیە بەپێی حیسابی ساڵەکان ئێستا پۆلی شەشەمی ئامادەییە و رەنگە بووبێت بە گەنجێکی قۆزیش.. «ویسام حیسام» خۆی تا بڵێی تەمەڵ بوو و رقی دنیای لە قوتابخانە بوو.. بەڵام چونکە کوڕێکی لووسکە بوو و بەو قژە خاو و چاوە سەوزانەیەوە سیمای زیاتر لە هی کچ دەچوو؛ لای مامۆستاکانی خۆشەویست بوو و بەئاسانی لەسەر پۆلەکان بازبازێنی

دەکرد.. لە قۆناغی سەرەتایی هەر کاتێکی دەزانی یاریی تەقلیدیی «بنوون» دەستی پێدەکرد و لەو پۆلە بێدەنگ و بێچرپەیەدا خۆی لە باوەشیان دەبینیەوە.. رانە نەرمۆڵەکانیان دەگوشی و ڕوومەتە پەمەییەکانیان ماچدەکرد.. ئەو جارە بەڕێوەبەری «ناوەندیی قادسیە» دەستە زبرەکەی کرد بەناو یەخەی بازنەییی فانیلە پرتەقاڵیە تەنکەکەیدا و پەنجەکانی خستە سەر یەکێ لە گۆی مەمکە لووسەکانی.. سەیرێکی چاوەکانی کرد و بەهەناسەبڕکێوە پێی وت:

ـ وەی بەقوربانت بم، خۆم و قوتابخانە و سەرجەمی مامۆستاکانیش.. دەتەوێ لە هەموو وانەکان دەربچیت..؟

مامۆستای وەرزشیش هەر زوو زوو لەناو ئەو هەموو یاریکەرە چاک چاکەدا ئەمی پاڵی دەخست و لەسەر شێوازی تایبەتیی خۆی وەرزشی بە دەست و قاچە ناسکەکانی دەکرد.. لە پۆلی سێیەمی ناوەندی دوو ساڵ بەسەریەکەوە لە کیمیا و فیزیا گەڕایەوە و ئەنجام چوو بۆ «خولی پێگەیاندنی کادیرانی ئاسایش».. ئەگەرچی دایکی و باوکی رازیی نەبوون و نەیاندەویست کوڕە تاقانەکەیان ئەو ڕێگایە بگرێت، بەڵام ئەم هەر سوور بوو لەسەر بڕیارەکەی و گوێی لێ نەگرتن.. ئەوان بەهیوابوون هەرچۆنێ بێت پۆلی سێ ببڕێت و لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان وەربگیرێت.. ئەمەش خەونێکی زووی خۆیان بوو و بۆیان نەهاتبووە دی.. ئەوان پوورزا و خاڵۆزا بوون و هەر لە منداڵییەوە حەزیان لە گۆرانی و مۆسیقا دەکرد، بەڵام نە دەنگیان زۆر خۆش بوو و نە هەلیشیان بۆ رەخسا تا فێری ژەندنی ئامێرێکی مۆسیقا بن.. هەرچۆنێ بوو وەکو کۆرس وەرگیران و لە زۆربەی گۆرانیی گۆرانیبێژە ناسراوەکانی رادیۆ و تەلەڤزیۆندا بەشدارییان کرد.. ئەمەش بۆ ئەوان بەس نەبوو و دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە.. ئەگەر کوڕەکەیان لەو پەیمانگایەدا وەربگیرابووایە و بووبووایە بە کەمانجەژەنێکی لێهاتوو، ئەوا بۆ ئەوان شانازییەکی گەورە بوو و کۆڵێ پێی دەگەشانەوە، بەڵام بەداخەوە ئەو ئاواتەیان نەهاتە دی و بەتەواوییش لە دەستیان دەرچوو.. ئیتر بۆ ئەو شارەیان برد و ئەوەندەی دی لێیان دوورکەوتەوە.. جاران هەرچۆنێ بووایە دەیاننارد بۆ خولی فێربوونی مۆسیقا

و لەوێ کەمێ فێری ژەندنی کەمانجە بووبوو.. بێگومان بە کڕینی دیاریی گران گران رازییان دەکرد و پارەی دنیایان دەدایە مامۆستاکانی، ئەگینا بەدڵی نەبوو و ئەم و ئەو هونەرەیان نەوتبوو.. تازە لەوێ ئەوەی لێی نزیک نابێتەوە مۆسیقایە و هەر تەواو لە بیریشی دەچێتەوە.. «ویسام» نەیدەویست بۆ دایک و باوکی باس بکات و لە بنج و بنەوانی مەسەلەکەیان بگەیەنێت، کە لەوێش مامۆستاکانی وەکو ئەوانەی قوتابخانە شەڕی پێ دەفرۆشن و هەمیشە سەغڵەتی دەکەن.. هەستی دەکرد ئەمە تەنها بێهێزیی ئەم دەردەخات و لە ناخەوە پێی تێکدەشکا.. ئەوسا ئەوەندەی دی خۆی وەکو کەسێکی دەستەپاچە دەبینی و رقی لەو جەستە نەرمۆڵەیەی هەڵدەستا، کە لە جەستەی هیچ نێرینەیەک ناچێت و وەکو شتێکی زۆر ناسک سەرنجی لێ دەدەن.. تەنانەت ئەو جارە دووان لە فێرکەرەکانی لەو ژوورە لاچەپەی ئەوسەری هۆڵە چۆڵەکە پەلاماریان دا و کاری خۆیان لەگەڵ کرد، نەیتوانی بە هیچ کەسێکی بڵێت و چەند رۆژێ بەنهێنیی و دوور لە چاوی دایکی و باوکی ناخی خۆی خواردەوە.. بەدزیەوە دەگریا و قایم قایم سەری بە دیوارەکانی ژوورەکەیدا دەکێشا.. ئەگەر بچووایە بۆ لای پۆلیسی قەلاچۆکردنی تاوان و سکاڵای لێ بکردنایە، ئەوا بەپێی یاسا توندترین سزایان دەدان و نەیاندەهێشت بەسەریانەوە بچێت، بەڵام ئەمە زیاتر دەیخستە بەر چاوان و ئەوەندەی دیکە هەستی بە ناسکیی خۆی دەکرد.. ئەم بەدوای رێگایەکدا دەگەڕا هەڵیوەشێنێتەوە و بیکات بە کەسێکی دی.. جەستەیەکی تر و رۆحێکی دیکەی تەواو جیاوازی پێ ببەخشێت و تێکشکانی هەموو قۆناغەکانی تەمەنی بیربەرێتەوە.. ئەوە بوو لە چوونی بۆ ئەو خولە دوودڵیی نەکرد و بەئاسانی وەرگیرا، بەڵام نەیزانیبوو ئەوەی مامۆستاکانی قوتابخانە و فێرکەرانی مۆسیقا بە دزیی یاساوە دەیانکرد و بەپارێزەوە دەچوون بەلایدا، لەوێ بەشێک بوو لە پرۆگرامەکە و دەبووایە بەرێکی جێبەجێ بکرایە.. ئەفسەر نەمابوو لە هەرە بچووکیانەوە تا هەرە گەورەیان بە جوانیی ئەم سەرسام نەبووبێت و مۆمی خۆی لەناو مۆمدانەکەی دانەگیرساندبێت، بەڵام یەکێکیان لە هەموو قوتابییەکانی تری جیاکردبۆوە و شەوان تا بەیانی لەسەر تەختی نووستنی ژوورە تایبەتیەکەی

خۆی دەینواند.. ئێستا ئەم فێری هەموو ئەو تەکنیکانە کراوە و زۆر چاکیان لێ دەزانێت، بەڵام بەم رۆحە تێکشکاو و داهێزراوەیەوە مەحاڵە بتوانێت پراوەیان بکات و گیراوەکان ئەشکەنجە بدات.. تەنانەت لە خۆیشی رانابینێت بەیانی لەو شوێنە بوەستێت و لەپاڵ هاوکارەکانی تەقە لە خۆپیشاندەران بکات.. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەم ژیانی لە مەترسی دایە و چاوەڕێی مەرگی خۆی دەکات.

هەولێر، دواناوەندیی رزگاریی کوڕان ١٤ـ ١ـ ١٩٨٥

«*» ئەمانە ناوی هەندێ لەو قوتابییانەن، کە رۆڵی زۆر چاکیان لە خۆپیشاندانەکانی هەولێردا هەبوو: شەهید سەلاح جەوهەر، شەهید شۆڕش دەرگەلەیی، شەهید سەپان «خەسرۆ کاوێس»، دڵشاد سەدیق، بارامی حاجی کەریم، ئەبوبەکری حاجی کەریم، خەلیل ساڵح، حسێن ڕەشید، شوان سلێمان، ئەبوبەکر سەدیق، ئیسماعیل درێژ، ئەنەس حامید، کەریم کاکەی شاعیر، رۆستەم عوسمان، شەعبان عوسمان، ئومێد گۆمەشینی، ئیدریس عەباس، عیماد تورکمان، ئەحمەد محەمەد خۆشناو، رزگاری مامۆستا عەبدوڵا، سالاری سیستەر خالیدە، نەجیبە عەلی، گوڵزار فەتاح، تارا قەرەداغی، رێزان کۆیی، نیشتیمان عومەر، فەتحوڵڵا شێخانی، ئیبراهیم حەسەن، نەورۆز عەلی، ئاراس کۆیی، فەرهاد هیواز، ئازاد ئەحمەد عومەر، هاوار قادر، ئیسماعیل محەمەد ئیسماعیل، مەهدی رەواندوزی، وریا ساڵەیی، ئاسۆ مەلیک، ئاسۆ حەیدەری، حەمە سەرسپی، فرسەت زوبێر رۆژبەیانی، عومەر عەبدوڵڵا «مەلا عومەر»، بەدران عەزیز فەرحان، فەرهادی مامۆستا مەولوود، کامەران تایەر، ئومێد مستەفا، بەختیار رەحمان دارتاش، زیاد سەعید، سەلاح شەهاب، موزەفەر عەبدوڵڵا، مەجید عەبدوڵڵا، کەریم کێشکە.... و زۆری تریش.

«سەددام حسێن مەجید» یەکێ بوو لە سەرکردە بەتواناکانی ئەو خۆپیشاندانانە و لەگەڵ کۆمەڵێکی تردا گیرا.. لە بەندیخانە جەللادەکان لە

ناوەکەی حەپەسابوون.. هەر ئەوەندەیان پێ کرابوو بڵێن: «تۆ کە ئەو ناوە پیرۆزەت هەیە، چۆن لەگەڵ ئەو گێرەشێوێنانە خۆپیشاندان دەکەیت..؟». ئەو ناوە تەنها رێککەوتێک بوو و ئەم خۆی حەزی دەکرد بە «بەرزان» بانگی بکەن. لە یەکێ لە خۆپیشاندانەکاندا سەددام بارامی حاجی کەریمی کردبووە قەڵاندۆشکانی و ئەویش لەو بەرزاییەدا یەک بە دەنگی خۆی هاواری دەکرد: «بڕووخێ سەددام حسێنی خوێنڕێژ»، سەددام دایگرتبووە خوارەوە و بە گاڵتە پێی وتبوو: «وسبە هەتیم، هەی بێسیفەت، ئەمن بەو هەموو قیافەوە بڕووخێم، ئەتوو لەسەرڕا دەکەویە خوارێ و دەست و لاقت دەشکێ». بۆ خۆشییش لەسەر دیوارێکی قوتابخانەیان نووسیبوو: «بمرێ سەددام حسێن تکریتی و بژی سەددام حسێن هەولێری».

ئەو خۆپیشاندانانە لەگەڵ ئەوەشدا بێ بەرنامەبوون، بەڵام دەسکەوتی زۆریان هەبوو وەکو گۆڕینی پرۆگرامی خوێندن لە عەرەبییەوە بۆ کوردی، لابردنی ئاهەنگگێڕان بە بۆنەی جەژنەکانی حیزبی بەعسەوە، کزبوونی چالاکیی یەکێتیی قوتابیانی سەر بە بەعس، نەمانی رێزگرتن لە ئاڵای عێراق لە قوتابخانەکاندا، پەیدابوونی جۆرێ لە هۆشیاری و دەستەڵاتی قوتابی.. بۆ نموونە قوتابیانی «دواناوەندیی رزگاریی کوڕان» توانیان بە چەپڵە و هووهاکێشان بەڕێوەبەرێکی بەعسی دەربکەن و مامۆستا «ئەسغەر تاڵب مەجید» دابنێن، کە رۆحێکی گەنجانەی هەبوو و بەشێوەیەکی شارستانیانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ قوتابیان دەکرد. کاتێکیش مامۆستا «محەمەد ئیسماعیل»ی مێژوو و مامۆستا «جەلال»ی بیرکاریان بۆ قوتابخانەیەکی تر گوێزایەوە، چونکە بەئاشکرا دژ بە بەعس بوون و پشتگیرییان لە داواکاریەکانی قوتابیان دەکرد، بە خۆپیشاندان و مەراسیمێکی زۆر تایبەت گەڕاندیاننەوە. بەعسیان ناچار کرد داوای لێبوردن بکات. بەداخەوە لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕی حیزبەکان لە (شاخ) و جاڕدانی مفاوەزات، قوتابیانیش لە (شار) بوون بە چەند گروپێکی پاسیڤی حیزبی و کۆتایی بەو هەوڵانە هات.

## مانگا

پێشکەشە بە «فرسەت زوبێر ڕۆژبەیانی»ی هاوڕێ و هاوپۆلم

جاران ئەو گەڕەکەی ئەوبەر سیمایەکی لادێییانەی هەبوو.. هەر ماڵێکت دەبینی بێجگە لە قەل و مریشک و مراوی، خاوەنی چەند سەرێ مەڕ و بزنیش بوو.. ئەوەی من دەمەوێت باسی بکەم، ئەو بەیانیەیە، کە دەچووم بۆ قوتابخانە و وەکو هەموو جارێکی دی دەبووایە بەوێدا بڕۆم.. خەڵکێکی زۆرم بینی لە شێوەی بازنەیەک کۆبووبوونەوە و کز و خەمناک وەستابوون.. کاتێ نزیکبوومەوە و لە کوڕێکی منداڵی وەکو خۆمم پرسی، بۆم دەرکەوت تاقە مانگای پیاوێکی هەژار کەوتۆتە بیرێکەوە.. زۆر هەوڵیان لەگەڵداوە و بۆیان دەرنەهاتووە.. هەرچۆنێ بوو خۆم گەیاندە بەردەمی بیرەکە و سەیرم کرد.. بە پشتدا کەوتبوو و قاچەکانی گرمۆڵە بووبوون.. لرخەلرخێکی سەیری لێوە دەهات و وردە وردەش نزمتر دەبیسترا.. گەورەکان وتیان وا دەمرێت.. ئەوسا قەسابێک هاتبوو و لەگەڵ خاوەنەکەی سەودای دەکرد.. دەیویست لێی بکڕێت و هەر لەوێ سەری ببڕێت.. بە ڕێگایەکی تایبەتی لەتوکوتی بکات و گۆشتەکەی دەربهێنێت:

ــ حەفتەیەک لەمەوبەر پەنجا دیناریان دامێ و هەر ئاوڕیشم لێ نەدانەوە.

ــ ئێستا لە گیانەڵایە و شتێکی ترە.. من بیست و پێنج دینارت دەدەمێ.

خاوەنەکەی ویستی شتێ بڵێت، کوڕە حەوت هەشت ساڵانەکەی دەستی گرت و پێی وت:

ــ نەکەی بیفرۆشیت باوکە، دایکم زۆر خۆشیدەویست.

قەسابەکە وتی:

ــ من ئێستا لە بیست دینار زیاتری پێ نادەم، چونکە هەر دەقەیەک تێپەڕێت، کەمتر تەمام پێی دەمێنێت. رەنگە مردار ببێتەوە و فریا نەکەوم سەری ببڕم.

خاوەنەکەی خۆی بۆ قسە ئامادە کرد، بەڵام کوڕەکەی دیسان دەستی گرت و وتی:

ــ نەکەی بیفرۆشیت باوکە، دایکم زۆر خۆشیدەویست.

باوکەکە زللەیەکی بە روومەتی کوڕەکەیدا کێشا و پێی وت:

ــ تۆ بێ دەنگ بە و وازم لێبێنە با بیفرۆشم.

قەسابەکە وتی:

ــ پانزدە دینار.

ــ نەکەی بیفرۆشیت باوکە، دایکم زۆر خۆشیدەویست.

زللەیەکی قایمتر:

ــ پێم وتی بێ دەنگ بە، تۆ بە هەر قسەیەکت زیانی پێنج دینارم لێ دەدەیت.

ــ دە دینار.

ــ نەکەی بیفرۆشیت باوکە، دایکم زۆر خۆشیدەویست.

زللەیەکی قایمتر:

ــ بێ دەنگ بە، تۆ چی لە ئیشی گەورە تێدەگەیت..!!

ــ پێنج دینار.

ــ نەکەی بیفرۆشیت باوکە، دایکم زۆر خۆشیدەویست.

زللەیەکی قایمتر:

ــ بێ دەنگ بە، تا ئەو پێنج دینارەم لە دەست نەچووە، ئەگینا دەتخەمە ئەم بیرەوە.

ــ تازە بە فلسێ نایکڕم.

باوکەکە کوڕەکەی هەڵبڕی و ویستی بیخاتە بیرەکەوە، من لە ترسا رووم وەرگێڕا و بەرەو قوتابخانە چووم.. گوێم لە خەڵکەکە بوو دەیانوت:

ـ نەکەی، تووخوا نەکەیت، دەمریت و ئەویشت لە دەست دەچێت.

بیــرم لەوە دەکــردەوە ئاخــۆ منداڵەکــە خــراوەتە بیــرەکــەوە، یان بــاوکی پەشیـمـانبـۆتەوە.. نـەمـزانیبـوو زەنگەکە لێی داوە و هەمـوو قـوتـابیـان چوونەتە ژوورەوە.. بەتـرســەوە دەرگــای پـۆلم کـردەوە و مــامــۆســتــای مــاتماتیک بە تووڕەییەوە پێی وتم:

ـ دەبێت تا زەنگەکە لێ دەدا، تۆ لەسەر یەک قاچ بوەستیت.

ئەوسـا بیـرم لـە مـانگاکە دەکردەوە و دیمەنەکەی دەهاتـەوە بەرچاوم، کە بە پشتا کەوتبـوو و قاچەکانی گرمۆڵە بووبوون.. خاوەنەکەی و قـەسابەکەم لەسەر تەختـەڕەشـەکە دەبینی و سـەودایان دەکرد.. دەنگی کـوڕەکەش لە گوێچکەمدا دەزرنگایەوە:

ـ نەکەیت بیفرۆشیت باوکە، دایکم زۆر خۆشیدەویست.

نیـوەڕۆ کە بەربووم، بـە درێژاییی ڕێگا بەراوردی نێـوان بیـر و قـوتابخـانە، مـامـۆسـتـا و قـەسـاب، قـوتـابی و مـانگام دەکرد، لەپڕ لاشـەی مـانگاکەم بینی، لۆرییەک لەسـەر ئەو ڕێگایە رایدەکێشـا و منداڵان بە دوایدا رایان دەکرد، بەڵام زۆر چاوم بۆ کـوڕەکـە گـێـڕا و نـەمـبـینـی.. دوایی وتیـان هـەر ئـەو ڕۆژە باریان کردووە و چوون بۆ گەڕەکێکی دی.

٢٣ـ ٣ـ ١٩٨٥

هەولێر، دواناوەندیی رزگاریی کوڕان

## هەتیوێکیشیان لەگەڵدایە

بە هەڵە گرتوویانە و تێکەڵ بە شۆڕشگێڕەکانیان کردووە.. ئەم لە هەموو ژیانیدا خۆی لەم جۆرە کارانە بە دوور گرتووە و ڕۆژێ لە ڕۆژانیش هاوڕێیەتیی ئەوانی بە پەسەند نەزانیوە.. هەتا ئەگەر بیویستایە لێیان نزیکبکەوێتەوە و زۆر بەچاکییش ئیشیان لەگەڵدا بکات، ئەوان خۆیان ڕازیی نەدەبوون و ئابڕووی پارتەکەیان بە لاوە مەبەست بوو.. جارێکیش یەکێکیان ویستبووی بیهێنێتە سەر ڕێگای ڕاست و دواییش ڕایکێشێتە ناو تۆڕەکەیان، گوایە ئەم گۆرانیبێژێکی بەهرەمەندە و دەتوانێت بە دەنگە خورافییەکەی سروودی شۆڕشگێڕانەیان بۆ بڵێت، بەڵام کەوتبووە بەر ڕەخنەی توندوتیژی هاوڕێیان و هەر زوو وازی هێنابوو.

ئێستا لێرەدا شتەکان هەندێ سەیر دێنە بەرچاو، ئەوان ڕۆژانە لەژێر قامچی و کێبڵەکاندا فیزاح دەکەن و زۆر جاریش دەپاڕێنەوە.. ئەمەش بە پێچەوانەی پاڵەوانی چیرۆکەکانی «عەلی ئاگرین»ی چیرۆکنووسی دۆستیانە، کە هەمیشە گۆرانی دەڵێن و جەللادەکان سەغڵەت دەکەن.. ئەم ڕاستە وەکو ئەوان هاوار دەکات و بێشەرمانەش دەگری، بەڵام زۆر جاریش گۆرانی دەڵێت.. ئا ئەمە ئەو لوغزەیە، کە ئەوان سەری لێ دەرناکەن و زەحمەتیشە لێی تێبگەن:

ـ ئای لە «دیاری»ی سیستەر فایزە، خۆ گۆرانی دەڵێت..!!

بەڵێ، دەیڵێت و دەگاتە گوێچکەی هەمووشیان.. چ ڕێککەوتێکی سەیربوو دوای ئەو هەموو ساڵە لەگەڵ «فارس باقر»دا یەکتریان بینیەوە و شوێنێکی ئاوا کۆیکردنەوە..!! «فارس» ئەمی ناسیەوە.. بە ناوەکەیدا زانی خۆیەتی و کەسی دیکە نییە.. لە گەڕەکی «بابلشێخ»ی «بەغدا» دراوسێ بوون و لە یەک

قوتابخانه و یەک پۆلیشدا دەیانخوێند.. دەستی کرده ملیەوه و ئەملا و ئەولای ماچکرد.. بەیەکەوه باسی منداڵیی خۆیان کرد.. باسی ئەو ڕۆژانەی «دیاری» بە دەنگە ئێجگار خۆشەکەی لەسەر سەکۆی ناوەڕاستی حەوشەی قوتابخانەدا گۆرانیی بۆ دەوتن و هەموو قوتابی و مامۆستاکانی سەرسام دەکرد.. «فارس» تەنانەت ئەو ڕۆژەی وەکو خۆی بیرمابوو، کە ماڵی «دیاری» کەلوپەلەکانیان هەڕاجکرد و گوێزایەنەوه «هەولێر».. تا زەنگی گشتیی ژوورەکانی ئەشکەنجەدانیش لێی دا و لەسەر تەختی ئاسنەکە لەسەر دەم پاڵی خست، بیریدەکردەوه و فرمێسکی ورد ورد لە چاوەکانی دەهاتنە خوارێ.. دەستەکانی لە ملا و قاچەکانی لەولا بە قایشە پانەکان بەستەوه و کێبڵەکەی بۆ هەڵگرت.. بە هەموو هێزی خۆی دەیکێشا بەو پشتە ڕووتەیدا و پێی دەوت:

ــ دانی پیادا بنێ سەگباب..!!

ــ بڕوا بکە من هیچم لە هیچدا نییە.

ــ خەیاڵ نەکەیت لەژێر دەستمدا دەربچیت و جارێکی دی ئەو دایکە قەحپەیەت چاوی پێت بکەوێتەوه.

ــ ئاخر قوربانت بم، دان بە چییدا بنێم، کە هیچم نەکردبێت..!!

................

................

زەنگی پشوودان لێی دا و ئەم دانی بە هیچ شتێکدا نەنا.. «فارس» بە خاولیە شێدارەکە ئارەقی ناوچەوان و سەر ڕوومەتەکانی ئەمی سڕی و بە دەم ئاخهەڵکێشانەوه پێی وت:

ــ تا دەکرێت دان بە خۆتدا بگرە چاوەکەم، وا نەزانی بەوه دەرباز دەبیت، ئەگەر ئەم نهێنی و ئەو نهێنی بدرکێنیت.

ــ من هیچم نەکردووه، بڕوا بکە من زۆر لەم شتانە دوورم.

ــ دەزانم دیاری گیان، من باوەڕی تەواوت پێ دەکەم.. ورەت بەرز بێت ڕۆحەکەم.. هەمیشە دایکتت بیربێت، کە تەنها تۆی هەیە و چاوەڕێی بەربوونت دەکات.

ــ ئاخر چاوەکەم ئەو کێبڵە زۆر قورسە و ئازارەکەی هی ئەوه نییە خۆمی

لەبەر ڕابگرم.

ــ وا مــەڵێ.. وا مــەڵێ.. هەر ســەرەتا وایە، دوایی کــەم کــەم ڕادێیت و خۆشتەنیی دەبییت.

ــ نا، من هەر بەرگەی ئەمجارە دەگرم ڕۆحەکەم، ئیتر دەڕووخێم.. ڕەنگە هەرچی بێتە سەر زمانم بیڵێم و لە خووت و خۆڕایی چیرۆکێ بۆ خۆم هەڵبەستم.

ــ دەزانی تۆ لە منداڵییشدا هەر وا ناسک بوویت..؟! هەر ئەوەندە پارچە شووشەیەکی بچووک بچوایە بە قاچتدا و کەمێ خوێنی لێ بهاتایە، یان مێرووڵەیەک گازی لە پەنجەکانت بگرتایە، دەگریایت و بە کەسمان ژیرنەدەبوویتەوە.. خەتای «پوورە فایزە»شمی تیابوو، ئەم ئێجگار ئاوا بەنازی کردبووی.. دایکم هەموو جارێ لەسەر ئەمە سەرزەنشتی دەکرد و ئەو گوێی پێ نەدەدا.. بەڕاستیی ئەو دەستەپاچەی کردبوویت و جورئەتی مریشکێکی نەخۆشی تیادا نەهێشتبوویت.. نەک بە کوڕەکانی گەڕەک، بەڵکو بە کچەکانیش نەدەوێرایت.. ئەو جارانەم لەبیرن، کە «ئامال» لێی دەدایت و دەستت دەکرد بە گریان.

ــ بەڕاست ئامال ئێستا چی دەکات..؟!

ــ چی دەکات..؟! ئەوەی جاران بە تۆی دەکرد، ئێستا بە منی دەکات.

ــ تێناگەم..!!

ــ جاران بە چڕنووک دەموچاوی تۆی دەڕنیەوە و ئێستاش دڵی من.

ــ کەواتە خۆشتدەوێت..!!

............

...........

زەنگی دەستپێکردنی ئەشکەنجە لێیدایەوە و «فارس» جارێکی دی کێبڵەکەی هەڵگرت:

ــ وا لەم گیانە بۆگەنەت دەکەم بە ئاسانی بەناو گەڵی دایکتدا بچێتەوە، ئینجا لەوە زیاتر ماندووم مەکە و شتەکانت بڵێ.

ــ هیچم نییە بیڵێم، ئەی هاوار هیچم نییە بیڵێم.. خۆزگە هەمبووایە و

نەجاتم دەبوو.

ــ هەمــوو ئەو دایکحیــزانــەی دێنە ئێرە، لە پێــشـدا وەکو تۆ هــیـچـیـان نـیـیـە بیـڵــێن و دواییش کە دەتەقنەوە، ئێـمــە فـریا ناکـەوین قـســە و باسـەکـانیـان بنووسینەوە.

............

............

زەنگی پشــوودان لێیدایەوە و «فـارس» کێبڵـەکەی کردەوە بە عـەللاگەی قـەد دیوارەکەوە.. بە سووکی کەوتە شـێـلانی پشتـە ناسکەکەی، کـە کۆمـەڵێ هێڵی سـووری باریک و باریکتر، ئەسـتـوور و ئەسـتـوورتری لەسـەر کـێـشـابوو و پێی وت:

ــ ئێـسـتـا تۆ هـەرچۆنـێ بێت قۆناغێکت بڕیوە دیاری، بەشـکو ئەوانی تریش ئاوا ببڕیت..!!

ــ هەستدەکەم دڵم تێکهەڵدێت و ناو سـەرم گێژ دەخوات.

ــ ئەوەندە بیر لە جەستەی خۆت مەکەرەوە، چونکە چەند بیری لێ بکەیتەوە، ئەوەندە ئازارەکەی زیاد دەکات.. بە قسـەی من دەکەیت گۆرانـی بڵێ و منیش حەز دەکەم بە یادی ڕۆژانی منداڵیی گوێت لێ بگرم.

ــ دڵت ناشکێنم هاوڕێم، وا بۆت دەڵێم:.......................................

ــ دەنگت زۆر گـۆڕاوە دیـاری، کـەچی هـەر خـۆشــیـشــە.. تۆ نازانـی من چ چێژێکی سەیری لێ دەبینم و چۆن هەموو ڕابردووم بە جارێ بیردەخاتەوە..!!

ــ بەڵام من ناتـوانم ئەوەندە لەسـەر دەم و لەسـەر ئەم تەختـی ئاسـنـە پاڵکەوم چاوەکەم، خەریکە دڵم لە دەممدا دێتە دەرێ.

ــ دەزانم.. من ئـەوە چاک دەزانم، بەڵام دەبێ دان بـە خـۆتدا بـگریت گـیــانی شیرینم.

ــ ناتوانم.. تەواو.. ناتوانم.

ــ چاوەڕێکە زەنگەکــە لـێ بدات، دەسـت و قــاچـت دەکــەمـــەوە و ئـیـــشـی ئەمڕۆمان تەواو دەبێت.

ــ بەیانی تۆ دێیتەوە، یان کەسێکی دی..؟!

ــ نازانم، بەڵام هەرچۆنێ بێت گەورەکەم ڕازیی دەکەم، خۆم بە تەنها ئیشی تۆ بگرمە دەست.. من هەر چییم لە دەست بێت، درێغی ناکەم.. هەموو ڕۆژێکیش دەچم بۆ لای «پووره فایزه»م و هەواڵی تۆی پێ ڕادەگەیەنم.. هەر بەڕاستییش بیری دەکەم و پێم خۆشە ئەویش ببینم.. خەمت نەبێت تا بتوانم هەوڵدەدەم هەر خۆم لەگەڵتدا خەریک بم، هیچ نەبێت بۆ خۆمان ڕۆژانە یادی سەردەمی منداڵیی دەکەینەوە و من گوێم لەو دەنگە خۆشەی تۆ دەبێت.

ــ بەڵام ئەگەر تۆ هەموو ڕۆژێ وەکو ئەمڕۆ بگریت، من ئامادەنیم، هیچی دیکە گۆرانییت بۆ بڵێم.

ــ ناتوانم دیارییەکەی ڕۆحم، ناتوانم..!!

............

............

ڕۆژەکانی «دیاری» و «فارس» لەو ژووره هەموویان لە یەکتر دەچوون و تا دەرچوونی لێبوردنی گشتیەکە بەردەوام بوون.. ئێستاش وەکو دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی کاتی خۆیان لە ماڵ و لە بازاڕ و شوێنە گشتیەکاندا بەسەردەبەن.. شۆڕشگێڕەکانیش هەمیشە لەنێوان خۆیاندا باسی ئەوە دەکەن، کە «دیاری» لە گەرمەی ئەشکەنجەداندا گۆرانیی وتووە و ئەوان لە ژوورەکانی خۆیانەوە گوێیان لێ بووە، بەڵام چەند دەکەن ناتوانن بیهێننە ڕیزەوە و سروودی شۆڕشگێڕانەی پێ بڵێن.«*»

هەولێر ٣ــ٨ــ ١٩٨٥

* لە ژمارە ٢٩ی گۆڤاری «رابوون»یشدا بڵاوکراوەتەوە. جاران لە جێی وشەی هەتیو، وشەیەکی دیکە هەبوو.

## هونەری چێشتلێنان

پێشکەشە بە «ئەهداف راجی»، ئەو کچە بەغدادییە چەپڕەوەی، کە زیاتر لە جارێ پێی وتین: تکایە ئەگەر بوون بە خاوەنی نیشتیمانی سەربەخۆی خۆتان، نەکەن وەکو ئێمە پڕیکەن لە چەوسانەوە و نایەکسانی.

«خــەلیل عــەببــوود» لەگــەڵ سێ قــوتابیی دیکەی مــێــژوو ژوورێکی لە بەشی ناوخۆکەی شەقامی «دەواسە» بۆ دەرچووبوو.. کاتێ ئیشەکانیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد و باس هاتە سەر چێشتلێنان، «ئاڤان»، کوڕە جوانەکەی سیمای لە هی کچ دەچوو و لەگەڵ یەکەم بینیندا ئەمی وەکو سەگی ئاویی لەناو لمی شێداری خەیاڵەکانیدا گەوزاندبوو، دەستی کرد بە گیرفانی جانتا سەیرەکەیدا و کتێبێکی گەورەی ڕەنگاوڕەنگی دەرهێنا.. پیشانی دان و بە کەمێ شەرمەوە وتی:

ـ ئەمە کتێبی هونەری چێشتلێنانە و دایکم دایناوە، ئەگەر ئێوە حەز بکەن ڕۆژانە بەپێی ئەم کتێبە چێشت لێ بنێن، ئەوا باشە، ئەگینا من ناچارم خۆمتان لێ جیا بکەمەوە.

«خەلیل عەببوود» لە پێش «دانا» و «ئارام»ەوە دەستی بۆ درێژ کرد و لێی وەرگرت.. پەڕەپەڕەی کرد و چاوی کەوتە سەر وێنەکەی «دایکی ئاڤان»، کە بە گەورەیی لە دوا لاپەڕەی کتێبەکە درابوو و ئەوەندەی دی ئۆقرەی لێ بڕا.. بە شپرزەییەوە سەری هەڵبڕی و وتی:

ـ من ناتوانم بیخوێنمەوە، تا بە پێی ئەوە چێشت لێبنێم.

«دانا» و «ئارام» بە زمانەکەی خۆیان شتێکیان لەگەڵ یەکتردا باسکرد و

دوای ئەوە «ئاڤان» بەمی وت:

ــ قەیناکا تۆ بەشداریی لە چێشتلێناندا مەکە، لەجیاتی ئەوە ئیشێکی دی بکە.. گسکی ژوورەکەمان بۆ بدە و تەنەکەی خۆڵەکە بڕێژە.

بەبێ چەندوچوون ڕازیی بوو.. ئەگەرچی دەیزانی ئەوان باسی پیسوپۆخڵیی ئەمیان کرد و بێزیان نەدەهات نانی دەستی بخۆن.. ڕۆژی پێشووش کچێکی بەشی «بایەلۆژی» بینیبووی و خێرا رووی خۆی کردبوو بەولاوە، بەدەم تفکردنەوە بە دەستەخوشکەکەی وتبوو:

ــ یائع دەموچاوی لە برینی سەر پشتی کەمتیاری گەڕ دەچێت.

ئەم گوێی لێبوو و قرچە لە دڵیەوە هات، بەڵام بەسەر خۆی نەهێنا و ئەوێی بەجێهێشت.. ئەم لە هەموو کەسێ زیاتر بە عەیبەکانی جەستەی خۆی دەزانی و بەردەوام ناخیان وێراندەکرد.. کاتێ بە دەمی کراوەوە هەنگاوی دەنا، واتدەزانی شتێکی بۆ ئاسمان هەڵداوە و دەیەوێت بیگرێتەوە.. یان وا دەهاتە بەرچاو، کە لە دەشتێکدایە و بەدەم رۆیشتنەوە لە پۆلە مەلێکی ئێجگار بەرز دەڕوانێت.. ئەم لە لادێیەکی خوار «کەرکووک» چاوی کردۆتەوە و زۆربەی ژیانی لەوێدا بەسەر بردووە.. باوکی ئەگەرچی نەخوێندەوار بوو، بەڵام توانایەکی سەیری لە گێڕانەوەی بەسەرهاتدا هەبوو و لە چیرۆکنووسێکی زۆر شارەزا چاکتر وەسفی سرووشت و شتەکانی دەکرد.. کاتێ باسی لادێکەی جارانی خۆیانی بۆ دەکرد، کە زوو زوو پێش لەدایکبوونی ئەم تیایدا ژیابوون، دیمەنەکەی تەواو دەهاتە بەرچاو و پڕ بە دڵ حەزی دەکرد لەوێ لە دایک بووبووایە، یان هیچ نەبێت بۆ ئەوێ بگەڕێنەوە.. وا چووبووە ئەقڵیەوە، ئەگەر لەوێدا چاوی بکردایەتەوە و گەورەببووایە، ئێستا شێوەیەکی دیکەی دەبوو.. ئەوەتا چ دایکی و چ باوکیشی دوو بنیادەمی ئاساین و هیچ عەیبێ بە جەستەیانەوە دیار نییە.. کەچی ئەم ڕۆژانە منداڵانی هاوتەمەنی دەیکەن بە گاڵتەجاڕی خۆیان و ناو و ناتۆرە نەماوە دوایان نەخستبێت.. لەسەر تەختەڕەشی قوتابخانە وێنەکەی دەکێشن و پێی پێدەکەنن.. ئەویش هەر دوای قوتابخانە هەندێ نانی رەق و مەتارەیەک ئاو هەڵدەگرێت و خۆی هەڵدەداتە سەر پشتی کەرەکەی.. چوار پێنج مەڕ و بزن لە گەوڕەکە دێنێتە دەرێ و بە

پێش خـــــۆیـان دەدات.. هـەر بـۆئـەوەی پشـت لـە ئـاوەدانـیـی بـکـات و ئـەو دەمـوچاوەیان لـێ بشـارێتـەوە، کـە بە هـۆیەوە دەکـەوێتـە بەر تـانە و تەشـەر و بەردەوام تەریقی دەکـەنەوە.. ئەم ئەگەرچی لە ئەدەب و هونـەردا کۆڵە و مـانای ڕۆمانسیەت نازانێت، بەڵام تا سەر ئێسقان ڕۆمانسیە و دەتوانێت بڵێت: «من لە ئاوێنـەی سرووشـتدا وێنـەی خـۆم بە شـێوەیـەکی زۆر جـوان دەبینم.. بەڵام ئاخ، کـــە ناتوانم ڕۆحم لەو وێنەیـەدا بەرجــەســتــە بکەم و بـەرەو ئاوەدانیی بەرمـــەوە..!! ئـای ئاوەدانیی لە ئـاسـتـی مندا چ دڵێکی رەقت پێـوەیـە و چۆن هەمیشـە ڕۆحم داخدەکەیت..!!» سەیری کۆترە کێوییـەکان دەکات و دەچێتـە خـەیاڵی قووڵ قـووڵەوە، کە پۆل پۆل بە ئاسمـانی ئەو دەشـتە کـاکی بە کـاکیـەدا تێدەپەڕن و دەنگی باڵەکانیـان لە هەناسـەی بنیـادەمی زۆر مـاندوو و زارەترەک دەچن.. تا تـەواو دووردەکـەونەوە و دەبن بە چـەند تارمـاییـەکی وەکـو کـراسـە ڕەنگبواردووەکەی دایکی، کە هەر لە ڕەنگی قەوزەی قەراغ گۆمـەکان و کەڕووی سـەر نانە کۆنـەکان دەچێت، سـەرنجیان لەسـەر ناگوێزێتەوە و هـاوکات بیـر لە کۆترە مـاڵیەکـان دەکاتەوە، کە خـەڵک ناویان بۆ یەکە بە یەکەیان دۆزیونەتەوە و بەپێی ئەو ناوانـەشـیـان نرخـیـان بـۆ داناون.. دەنووککورت لە دەنووکـدرێژ و سەربەکڵاو لە سەرلووس چاکترە و لە یەکتریان جیادەکەنەوە، بەڵام کۆترەکان خـۆیان ئەمـە نازانن و زۆر ئاساییە عینوانلیـەک، یان شامیـیەک، بگرە پەریی سـەربەکڵاو و پەڕلەپێش، کـە ئەوان بە جـوانیـان دەزانن و ئامـادەن پارەیەکی چاکیان پێ بدەن، لەگەڵ هاقوویەکی ناشیـریندا ببن بە هاوسـەری یەکتر و بێ سڵەمینەوە دەنووک بخەنە دەنووکی یەکترەوە.. ئەم ئەوەتا لە خـەیاڵەکانی پێش خەوتنیشیدا بە پارێزەوە لە ژنانی لادێکەی نزیکدەبێتەوە و بە ترسـەوە ماچیان دەکـات.. بە شــەرمـەوە لەگـەڵیـان پاڵدەکـەوێت و یاریی بـە سنگ و کـەفـەڵیـان دەکـات.. دواییش هـەست بە گـوناه دەکـات و وا دەزانێت تاوانێکی گـەورەی لەگـەڵدا کـردوون.. کـاتێ دەچێـتـە دەرەوە و دەیانـبینێت، خـۆی بە خـەجـاڵەت دەزانێت و هاوکـــات بـەزەیی پیـــایـاندا دێتـــەوە.. دەیـەوێت بـەســـەر دەست و قاچیاندا بکەوێت و داوای لێبوردنیان لێ بکات، بەڵام نازانێت چییان پێ بڵێت و چۆنیان بۆ ڕوونکاتەوە، کە ئەم بە دزیەوە هێناونیەتە ناو خەیاڵە پیسەکانی و

لەوێ بە ئارەزووی خــۆی لەگــەڵیــاندا رایبــواردووە.. لەســـەر رووی ئاوێنە بالآنوومـاکەی سرووشـتدا، کـە وێنەکەی دەگـۆڕێت و بە شـێـوەیەکی تا بڵـێی جـوان خـۆی دەبینێت، ئافرەتی سـەیر سـەیر، هەندێ جـار کـوڕی لووسکە و ناسکی شـارشـتـانیـیش، لە خـەیاڵی خـۆیدا دەخـولـقـێنێت و تا بۆی بکرێت ناهێـڵـێت شـێـوەیان لە کـەسـانی لادێکەی بچن.. بێ ترس و سـڵـەمـینەوە باوەشیـان پیادا دەکات و رایاندەمووسێت.. ئەو سرووشـتە توانای خولـقاندنی زۆر شـتی پێ بەخشـیوە و چاکترین شوێنیشـە بۆ خۆحـەشاردان.. دەیان جـار دڵی پڕبـووبوو و فـرمـێـسک لە چاوەکـانی بە خـوڕ هاتبـوونە خـوارێ.. هەمـوو جـارێکیش بە خـۆی دەوت: «لێرەدا گریانیش لەزەتی خـۆی هەیە».. راستیـشـی دەکرد، ئەم ئەوەی زۆر چاک دەزانی، کە گریان شێوەی مرۆڤ دەگۆڕێت و هـی جـوان ناشـیرین دەکات، چجـای ئەوێک، کە دەمـوچاوی دەڵێی قـوتووی رۆنە و منداڵان بە لەقە قوپاندوویانەتەوە..!! بۆیە تا بۆی بکرایە دانی بە خۆیدا دەگرت و نەدەگـریا.. گـوێی بە لێـدانی گـەورە و بچـووکی لادێکەی و مـامـۆسـتـا دڵڕەقەکانی نەدەدا و دەبـووایە بەرگەی هەموو ئازارێکی جەستـە بگرێت.. ئاخر هەر جارێ وڕکی بۆ شـتێ بگرتایە و دەستی بکردایە بـە گریان، دایک و باوکی پیایدا هەڵدەشاخان و پێیان دەوت:

ـ بەسە بیبڕەرەوە، تۆ پێدەکەنی، ئەوەندە ناشیرینیت، ئینجا بشگریت..!!

بەڵام لە دووری ئاوەدانییدا کەس رێی گریانی لێ ناگرێت و نەک چاوەکانی، بەڵکو هەموو گیانی بە جارێ فرمێسک دەرێژن.. شەوانەیش لە ژێر لێفەکەیەوە گوێ لە سەرگوزشتەکانی باوکی دەگرێت و بە دزیەوە دەگری.. هەر لە ژێر ئەو لێفەیەشدا دەیان جار دەنگی هەناسەکانی باوکی، کە رێک لە فڕڕەی باڵی پۆلە کۆترە کێویە کەمێ بەرزەکانی ئاسمانی ئەو دەشتە دەچن، بێداریانکردۆتەوە و ناڵەناڵی دایکی خـەویان زڕاندووە.. لە داخـا ئەو کوودەریە گوڵگوڵیـەی بە دان ونجـڕ ونجـڕ کـردووە و دەمـارەکانـی لەشـی بە شـێـوەیەکی سـەیر کـەوتـوونەتە کرتەکرت.. هەر ئەوسـاش بیر لە کەرەکەی خـۆی دەکاتەوە، کە هەر جارێ لەو چۆڵیـە ئـاوێزانی دەبێت، هیچ وەکـو «عـورێقـە»ی دایکی نایکات بە ناڵەناڵ و سـەلار و سـەنگین بـۆی دەوەسـتـێت.. جـارێکیـان خـۆی رووتکردبـووەوە و لە

گۆمـێکدا مـەلەی دەکـرد.. کـوڕێکی گـەورە، کـە لەگـەڵ هێـزی ئـاسـایشـی نـاو «سلێمانی» بوو و بە مۆڵەت هاتبووەوە، بینی و سەرنجی لە شەبزووزەکەی دا.. بە حـەپەسـاویـیەوە لە چاوە ریپـۆقـاویـەکـانی ڕامـا و سـەرێکی لێ بادا.. لێی نزیککەوتەوە و توند گوێچکەی گرت.. تفێکی کردە رووی و پێی وت:

ــ بە باوکت دەڵێم، هیچی دی نەهێڵێت ئەو کەرە لەگەڵ خۆت بەریت.

ئەم بەحاڵ دەنگێکی لێ بەرزبووەوە:

ــ بۆچی وام لێ دەکەیت..؟! چییم کردووە..؟!

ــ بێ دەنگ بە کەمتیاری گەڕ، وا دیارە نازانم رۆژانە لەو دەشتە خەریکی چییت..!!

ئەم پێشـتر لە مێـردمنداڵەکـانی هـاوتەمـەنـی خـۆی بیسـتبـووی، گـوایە ئەو بەزمە دەبێتە هۆی زلبوونی شەبزووز، بەڵام وا کەسێکی گەورەش هەمان شت دەڵێت، دیارە راستە و بە خۆڕایی ئەوان وا ناڵێن.. ئەم حەزی زۆری لەو جۆرە قـســانە بـوو و لە هـەر شـــوێنـێ باســێکی ئـاوا دەکــرایەوە، گــوێی خــۆی بۆ قولاغدەکرد.. هەر بە گشتی خۆشیی لە سەرگوزشتەکان دەهات و هەموویانی لەبەرکردبوو.. هەر ئەمەش بوو وانەی مێژووی لا شیرین کردبوو و دوای پۆلی شـــەش بەبێ چـەندوچوون ئـەو بەشـــەی هـەڵبــژارد.. ئەگــەرچی ترسـی ئەوەی هەبوو، کـە زیاتر دەکـەوێتــە بەر چاوان و لەناو شــاری گـەورەدا وەکـو لادێ و شـارۆچکەکان پەنا و پەسـار نییە.. لەوێدا سـەرنجەکان تیـژتر و خێراترن و تا ناخـی نـاخ ڕۆدەچن، بەڵام مـێـژووش بـۆ ئەم گـرنگە و دەیەوێت نـهـێنـیـەکـانی بدۆزێتــەوە.. ئەم لەوەشــدا شــانسـی هەبوو، کــە نـاوی لەو بەشی نـاوخــۆیەدا دەرچوو و چاکتـرین شــوێن بوو بۆ خــۆحــەشــاردان.. هاوژوورەکـانی دوای مـاوەیەکی کـەم هـەر یەکـەیـان بە لایەکـدا ڕۆیشـتن و ژوورەکـەیان بۆ چۆڵکرد.. «ئاڤان» دوای ئەوان بەجێیهێشت و تا مانگێ لەمەوبەر بەپێی کتێبی «هونەری چێـشـتلێنـان»ی دایکی چێـشـتی بۆ لێـدەنا، بەڵام ئـەو جـارە، کـە لەپڕ هـاتە ژوورەوە و بینی وا دوا لاپەڕەی کردۆتەوە و خـەریکی ئەو شـتـە حـەرامـەیە بەو وێنەیەوە، هـەر ئەوەندەی پێکرا سـەرجـەمی شـتومـەکەکانـی خـۆی، بێـجگە لە کتێبەکە، کۆکاتەوە و خێرا بچێتە دەرەوە.. ئێستا ئەم بەبێ ئەوەی بزانێت ئەو

کتێبە بخوێنێتەوە، دەتوانێت هەموو چێشتەکان بە ڕێکوپێکی لێبنێت.. هەمیشە دوای تێرخواردنیش، لەسەر قەرەوێڵەی ئەو ژووره چۆڵە پاڵدەکەوێت و خەون بە «دایکی ئاڤان»ـەوە دەبینێت.. سووک سووک قۆپچەکانی سنگی دەکاتەوە و کۆتره کێویەکان لە هێلانە دەردەهێنێت.. هەڵیاندەگلۆفێت و زمان بە دەنووکیاندا دەهێنێت.. لەپڕ دەیانخاتە نێوان دانەکانی و دەیەوێت گازیان لێ بگرێت، بەڵام نا، دڵی نایەت و یاریی لەوە خۆشتر دەزانێت.. چاو دەبڕێتە چاوەکانیەوە و مژیان لێدەدات.. هەر ئەوەندە دەزانێت وا بۆی شلبووە و لەسەریدا پاڵکەوتووە.. گوێی لە فڕڕەی باڵی پۆلە کۆترەکانی ئاسمانە و تەزووێکی هار و سەرشێت لە دەمارێکیەوە بۆ یەکێکی تری جرتوفرتیەتی.. کاتێکیش ڕانەکانی تەڕدەبن و گیانی خاودەبێتەوە، بیر لە «ئاڤان» دەکاتەوە و بەزەیی پیادا دێتەوە، کە ئیتر بێزی نایەت هیچ یەکێ لەو چێشتانەی ناو کتێبەکەی دایکی بخوات، چونکە هەمیشە ئەو وێنەیەی بیردەکەوێتەوە، کە ئەم بە ریقلاوی شەبزووزە زلەکەی شێواندبووی.

مووسڵ، دەواسە

١٩٨٥ ـ ١١ ـ ٢٧

## مێردی ژنە یۆنانییەکە

ئەوەی وابزانێ بە تووڕەیی و خەمباریەوە شوێنێ بەجێبێڵێت و لە شوێنێکی دی ئاسوودە دەبێت، ئەوا بە هەڵەدا چووە.. ژیانی من چاکترین نموونەیە، کە ئەگەر تاقەتی گوێگرتنتان هەبێ، لە نووکەوە بۆتانی دەگێڕمەوە:

ماڵمان لە گەڕەکێکی هەژارنشینی شاری ئەسینا بوو.. باوکم کرێکارێکی شارەزا بوو و لە کۆمپانیایەک ئیشی دەکرد.. تووشی نەخۆشییەکی پیس بوو و دوای ساڵێ مرد.. دایکم فەرمانبەرێکی بچووک بوو و مانگانەکەی بە هەزار حاڵ بەشی کرێی خانوو و هەندێ پێویستیەکانی دیکەی ژیانمانی دەکرد.. من هەر لە منداڵییەوە حەزم لە تۆپتۆپێن بوو و زۆربەی کاتی دوای قوتابخانەم لەگەڵدا بەسەر دەبرد.. لە تەمەنی دوانزدە ساڵی لە تیپێکی زۆر باش وەرگیرام و ئەمە دڵخۆشی کردم.. پێویستم بە جووتێ لاپچین و جلوبەرگی وەرزش بوو و دایکم بۆی نەکڕیم.. ماڵەکەم بەجێهێشت و بڕیارمدا ڕوو بکەمە شوێنێ، لە هەموو ژیانیدا نەمدۆزێتەوە.. بەبێ ئەوەی هیچ پلانێکم هەبێ، یان شوێنێکی دیاریکراوم خستبێتە خەیاڵی خۆمەوە، هەنگاوم دەنا و دڵم لە خۆم دادەما.. هەندێ جار دەشگریام و پڕ بە هەردوو ناولەپەکانم فرمێسکم هەڵدەڕشت.. گەیشتمە لای گۆڕەپانی ئەو لۆرییە گەورانەی، کە بە مەبەستی بازرگانی بەرەو شوێنی زۆر دوور لێیان دەخوڕین.. شوفێرەکانم بە جلی پیسوپۆخڵەوە دەبینی، هەندێکیان لە دەوری یەکتر کۆبووبوونەوە و خەریکی قسە و باسی خۆیان بوون.. هەندێکیان لەناو لۆریەکانیان نووستبوون و سەریان خستبووە سەر ستێرنە زلەکان.. شەو بوو، بەڵام گڵۆپەکان کە لە هەموو لایەکەوە دەسووتان، یارمەتیان دەدام کەم و زۆر شتەکانی ئەو دەوروبەرە ببینم.. هەستم کرد ئەمە

باشــتــرین ڕێگایە بۆئەوەی لەم شــارە و لەم وڵاتە دوور بکەومــەوە و بچــمــە شــارێکی دوور دووری وڵاتێکی دیکە.. دەمــزانی هــەر یەکێ لەو شــوفــێــرانە شاگردێکی وەکو منیان هەیە و لە ڕێگا یارمەتییان دەدەن.. بۆ نموونە کاتێ لە ناوەڕاستی ڕێگا دوورەکان دەنوون، باوەشێنیان دەکەن و بۆ خۆیان و لۆریە گەورەکانیان دەبن بە پاسەوان.. یان کاتێ ماندوو و بێزار دەبن، بەسەریاندا هاوار دەکــەن و جنێــویان پێ دەدەن، کــە ئەمــەش دەوری هەیە بۆئەوەی مەزاجیان تێکنەچێ و لەو ڕێگا ترسناک و دوور و درێژانە تووشی چورتوومێک نەبن.. خۆ هەندێکیان بۆ مەبەستی زۆر تایبەتییش شاگرد ڕادەگرن، هەر بۆیە شێوە و ڕووخسار لە بەرچاو دەگیرێت.. هەر زوو بۆم دەرکەوت دەستکەوتنی کارێکی وا بۆ من ئاســان نییــە، لەبەر شــێوەم نا، بەڵکو لەبەرئەوەی داوای کەفیلیان لێ دەکردم.. دەبووایە دایک یان باوک ڕەزامەندیی لەسەر بووایە.. خەریک بوو تەما لەوە دابنێم و هەوڵی ڕێگایەکی دی بدەم، کاتێ قەڵەوێکیان کە دوو جار پێم وتبوو و ڕازیی نەبووبوو، سەری لە چوارچێوەی جامەکە هێنایە دەرێ و بە دەنگە سەیرەکەی لێی پرسیم:

ــ باشە تۆ دەتوانی چییم بۆ بکەیت..؟!

ئەم قسەیە ڕازیبوونی پێوە دیار بوو، بۆیە لە خۆشیا وتم:

ــ هەرچی تۆ بتەوێ.

ــ دەتەوێ ڕۆژانەکەت چەند بێ..؟

ــ تۆ خۆت چەندت بە چاک زانی، من پێی ڕازییم.

سەرێکی بادا و وتی:

ــ هەتیوە شێتە دەموچاوت لە باش ناچێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕەزامەندیی پیشان دا و دەبووایە سەعات دوانزدەی شەو بکەوینە ڕێ.. منیش لە ڕووخساری ئەودا زۆر خراپە و نەهامەتییم دەبینی، بەڵام لە ڕێگا بۆم دەرکەوت، کە تەواو بە هەڵەدا چوو بووم.. «کریستۆفەر» پیاوێکی قسەخۆش بوو و دەیان چیرۆکی سەیر سەیری ژیانی خۆی بۆ گێڕامەوە.. هەمووشیان هەر پەیوەندییان بە ئافرەت و دڵداری و خیانەتەوە هەبوو.. هەر زوو زوو بە دەنگە زلەکەی قاقای لێ دەدا و دەیوت:

ـ دەبووایە تەمەنی پیاو چوار ئەوەندەی تەمەنی ژن بووایە، بۆ ئەوەی ئەو سێ بەشەی لە دوای ئەو دەژی، بیر لە مەکرەکانی بکاتەوە.

یان دەیوت:

ـ کەم پیاو هەیە لە ئافرەت تێبگات.. ئەوانەی تێشدەگەن، مەرج نییە نەخەڵەتێن.

ئینجا بەو دەستە قورسەی بە پشتمیدا دەکێشا و هەر بە دەم قاقالێدانەوە دەیوت:

ـ بەڵام تۆ هێشتا منداڵی، لەوە تێناگەی.. هیچ مەرج نییە کاتێ گەورەش دەبی، وەکو من تێبگەی.

بە هەرحاڵ پیاوێکی خراپ نەبوو و لەگەڵ پیشەکەشی زۆر دەگونجا.. لە چێشتخانەکان داوای خواردنی باشی بۆ دەکردم، بەڵام من چونکە دڵم گیرا بوو، بۆم نەدەخوران.. ئەو دەیوت:

ـ بخۆ بخۆ مەترسە، ئەمە هیچ هەقی بەسەر ڕۆژانەکەتەوە نییە.

هەستم دەکرد من ڕێگایەکی چەوت و ترسناکم هەڵبژاردووە و بیرم لە دایکم دەکردەوە، کە چۆن هەموو دنیام بە دوادا دەگەڕێت و وەکو شێت بە پێی پەتی لەسەر ئەو شەقامانە دەسووڕێتەوە.. بەناو کۆڵانەکانی ناو بازاڕدا دەڕوا و لەم و لەو دەپرسێ:

ـ تاقە کوڕەکەمتان نەدیوە..؟! «یانی»ی ناوە و باریکەڵەیەکی جوانە.

قژی دەڕنێتەوە و دەقیژێنێت.. دەکەوێتە ژێر تایەی عەرەبانەکان و کەس بە هانایەوە نایەت.. کەچی جار جار جورئەتم دەنایە بەر خۆم و ژیانێکی خۆشم دەهێنایە بەرچاوم، کە لە یەکێ لەو شارانەی سەر ڕێگا پێی دەگەم.. لۆریەکە دەشت و گرد و شاخ و لادێ و شارۆچکە و شار و وڵاتانی دەبڕی و منیش ترس و دڵەڕاوکێ دەیانتلاندمەوە.. گەیشتینە بەردەمی قەڵایەک و دیمەنەکەیم زۆر بە دڵدا چوو، بۆیە بڕیارم دا هەرکە «کریستۆفەر» لۆریەکەی وەستاند، من خۆمی لێ بدزمەوە و ئەم شارە بکەم بە جێی ژیانی هەمیشەییم.. لە گەراجێکدا لایدا و بە مەبەستی کڕینی هەندێ پێویستی چووینە بازاڕ.. من لەناو قەرەباڵغییەکە دەرفەتم هێنا و لێی جیا بوومەوە.. لە سووچی کۆڵانێکی

تەسکدا پێـچـم کـردەوە و ڕێگای خـۆمم گـرت.. بەڵام کـامــە ڕێگا..؟! خــۆشم نەمـدەزانـی.. ئەو بڕیارە بێمـانایە چی بـوو من دام و دەمـەوێ چـی بکەم.. تازە تەواو هیچ هێزێک نییـە من بگەیەنێتـەوە شـوێنی خـۆم.. شـێوەم هـەندێ سـەیر دەهاتـە بەرچاویان.. تـەمـاشــایان دەکـردم و لێم ورددەبوونەوە.. ئێــوارە بوو.. مەلەکان لە ئاسمـان پۆل پۆل بەرەو هێلانەکانیان دەگەڕانـەوە.. بازاڕەکە وردە وردە چـۆڵ دەبوو.. دەرابـەی دووکـــانـەکـــان یەک لـە دوای یـەک دادەخـــران.. دەستفرۆشـی سـەر شـەقامـەکان شتـەکانیـان دەپێچایەوە.. هـەر یەکـەی ڕێگای ماڵەوەی دەگرت، بەڵام من وەکو ئەو مێروولانەی شـارەکانیان ون دەکـەن، هـەر جـــارێ بۆ لایەک دەچـووم و ئەنجـــام دەهاتمـەوە شـــوێنی خـــۆم.. ئینجـــا لە «کـریســتــۆفــەر» گـەڕام، بـەشکو بیــبــینـم و لەگـەڵی بڕۆمــەوە، بەڵام نـەبوو.. نەمـدۆزیەوە.. چووم بۆ گـەراجـەکە و لۆریەکەم نـەبینی.. نەخـێـر من بە تەنیـا مـامـەوە.. لەسـەر شـەقامێکدا هێزم لێ بڕا و کـەوتم.. دوو سـێ دەسـتـفرۆشی هـاوتەمـەنی خـۆم لێم کۆبوونەوە.. من هـەر بە زمـانـی یۆنانی لەگـەڵیـان دەدوام و ئەوان سـەریان بادەدا.. لە دەمی یەکێکیـان گوێم لە وشـەی یۆنانی بوو و ئەوانی دیکە بۆیان دەسـەندەوە.. دڵم ئاهێکی تێگەڕا.. دەستیان گرتم و گوایە دەمبەن بۆ لای نانەوایەک، کە وەکـو تێگەیشـتم ئەو پیاوە یـۆنانیی دەزانی.. کـەچی لە بەختـی من ئەو ڕۆژە نانەواخـانـەکەی نـەکردبووەوە.. لە دراوسـێکانیـان پرسـی، کە ئەوسـا دەرابەی دووکانەکانیان داخستبوو و دەیانویست بڕۆنەوە.. هـاتنەوە و بە ئـیــشــارەت تێـیــانگەیاندم، کــە پیــاوەکــە ژنـی هێنـاوە.. یەکــێکیــان بە ئیشـارەتێکی ئەوەندە سـەیر پێی وتم، کە بە دەست خۆم نـەبوو پێکەنینم هـات.. دەسـتـەکانی لەمـلا و لەولاوە کردبووەوە و دەتـوت مـاتۆڕ لێ دەخـوڕێ.. تەکانی دەدا و بە لچ و لـێـوە بـاریکەکـانی دەنگی مـاچی دەردەکـرد.. تـا درەنگ لەگــەڵم مـــانەوە و دوایی کـــاتێ تـەواو تاریکی کـــرد، بە دەم ئـاخـــهـــەڵکێـشـــانەوە بەجـێـیـانـهـێـشـتم.. هـەر لـەوێ پشـتم بە دەرابـەکـەی دا و نازانم کـەی خـەوم لێکەوتبــوو.. بـەیانی زوو زوو دەســتــێک خـــەبـەری کـردمـــەوە و دوو چاو بە حـەپەسـاویەوە لێم ڕادەمان.. کاتێ سـەرم هـەڵبڕی و لە سـیمـای ورددبوومـەوە، پیـاوێکی بالابـەرزی ئەسـمــەرم بینـی.. وای بۆ دەچووم تەمــەنی لە چلی تێپـەڕ

کـردبێ.. کلیلەکـانی بـە دەسـتــەوە بوو و یـاریی پێ دەکـردن.. زانیم ئەمــەیە نانەواکە و کەوتمە قسەکردن لەگەڵی.. یەکەم وتەی ئەوە بوو:

ــ دەمزانی لەم ڕۆژانە دەگەی..!!

واقم وڕمـــا.. ئـاخـــر چۆنـی دەزانی..؟! کێ پێی وتبـــوو..؟! لە کـــوێ منـی دەناسی..؟! خـۆ من خـۆشم نەمدەزانی دەگـەمـە شـارێکی ئاوا.. هـەر خـێرا ئەو خـەیاڵانەم لـە مـێـشکمـدا کـردە دەرێ و زانیم ئـەوانـەی لە بازاڕەکـاندا ئـیش دەکەن، کۆمـەڵێ قسەی لەم بابـەتەیان هـەیە و وا خـۆیانـی پێ دەردەخەن، کە لە هەمـوو شتـێ تێدەگەن و کـەس ناتوانێ فێڵـیـان لێ بکات.. ئەمـانەم بە وردی لە کوڕانی گـەڕەکەکەم بیستبوو.. بە ڕاسـتی ئەوەندەش دڵم پێی کرایەوە، خەریک بوو سـەدان ماچی دەسـتەکانی بکەم.. یەکـەمجـار بوو هـەست بە بۆنی باوکێک بکەم.. قوفڵەکانی کردەوە و دەرابەکەی بڵند کرد.. چووینە ژوورەوە.. باشە خۆ من پێم نەوت دەمــەوێ لەگــەڵی ئیش بکەم، ئەی چۆن وەکـو شـاگـردێکی تازە حیسـابی لەگەڵدا کردم..؟! ئەم پرسـیـارەشم لە خـۆم کرد و خـێرا وەکو ئەوانی دیکە بەلاوەم نا.. بەدەم لەبەرکردنی جلەکانی ئیشی، پێی وتم:

ــ تا فێری هـەویرکردن و نـانپێوەدان دەبی، هـەر لە دەرگا بوەسـتـە و نانم بۆ بفـرۆشـــە.. مـــەڵێ زمـان نـازانم، بە چەنـد ڕۆژێ فـێـر دەبی.. جـارێ هـەر بە ئیشارەت تێیانبگەیەنە.

ڕاسـتی دەکرد زوو فێری زمـان بووم.. ناوی لێ نام «پشـتـیوان» و هـەر ئاوا بانگیـان دەکــردم.. تەنانـەت زۆر لە خـــەڵکەکـە نـەیاندەزانـی یۆنانـیم.. منـیش ئیشـێکی باشـم بۆی دەکرد.. ئێـوارانیش سـەبـەتەیەکی پڕ نانم دەبردە بازاڕی شـێخـەللا و بۆم دەفرۆشت.. هـەندێ جـار لـەناو ئەو سـەبـەتەیە دەسـتی کچـانم دەگرت و تا تینم تێدا بوو دەمـوت:

ــ گەرم و نەرم.

شـەوانیش هـەر لـەسـەر فـەردە ئاردە هـەڵچنراوەکـانی سـووچی ئەوسـەری نانەواخـانـەکە دەنـووسـتم.. لەوێ بیـرم لە دایکم دەکـردەوە و زۆر جـار بۆشـی دەگریـام.. ئاخـۆ ئێـستـا چی بەسـەرهـاتبێت و دوای ونبـوونی من چ حـاڵێکی هەبێ.. کێ دەڵێ ماوە و لە داخا هەر زوو بە سکی نەداوە..!!

«کاک خەسرۆ»، کە ئەگەر پێم شەرم نەبووایە بە باوکە بانگیم دەکرد، پیاوێکی ناسراویش بوو لە بازاڕەکە و گاڵتەی خۆش خۆشیان لەگەڵدا دەکرد.. بەڵام هەبوون لێیان دەپرسی:

ــ ژنە یۆنانیەکەت چۆنە..؟!

ئەمە بۆ من خۆش نەبوو.. ڕووم گرژ دەکرد و لە چاوەکانی «کاک خەسرۆ»م دەڕوانی، بۆئەوەی بزانێ کە من چەند ئەمەم پێ ناخۆشە، کەچی ئەو دەیوت:

ــ چییە..؟! بۆ ئاوا سەیرم دەکەی..؟! هیچ بووە..؟!

هەندێ جار «کاک خەسرۆ» هەر لە خۆیەوە، بەبێ ئەوەی هیچی خراپم کردبێ، تووڕە دەبوو و لە بەرخۆیەوە دەدوا:

ــ بزانە خۆم تووشی چی کرد.. بێقیمەتی وا حەوت مەملەکەتی بڕی و خۆی بەسەر مندا ساغ کردەوە.. ئای لە بەختی ڕەشم، لە سەرتاپای ئەم شارە هەر من یۆنانی دەزانم و هێنایانە بەر دەرگاکەم.. خەتای خۆشمی تێدا بوو، نەدەبووایە ئاوا زوو بخەڵەتامایە.. بەڵام شەرتبێ لەژێر داردا دایڕزێنم و بۆ باپیرەگەورەی ئاقڵ بکەم.

کاتێ من سەیریم دەکرد و بە چاوەکانم ناڕەزایی خۆمم پیشان دەدا، ئەو بە ئاگا دەهاتەوە و پێی دەوتم:

ــ ئیشی خۆت بکە پشتۆ، هەقی منت نەبێ.. تۆ نازانی من لە چ حاڵێکدام.

دوای ئەوەی فێری ئیشەکان بووم، هەر خۆم نانەواخانەکەم بەڕێوە دەبرد.. هەویرم دەشێلا.. گونکم لێ دەگرت.. پانم دەکردەوە.. بە تەندوورم وەدەدا.. دەرم دەهێنا و دەشمفرۆشت.. هەموو ئەمانە تەنها بۆئەوەی شوێنێکم هەبێ و شەوان تێیدا بنووم.. ساڵ بە ساڵ چاکتر سەرم لە پیشەکەم دەردەچوو و زیاتر لە بازاڕ دەناسرام.. «کاک خەسرۆ» درەنگ درەنگ بە جلی کەشخەوە دەهات و لەو بەردەمە لەسەر کورسیەک دادەنیشت.. هەندێ جار منداڵەکانیشی دەهێنا.. دەبووایە من دەستیان بگرم و لە بازاڕ شەربەت و کاستەر و شتی دیکەیان بۆ بکڕم.. زۆر جار لەسەر شۆستەی ئەو شەقامانە دەمکردنە قەڵاندۆشکان و دەمگێڕان.. یاریی خۆش خۆشم لەگەڵدا دەکردن، هەر بۆیە ئاوا هۆگرم بووبوون و وەکو براگەورەی خۆیان نازیان بەسەردا

دەکردم.. «کاک خەسرۆ» بەدەم هەڵقوڕاندنی چاکەی بەردەمی دەیوت:

ــ کەس نازانێ وەکو تۆ دڵی ئەم منداڵانەی من ڕا بگرێت.

هەر خۆیشی دەیوت:

ــ تۆ زۆر چاک لێیان تێدەگەی.

هاوڕێکانی دەهاتن بۆ لای و بە گاڵتە و قسە خۆشەکانیان ئاوەدانییان دەخستە ئەو کۆڵانەوە.. «کاک خەسرۆ» باسی ڕابردووی خۆی بۆ دەکردن.. باسی ئەو ساڵانەی کە لە یۆناندا بەسەری بردووە.. گەورە و بچووک بەلایدا تێدەپەڕین و سەلامیان لێ دەکرد.. هەندێکیشیان بە پیشەی خۆیان دەیانپرسی:

ــ ژنە یۆنانیەکەت چۆنە..؟!

جارێکیان ئەو کچە لەوێ بوو، کە یەکترمان خۆشدەویست و هەموو شتێکمان براندبووەوە، کاتێ یەکێ لەو هاوڕێ قۆشمەچیانەی بەوێدا تێپەڕی و وای وت.. من دوای کەوتم و پێم وت:

ــ ئەگەر پیاوی دەوەستی، بزانە چۆن ناوسکت بە لەقە دەدڕم.

«کاک خەسرۆ» بە حەپەساویەوە لێم ڕاما و وتی:

ــ ئەوە چیتە تۆ پشتیوان..؟! بۆ لەو خەڵکە تووڕە دەبی..؟!

بۆ یەکەمجار بەرپەرچیم دایەوە:

ــ خەتای جەنابتە، ئەمە کەی گاڵتەیە تۆ لەگەڵ ئەو خەڵکەی دەکەی..!!

ــ گاڵتەی چییم کرووە..؟! ئەوە تۆ چییتە..؟!

دەبووایە ئاوا بکەم، چونکە «ڤیان» دەیزانی من یۆنانییم و باسی هەموو نهێنیەکانی ژیانی خۆمم بۆی کردبوو.. چەندی خۆشدەویستم.. لە بازاڕی شێخەڵلا ناسیم.. کاتێ دەستە ناسکەکانی لەناو سەبەتەکە نانیان هەڵدەبژارد، دەستەکانمم خستە سەریان.. پەنجەکانیم گوشی.. کاتێکم زانی دوو چاو لە چاوەکانم دەڕوانن.. پڕن لە حەز و شەهوەت و پێدەکەنن.. بەڵام ئێستاش دەڵێم ئەوە پێکەنین نەبوو.. چاو لە حاڵەتی ئاوادا چۆن دەتوانێ پێبکەنێ.. نەدەکرا لە بەرچاوی ئەو حەشاماتە لە باوەشی بگرم و تێر تێر ماچی بکەم، بۆیە دەمارەکانم گرژ دەبوون و ئاخی قووڵ قووڵم هەڵدەکێشا..

هیــوام دەخــواست جــووتێ مــەل بــوونایە و لەنــاو ئەو ســەبەتەیە دەنووکــمــان بخــســتــایەتە نــاو دەنووکی یەکــتــرەوە.. دەیان شــەو دەچووم بــۆ لای مــاڵیــان لەگــەڕەکی ڕووناکی و هەر لــەســەر دیوارەکــە دەمم دەخســتــە ناوی دەمیــەوە.. قۆپچەکانی ســەر سنگیم دەکردنەوە و دەستم دەبردە نــاو یەخەی کراســەکەی.. پەنجە مــاندووەکانمم تێدا دەگێڕان و گیانمان بە ژێر لەزەتدا دەکەوت.. هەموو جارێ پێی دەوتم:

ــ هیــوادارم چاو و دڵت بــە بینینی دایکت ڕۆشــەنبــێــتــەوە و لە ســایەی ئەودا زەمــاوەند بگێڕین.

کــاتێ دەهــاتمــەوە نانەواخــانەکەش، وامــدەزانــی دەســتــەکانیم لەگــەڵ خــۆمــدا هێناوە.. دەمــخــســتــنە ژێر ســەرمــەوە و لــەســەر پشت ڕادەکــشــام.. ژیانی داهــاتووی خــۆمــانمــم دەهێنایە بەرچاو و دڵم پڕ دەبوو.. لە هــەمــوو کــاتێکی دیکە زیاتر دایکمــم بیــردەکەوتەوە و بۆی دەگریام.. قســەکەی «ڤیــان» لە گوێچکەمــدا دەزرنگــایەوە: «هیــوادارم چــاو و دڵت بە بــینیــنی دایکت ڕۆشــەنبــێــتــەوە و لە ســایەی ئەودا زەمــاوەند بگێڕین».. لەپڕ هەســتم بە نائومــێدی دەکــرد.. منێکی شــاگــردنانەوای بێــمــاڵ و بێــپــارە و بێکەس چۆنم دەتوانی «ڤــیــان» بکەم بە هاوســەری خــۆم.. گــەڕانەوەش زەحــمــەت بوو.. هەتا ئەگــەر واشم بکردایە، «ڤیــان» لەگەڵم نەدەهــات.. منیش نەمدەتوانی بەجێیبهێڵم.. نا، من مــەحاڵ بوو بۆ دەقــەیەکــیش بمتــوانیــایە ئەم شــارە بەجێبــهێــڵم.. «کــاروان کــاکەســوور» قــوتابیــەک بوو و هەمــوو ڕۆژێ نــانی لە نانــەواخــانەکــەمــان دەکــڕی.. بووبووە هــاوڕێم و زۆر جار بە یەکەوە گفتوگۆمان دەکرد، جارێکیان پێی وتم:

ــ بۆئــەوەی شــوێنێکت خــۆشــبــوێت و لێی بێــزار نەبی، دەبــێ بەلایەنی کــەم دۆستێکی تێدا بگری.

من «ڤیان»م هەبوو و لــە هەموو شــتێ زیاترم خۆشدەویست، بــەڵام پێویســتم بە دایکێکیش بوو تــا لە سایەیدا زەمــاوەندی لەگەڵدا بگێڕم.. ساڵەکان یەک لە دوای یەک تێــدەپەڕین و کــەم کــەم ئەو تەمــەنەی منیــان لەگــەڵ خــۆیــاندا لوول دەدا.. لە بــەردەمی ئەو تــەندوورە گــەرمــە هــەڵدەپڕووکــام و بیــرم لــە «ڤــیــان» دەکــردەوە.. داڵغــەم لێدەدا و لەگــەڵ دەنگی کــڕیارەکــانم بە ئاگــا دەهــاتمەوە..

هەندێ جار «کاک خەسرۆ» لەسەر کورسیەکەی بەردەرگا هاواری دەکرد:

ــ چیتە پشتۆ..؟! کورە ئەو نانانە سووتان..!!

هاورێیەکم کچێکی خۆشدەویست و شێتی بووبوو، بەڵام هیچ شوێنێکی بە شایانی ئەوە نەدەزانی تێیدا بیری لێ بکاتەوە، بۆیە لە خەیاڵی خۆی دەری کرد و ئەنجام بە سکی دا.. من وا نەبووم.. بە ڕۆژ لەناو ئەو ئاگرە و شەوان لەسەر فەردە هەڵچنراوەکان بیرم لە «ڤیان» دەکردەوە و لەناو خەیاڵەکانمدا لەگەڵی دەژیام.. سوور دەیزانی ژیانی من ناگۆڕێت و مەحاڵە ببم بە خاوەنی پارە و شوێنی خۆم، کەچی ددانی بە خۆیدا دەگرت و دڵنەوایی منیشی دەدایەوە.. جورئەتی دەخستە بەرم، بەڵام من ڕۆژ بە ڕۆژ نائومێدتر دەبووم و لە ناخەوە دادەڕووخام.. «کاک خەسرۆ»ش هەر وەکو جاران بە شاگردە دەستەپاچە و گوێڕایەڵەکەی دەزانیم و دەیویست ئیشەکەی بە چاکی بەڕێوە بچێت.. ئەو ڕۆژ بە ڕۆژیش تووڕەتر دەردەکەوت و زیاتر هەڵیدەبزرکاند:

ــ ئەگەر تۆ ژیانمت ئاوا بەلاوە سەیر بێت و لێی تێنەگەی، ئاخۆ دوای مردنم چییم پێ دەڵێی..!!

من وەکو جاران گوێم نەدەدایە و دەمزانی ئەو قسانەی لەگەڵ کەسدا نییە، بگرە هەر ماناشیان نییە.. کاتێ بەناو بازاڕدا دەسووڕایەوە، خەیاڵی دەڕۆیشت و دەست و قاچی ڕادەوەشاند.. خەم و خەفەت وشکیانکردبووەوە و چاوەکانی بە قوڵدا چووبوون.. لەپڕ دەکەوت و بە دیوارەکانەوە هەڵدەستایەوە.. لەوە دەچوو تووشی بەڵایەکی زۆر گەورە بووبێت و لە منی بشارێتەوە.. ئەو هیچ نهێنیەکی لای من نەدەدرکاند.. تەنانەت هەندێ جار دراوسێکانی نانەواخانەمان پێیان دەوتم:

ــ واماندەزانی تۆ زۆر وریای، بەڵام پێت ناخۆش نەبێ لەم شارە کەسێکی دیکە نییە بەقەدەر تۆ دەبەنگ.. ئەوە چەند ساڵە لەگەڵ ئەو پیاوەی و هیچی لێ تێنەگەیشتووی.

کەچی هەموو ئەو قسانەش وایان لێ نەدەکردم ڕقم لێی بێت، بگرە زۆر خەفەتیشم دەخوارد، کاتێ دەمبینی ئاوا کز و بێهێز بووە و بەزەحمەت دەتوانێ بە ڕێگادا بڕوات.. دەسا ئەو ڕۆژەی هەواڵی مردنیم بیست، چەند

جارێ لە داخا سەری خۆم بەو دیوارانەی نانەواخانەکەماندا کێشا و وەکو منداڵ بۆی دەگریام.. چاکترین پرسیاریش کە ئەوسا لە خۆمم کرد ئەوە بوو، ئاخۆ ژن و منداڵەکانی چی لەو نانەواخانەیە دەکەن و چارەنووسی من چی دەبێت..؟! حەفتەیەکی پێچوو و کەسم نەبینی.. من ئیشی خۆمم دەکرد و بە نیگەرانییەوە نانەواخانەم بەڕێوە دەبرد.. دوای حەفتەیەک سەرجەمی پارەکەم بۆ ژن و منداڵەکانی برد.. چووم بۆ گەڕەکی ئازادی و بە پرسیار ماڵەکەیانم دۆزیەوە.. هەرکە دەمپرسی، ئەوان دەیانوت:

ــ کاک خەسرۆ نانەوای ڕەحمەتی..؟! مێردی ژنە یۆنانیەکە..؟!

نەمدەزانی چیان پێ بڵێم و خەتاکەیم دەخستە ئەستۆی ئەم.. ئەم ئەگەر ئەو گاڵتە ناشیرینەی لەگەڵدا نەکردبانا، ئەوانیش هەرگیز ڕێگایان بە خۆیان نەدەدا شتی ئاوا بێتام بڵێن.. گەیشتمە بەردەرگا و منداڵەکان لە خۆشیا هاواریان کرد:

ــ دایە کاکە پشتیوانی شاگردی باوکم هات.

بچکۆلەکەیانم کردە باوەشمەوە و چەند ماچێکم لەسەر ئەو کوڵمە پەمەییانەی نەخشاند.. سەریم نووساند بە سنگمەوە و گوشیم بە خۆمەوە.. بەبێ ئەوەی دایبنێم، بەرەو ژوورەوە هەنگاوم نا و گەیشتمە بەردەرگا ساجەکە.. ژنێکی قەیرەم لەسەر تاکێکی قەنەفەکە بینی، قژە کاڵەکەی بەملا و بەولای سنگیدا هێنابووە خوارێ و دەستەکانی خستبووە سەر ڕانەکانی.. بە سووکی سەری هەڵبڕی و لێم ڕاما.. داچڵەکیم و لە دڵی خۆمدا وتم: «چەند لە دایکم دەچێ.. ئەویش ئاوا سەری هەڵدەبڕی و سەیری دەکردم».. کەمێکی دی چوومە پێش بۆئەوەی پارەکانی بدەمێ و چاکتر سەرنج لە سیمای بدەم.. ئینجا زانییم ئەوە بە ڕاستی دایکمە و تەواو لە شوێنی خۆم وشک بووم.. ئێستاش نەمزانی چۆن بەجێمهێشتبوو و کەی گەیشتبوومە سەر شەقامە گشتیەکە، بەڵام بەحاڵ بیرم دەکەوتەوە کاتێ پارەکەم خستە ناو دەستی، ئەو سەیرێکی کردم و ویستی شتێکم پێ بڵێ.. ئەو شتە بووە بە مەراقم و دەبێ هەموو ژیانی خۆمی بۆ تەرخان بکەم.. دەیویست بڵێ چی..؟! بە چ زمانێ قسەی لەگەڵدا دەکردم..؟! بەو زمانەی لەگەڵ خوشک و براکانم دەدوێ، یان بە

زمـانەکـەی جـاران..؟! بە «یانی» یان «پشـتـیـوان» بانگی دەکـردم..؟! هەمـوو حـەفتـەیەک کاتێ پـارەکانی بۆ دەبەم، بە هەمـان شـێوەی ئەو ڕۆژە لە چاوەکانم دەڕوانێ و دەیەوێت شـتـێکم پێ بڵێ، بەڵام نایڵـێت و بەو خـەفـەتەوە دەمکوژێ.. «ڤـیـان»یش ئێـسـتـا نایەت بۆ لام و نازانم چی بەسـەرهـاتووە.. پڕ بـە دڵ پێم خۆشە، کە نایبینم، نەوەکا پێم بڵێ:

ـ هیـوادارم چاو و دڵت بـە بینینی دایکت ڕۆشـەنبـێـتـەوە و لە سـایەی ئەودا زەماوەند بگێڕین.

مووسڵ/ کانوونی دووەمی ١٩٨٦

* جـــاران لـە شـــوێنی وشــــەی یـۆنانـی، وشــــەیـەکـی دیکـە هـەبوو و نـاوی کارەکتەرەکانیش گۆڕاون.

## ژنە ناسکەکەی سەربەست فەریادی

«سەربەست فەریادی» بە ئاسانی ناونیشانی «ژنە ناسکەکە»ی بۆ دوا شیعری خۆی نەدۆزیبووەوە، بەڵکو ئەو شەوە تا بەیانی بە درێژاییی ژوورەکە بەدەم بیرکردنەوە و مێشکگوشینەوە دەهات و دەچوو.. «بەهرە»ی ژنی، کە بە کراسێکی هەناریی تەنکەوە لەسەر سیستەمەکە نووستبوو، چەند جارێ خەبەریبووەوە و نارەزاییی دەربڕی:

ــ ئێستا پێم ناڵێی ئەم راکەراکەت لە چییە بەم نیوەی شەوە..؟! وەکو خۆت نانوویت، دە بهێڵە من بنووم، یان هیچ نەبێت برۆ ئەودیو.

خوویێکی سەیر بوو گرتبووی و نەیدەتوانی وازی لێ بێنێ.. لەو ژوورەی نووستندا نەبووایە شیعری بۆ نەدەهات.. لەگەڵ نووسینی هەر شیعرێکدا شەرێکی گەورەی لەگەڵ ئەو ژنەی هەڵدەگیرساند.. سیوایان بووبووەوە و دەیان قسەی ناشیرینیان بە یەکتر دەوت.. «بەهرە» زوو زوو سەری لەسەر سەرینەکەی هەڵدەبڕی و پێی دەوت:

ــ خۆزگە ژنی گامێشەوانێ بوومایە، نەک هی شاعیرێکی بوودەڵەی وەکو تۆ، خۆ هەر هیچ نەبووایە شەوان تا بەیانی لە باوەشی خۆیدا دەینواندم.

ئەو کاتی خۆی لەناو ئەو هەموو کورەی «زانکۆی مووسڵ» دڵی چووبوو بە «فەریادی»دا و چاوی لە زۆر عەیبی پۆشیبوو، هەر لەبەرئەوەی شاعیر بوو و لە گەشت و بۆنەکاندا بە جوانترین شێوە شیعرەکانی خۆی بۆ قوتابییان دەخوێندەوە.. ئەمیش دەیان جار بەوە دڵنەوایی خۆی دابووەوە، کە ئەگەرچی هەرچی رەخنەگر و نووسەر هەن، گاڵتەیان لە شیعرەکانی دێت و هەرگیز دان بە تواناکەیدا نانێن، بەڵام هەر ئەو شیعرانە جوانترین کچیان بۆ مسۆگەر

کـردووه.. هەندێ جـاریش وایدەزانی ئەوان بۆیە ئەوەنـدە ڕقـیـان لێـیـەتی و هەمیشە لەملا و لەولاوە پەلاماری دەدەن، چونکە ژنێکی جوانی هەیە و چاویان پێی هەڵنایەت.. هەموو ئەو شتانەش لە پەنادیوار و سەر کورسیی شەقوشڕی گـازینۆ و بەدەم پیـاسـەی ئێـوارانـی سـەر شـەقـامـەکـان دەڵێن و نایەنەوێت لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا تاقە دێڕێکی لەسەر بنووسن، نەوەکا ببێت بە ناوێک و بناسـرێت.. لەگـەڵ بـڵاوبوونەوەی شـیـعـری «ژنە ناسکەکـە»یدا زۆر شـتی بۆ ڕوونبـووەوە، بەڵام درەنگ.. سـەرەتا هـیچ سـەری لەوە دەرنەدەکـرد، کـە بۆچی ئەوان هەر هەموویان و بەجارێ دەربارەی ئەو شیعرەیان نووسی.. هەندێکیان بە چاک و هەندێکیان بە خراپ:

«ژنە ناسکەکەی سەربەست فـەریادی تا بڵێی لـەزەتبـەخشـە و مـرۆڤ لێی تێـرنابێت».. «یـەکێ لە خـاسـیـەتەکـانی ژنـە ناسکەکـەی سـەربەست فـەریادی ئەوەیە، تا مـاوەیەکی زۆر لە خـەیاڵدا دەمـێنێـتەوە و بەئاسـانی لە یادناچـێتـەوە، چونکە بەڕاسـتـیی تەڕ و پاراوە و دەچێ بە ناخـی ڕۆحـدا».. «ژنـە ناسکەکـەی سـەربـەست فـەریادی بە تـەکنیکی تازە خـۆی تێکەڵی گـیـانم دەکـات و تا تەواو نەبێت، ناهێڵێ لێی جیاببمەوە».. «زمانی ژنە ناسکەکەی سەربەست فەریادییم زۆر بەدڵ بوو، ئەو لە هەموو شتێکی دیکەی زیاتر موچورکەی پیادا هێنام».

ئەوانی دی نووسیویانە:

«ژنە ناسکەکەی فەریادی ئەوە نییە، کە هەندێ کەس پیـایدا هـەڵدەڵێن، زۆر فـشـەڵە و لەشـێکی داهـێزراوی هـەیە».. «ژنە ناسکەکەی فـەریادییم لایە و وا دەیهـێنم و دەیبـەم، هیچ لـەگـەڵ ئـەو شـتـانـە یەکناگـرێتـەوە، کـە هەندێ لە ڕەخنەگـرەکـانمان باسـیـان کـردووە».. «فـەریادی خـەیاڵی خـاوە بـەهۆی ژنە ناسکەکـەیەوە، خـۆیمان لـەسـەر بکات بە شـاعـیـر و ناوبانگ پـەیداکـات».. «سـەربەست فـەریادی بە بەهـرە پشـتی قـایمە و خـاوەنی ڕۆشـەنبـیـرییـەکی خەملێو نییە، دیارە بەهەرەش ناتوانێ کەسێک بکات بە شاعیر، کە هیچی تێدا بەستە نییە.. بەڵێ، ژنە نـاسکەکەی ناتوانێ ئایندەیەکی ڕۆشەنی بۆ مسۆگەر بکات».

هـەر جـارێ لەسـەر لاپـەڕەی ڕۆژنامـە و گـۆڤـار و سـەر شـاشـەی

تەلەڤزیۆنەکاندا، چاوپێکەوتن لەگەڵ هەر نووسەر و ڕەخنەگرێکدا بکرێت و پرسیاری: بەرهەمی تازەت چییە..؟! یان بۆچی ماوەیەکە دەرناکەویت..؟!ی لە بەردەم قووتکرێتەوە، ئەو بەبێ بیرکردنەوە دەڵێت: «جارێ خەریکی ژنە ناسکەکەی سەربەست فەریادییم و وازم لە هەموو شتێکی دی هێناوە».

ئەو گۆڤارەی شیعرەکەی تیادا بڵاوکرایەوە، هەر زۆر زوو لە کتێبخانەکاندا تەواو بوو، بۆیە «سەربەست فەریادی» ڕۆژانە نامە لەسەر نامەی پێ دەگات و تیایدا دەنووسن: «تکایە ژنە ناسکەکەتم بۆ بنێرە، با شەوێکم لا بێت، دڵنیابە بۆتی دەنێرمەوە».«*»

سلێمانی ١٢ ـ ٧ ـ ١٩٨٦

* ئەم چیرۆکە لە ژمارە ٢٩ی گۆڤاری «رابوون»دا بڵاوکراوەتەوە. جاران لە جێی وشەی «ناسکەکە»، وشەیەکی دیکە هەبوو.

## ناتەوێ هیچ پیاوێ دایکت بە ڕووتیی ببینێت

تا دەوڵەمەندتر دەبن، زیاتر باوەڕ بەوە دەهێنیت، کە تەواو ئیتر ئێوە ڕۆژێ لە ڕۆژان ناگەڕێنەوە ناو ڕەشمالّی قەرەجەکانی قەراغ شار.. خۆ ئەگەر بشگەڕێنەوە، تۆ هەر ناتوانیت وەکو ئەوسای منداڵییت هەست بە خۆشیەکانی ئەوێ بکەیت.. تۆ وەکو هەموو جارێکیش بە خۆت دەڵێیت: «خۆش نەبوو.. خۆش نەبوو، بەلاّم زاکیرەم هەمیشە لەگەڵمدا ناپاکە و شتە دزێوەکانم لە شێوەی بزەی سەر لێوی کچە هەرزەکارەکانی ناو خەونی بەرەبەیانی پایزێکی درەنگوەخت دەخاتە بەرچاو».. هەر چۆنێ بێت ڕۆیشت و ناگەڕێتەوە.. ئەو خانووەی باوکیشت ماوەیەک لەمەوبەر لە بازرگانێکی گەورەی کڕی و ئەمڕۆ دەچنە ناویەوە، ئەوەندەی دی هیوای گەڕانەوەت لە دڵدا دەکوژێت و گۆڕانی سیمای شتەکان زیاتر بڕستت لێ دەبڕن.. باوکت بە پێچەوانەی تۆ حەز لە کۆشک و تەلاری گەورە دەکات و لە هیچ خانووێکدا ساڵێک بە تەواوی خۆی ناگرێت.. گەڕەک نەماوە لەم شارە ئێوە بۆی نەچووبن، بێجگە لەو گەڕەکەی، کە پێش چوونتان بۆ ڕەشماڵەکان، تۆ و دایکت تیایدا دەژیان.. هەموو بیرکردنەوەیەکیش لەو خانووە و لەو گەڕەکە، پەنجەگەورە قرتاوەکەی دەستی چەپی دایکتت بیر دەخاتەوە و دەتباتە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە.. ئەگەر دایکت بیزانیایە بە دەستی ڕاستی مەقەست بگرێت و هەر وەکو جاران لەو ساڵۆنە ئیش بکات، ئێوە ڕێتان نەدەکەوتە ناو ئەو ڕەشمالاّنە و ئاوا ئوڵفەتت بەو ژیانە سەیر و بەسەرچووەی قەرەجەکانەوە نەدەگرت.. ئەو چەکدارەی هەر دەتوت لە دوتوێی لاپەڕەی کتێبە مێژووە کۆنەکانەوە هاتۆتە دەرێ و بەم خاک و خۆڵ و بەم ژیانە نامۆیە، نەدەبوو بە باوکت و سیمای ڕاستەقینەی شتەکانی لێ

نەدەگۆڕی.. خۆ دایکت زۆر هەوڵی دا بە دەستی ڕاستی ئەو مەقەستە بگرێت و خۆی ڕابێنێت، بەڵام هەر نەیتوانی و مەحاڵیش بوو ئاوا بە ئاسانی فێری بێت.. هەموو جارێکیش لە داخا نووکەکانی دەکرد بە باسکی ڕووتی چەپیدا و کۆمەڵێ هێڵی سووری لەسەر دەنەخشاند.. تۆ بەدەم گریانەوە دەستیت دەگرت و لێی دەپاڕایتەوە، کە وا نەکات، چونکە دەترسایت وەکو پەنجەکەی تووشی نەخۆشیی بێت و دواییش لە خەستەخانە بۆی ببڕنەوە.. ئەو پەنجەیەشی سەرەتا دوومەڵێکی بچکۆلەی لێ هات و وردە وردە گەورە بوو.. لێی پیس کرد و ئەنجام بۆیان بڕیەوە.. ئیتر تەمای لە ئیشەکەی دانا و کەوتە فرۆشتنی کەلوپەلی ناو ماڵەکە.. خانووەکەی بە «حاجی ڕەمەزان»ی دراوسێتان فرۆشت و تیایدا بوون بە کرێچی.. کرێتان بۆ نەدرا و دەریکردن.. چوون بۆ لای قەرەجەکان و ڕەشماڵێکی بچکۆلەتان دەسکەوت.. دایکت بەرچنەی درووستدەکرد و بە جووتە دەرگا دەرگا، کۆڵان کۆڵان، گەڕەک گەڕەک دەتانگێڕان.. لەمەوە زانییت چ جیاوازیەکی سەیر لەنێوان ژیانی ساکاری قەرەجەکان و هی ئاڵۆزی ناو شاردا هەیە، بەڵام ئێوە سەر بە هیچ کامێکیان نەبوون.. هەرگیز نەتاندەتوانی وەکو ئەوان بژین.. دایکت هەمیشە بە پارێزەوە هەڵسوکەوتی دەکرد و لە ڕووی نەدەهات وەکو ئەوان هەموو شتێ بکات.. کاتێ دەچوو بۆ ئەو حەمامەی لە دووری ڕەشماڵەکان بە بەردی زل درووستکرابوو و بە جەمەلۆن سەریان گرتبوو، ئەو جەمەلۆنانەی لە پەراسووی ئەو مانگایانە دەچوون و ناو دەمی تۆیان دەکرد بە ئاودڕکەی لیکێکی خەست، کە بە قەنارەی گۆشتفرۆشەکانی ناو قەیسەریە کەمێ تاریکەکە هەڵواسرابوون و سێبەرەکانیان لە شێوەی شتی سەیر سەیر دەردەکەوتن، دەبووایە تۆ لە بەر دەرگاکەی بوەستیت و نەهێڵیت کەسی دی خۆی پیادا بکات.. ئەو جارە چاوت خێل کردبوو و لەو بەردە سپی و زلانە ڕادەمایت، کە لە لای ڕەشماڵەکانەوە تا بەر دەرگای حەمامەکە ڕیز کرابوون و قەرەجەکان بە پێی پەتیی بەسەریدا دەڕۆیشتن، لەبەر بینایتدا وەکو پۆلێ قاز دەردەکەوتن و لەزەتێکی زۆر سەیرت لە تەماشاکردنیان دەبینی، کاتێکت زانی پیاوێکی چەکدار دەستی خستە سەر شانتەوە و داچڵەکیت.. بەبێ ئەوەی هیچ شتێ بڵێ، تۆ هەر بەترسەوە سەیرت

کرد و بە زمانێکی تێکئاڵاوەوە پێت وت:

ــ ناهێڵم بچییتە ژوورەوە، چونکە دایکم لەوێ خۆی دەشوات.

ئەو وەک بڵـێی لەگـەڵ کـەسـێکی گـەورەدا بدوێ، نـەک منداڵێکی هـەشت ساڵان، بەدەم سـەیرکردنی کاتژمێرەکەی دەستی ڕاستی، هەناسـەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە لەفزێکی شیرین پێی وتی:

ــ بەڵام من هـەمـوو ڕۆژێ دەبێت ڕێک ئەم کاتە لێرە خـۆم بشـۆم و ناتوانم بە هیچ شێوەیەک دوایخەم.

ــ ئەی من بۆچی تا ئێستا تۆم نەبینیوە..؟!

سـەیرێکی کاتژمێرەکەی کردەوە و پێی وتی:

ــ بچکۆل گـیـان زۆرم لەگەڵدا مـەڵێ و لەوە زیاتر ڕاگیـرم مـەکە، من دەبێت بچمە ژوورەوە و خۆم بشۆم.

ــ ناهێڵم.. ناهێڵم دایکی من بە ڕووتیی ببینیت.

ئەمـەت وت و لە کونی دەرگاکەوە سـەیرێکی دایکتت کرد، لەسـەر تـەختـەکە دانیشتبوو و لفکە زبرەکەی بە گیانە لووس و سافەکەیدا دەهێنا.. چەند جارێ بە شپرزەییەوە هاوارت کرد:

ــ دایکە خێرا جلەکانت لەبەرکە، پیاوێکی زۆر سەیر هاتووە و دەیەوێت بێتە ژوورەوە.

بەڵام ئەم لەبـەر دەنگی گۆرانیـی خـۆی و هـی پرێمـزە نەوتیـەکە گـوێی لە تۆ نەبوو و ناچار ڕووتکردەوە ئەو:

ــ چاوەڕێکە تا تەواو دەبێت، مـن حـەز ناکـەم هیچ پیـاوێ دایکم بـە ڕووتیی ببینێت.

ــ نابێ ڕۆڵە نابێ، من وا دەچمە ژوورەوە.

بە لەقە کەوتیتە گیانی دەرگاکە و بەردەوامیش دەتوت:

ــ خـێـراکـە.. خـێـراکە، جلەکـانت لەبەرکـە و وەرە دەرەوە، ئەگینـا ئەو پیـاوە دێتە ژوورەوە و بە ڕووتیی دەتبینێ.

بێ سـوود بوو و کۆڵـت دا.. ئەو سـەیرێکی ئەمـلا و ئـەولای خـۆی کـرد و پێـی وتـی:

ـ من وا دەچمە ژوورەوە و ئەم چەکە لای تۆ بەجێدەهێڵم، ئەگەر هەر کەسێ هات و ویستی بێتە ژوورەوە، تۆ بە قۆنداغەکەی لە دەرگا بدە.

ـ بۆچی..؟!

ـ پەلەمە، ناتوانم وەڵامت بدەمەوە.

چەکەکەت بە دەستەوە گرت و لە کونەکەوە سەیرت دەکرد، واتدەزانی دایکت دەیکات بە قریشکە قریشک و ڕەنگە لە ترسا ببووریتەوەش، کاتێ لەپڕ پیاوێکی چوارشانە، کە هیچ لە پیاوی ئەم سەردەمە ناچێت و سیمایەکی تا بڵێیت سەیری هەیە، لە بەردەمی قوتدەبێتەوە، بەڵام وانەبوو و تەواو حەپەسایت.. هەر خۆی جلەکانی لە بەر داکەند و کەوتە شتنی.. ئەوەی سەیر بوو و سەرت لێ دەرنەدەکرد، ئەوە بوو پیاوەکە دەستی چەپی لە ئانیشک بەرەو خوار لە پلاستیک درووستکرابوو و دایکت بە سووکی وەکو جلەکانی بۆی داکەند.. ڕووت وەرگێڕا و کەوتیتەوە سەیرکردنی بەردە سپیەکان.. ئەوسا لە هەموو کاتێکی دیکە زیاتر وەکو قاز دەردەکەوتن و نەیاندەهێشت دیمەنی ڕاستەقینەی شتەکان ببینیت.. کاتێکیشت زانی دایکت جلەکانی لەبەرکردبوو و بە تەنیا و بە قژی تەڕەوە هاتە دەرێ.. سەرێکت بە ناو حەمامەکەدا گێڕا وبە سەرسوڕمانەوە پرسیت:

ـ ئەی ئەو پیاوە چی لێهات، کە لەگەڵ تۆ خۆی شت..؟!

ئەم قاقایەکی بەرزی لێ دا و وتی:

ـ کام پیاوە دانا شێت..؟!

سەیرێکی دەستەکانی خۆت کرد و چەکەکەت نەبینی.. بە حەپەساویەوە لەمت ڕوانی و پێت وت:

ـ ڕۆیشت..؟! ئەی بۆچی من نەمبینی..؟! ئیتر نایەتەوە..؟!

ئەم بەگاڵتە وتی:

ـ با، زوو زوو دێتەوە.

ئەگەرچی ڕێکنەکەوتەوە جارێکی دی دایکت لە کاتێکی ئاوادا خۆی بشوات و تۆش لە بەردەرگادا ببیتە پاسەوانی، بەڵام دەیان شەو لەناو ئەو ڕەشماڵەدا لەگەڵ ناڵەناڵی ئەم و دەنگی هەناسەکانی ئەودا خەبەرت بووەوە.. لە ماوەی

چەند ساڵێکدا بووی بە خاوەنی دوو خوشکی چاوشین و برایەکی گەنمڕەنگی جوان و ڕۆژانە دایکت بەسەر تۆیدا بەجێدەهێشتن.. هەر ئەمەش وای لێکردن ئەوەندەی هۆگری تۆ بن، ئەوەندە هی باوکیان نەبن.. ناهەقیشیان نییە، ئەوان ئێستاش نازانن، ئەو پیاوە سەیرە لە کوێ هات و چۆن پەیدابوو، ئاوا سەرو ناسنامەی بۆ ئەوان و بۆ تۆش کرد و بوو بە باوکی ئێجگارەکیتان.. دوور نەبوو ئەگەر لەناو ڕەشمالەکاندا بمابوونایەتەوە، ئەو نهێنییەت بۆ ئاشکرا بووایە و ئەوانیشت لەو سەرسامییە ئەبەدیە ڕزگار بکردایە، بەڵام تازە هەر دەبێت حەیران و سەراسیمە لێی بڕوانیت و بە خۆت بڵێیت: «ئەو باوکەی ئێمە بۆچی لە هیچ شوێنێ ئۆقرە ناگرێت..؟!».

هەولێر ٣ـ ٩ـ ١٩٨٦

## شیری MADAS

پێشکەشە بە هاوڕێی ڕۆحسووکم «لوئەی حەسەن».

هاوکات لەگەڵ وشکبوونی ناکاوی مەمکی گشت دایکانی ئەم وڵاتە، شیری «MADAS» کەوتە بازاڕەوە.. ئەمە ئەو نهێنییەیە، کە چل ساڵ زیاترە کەس بۆی ئاشکرا نەبووە.. لەوەش سەیرتر ئەوەیە، منداڵان بێجگە لەم شیرە، هیچ جۆرێکی دی ناخۆنەوە و لە هی دایکیان چاکتر پێیان دەکەوێت.. هەر بۆیە «MADAS» تاقە شیری قوتووە لە بازاڕدا بفرۆشرێت و لە ماوەیەکی کەمدا قڕی خستە هەموو ئەوانی دیکەوە.. ئەوانەی دووکان و ئەمارەکان ئێکسپایەر بوون و کارگەکانیان داخران.. «MADAS» پێویستیی بە پڕوپاگەندە و پیاهەڵدان نییە و لە هەر شتێکی دیکە زیاتر ڕەواجی هەیە.. تەنانەت لەسەر قوتووەکەشیدا هیچ ڕوونکردنەوەیەکی وەکو چۆن بەکاردێت.. چەند کەوچک بکرێتە چەند ئاوەوە.. لە کوێ هەڵبگیرێت و نازانم چی و چی نابینرێت.. ئەوەی هەیە و نییە وێنەی دوو منداڵی تا بڵێی جوان و ڕۆحسووکە بە قەدیەوە، کە بەدەم گاگۆڵکێوە پێدەکەنن.. ئەوانەی نەخوێندەوارن، یان ئەوانەی تاقەتی لەبەرکردنی ناویان نییە، شیری «دوو منداڵە جوانەکە»ی پێ دەڵێن.. کەسیش نازانێت ڕەگەزی ئەو دوو منداڵە چیین، هەندێکیان دەڵێن کوڕن و هەندێکیان دەڵێن کچ، بەڵام لە ڕاستییدا ئەمە تەنها مەزەندەی خۆیانە و هیچی دی.

* * * *

ئەمڕۆ حەفتەیەک بەسەر کودەتا سەربازیەکەدا تێدەپەڕێت و باری وڵات هێمنبووەتەوە.. بەڵام باری سایکۆلۆژیی «نەهلە باقر» هەر پەشێو و نائارامە..

دڵی کەوتۆتە ختووره و ترس دایگرتووە.. ئەم پێش کودەتاکەش هەر زوو زوو هەستی بە دڵەکوتەیەکی سەیر دەکرد و خەیاڵی ترسناک ترسناکی بۆ دەهات.. بەتایبەتی کاتێ لە بەرامبەر ئاوێنەی ژوورەکەیدا دەوەستا و سەرنجی لە خۆی دەدا.. لەشولاری بە تەواوی تێکچووە و چرچەکانی دەموچاوی بە چاکترین پسپۆڕی ماکیاجیش ناشاردرێنەوە.. وای لێ هاتووە ڕۆژانە بەشی دەرمان و ماکیاجەکانی دەستناکەوێت و هەمیشە بیر لە پەندی «سۆزانی پیربێت، دەبێت بە گەواد»«*» دەکاتەوە.. ئەگەرچی ئەم هەرگیز بەرگەی ئەوە ناگرێت و رەنگە لە داخا بە سک بدات.. ئاخر ڕازیبوون بەو پیشەیە بۆ ئەم مانای داننانە بەوەی، کە لێکەوتووە و چیتر جەستەی ئەم توانای ئەوەی نەماوە لەزەت بە جەستەکانی دی ببەخشێت.. زۆر جاریش بە خۆی وتووە: «ئەگەر تەمەن بۆ کەسانی ئاسایی کورتە، ئەوا بۆ سۆزانی کورتترە».. ئەم خۆیشی نازانێت بۆچی ئەوەندە بیر لە تەمەنی خۆی دەکاتەوە و بەردەوام کات ڕۆحی هەڵدەقرچێنێت.. هەر جارێکیش بەسەر ئەودا باز دەدەن و لەملا و لەولایەوە هی دیکە هەڵدەبژێرن، قرچە لە دڵیەوە دێت و قێز لە خۆی و لە ژیان و لە هەموو شتێکی دی دەکاتەوە.. هەست بە مردن دەکات و وا دەزانێت مەرگ تەنها ئەو کاتانە زەفەری پێ دەبات، کە پیاوان بەلاوەی دەنێن.. هەر ئەوساش سەری دەخاتە سەر ئەژنۆ رووتەکانی و بە نهێنیی دەگری.. ئەگەرچی حەز دەکات پڕ بە هەموو دەنگی فیزاح بکات و بۆ حاڵی خۆی بکەوێتە شین و واوەیلا، بەڵام ئەم لە هەموو کەسێ چاکتر دەزانێت، کە جۆری کارەکەی ڕێگرە لە بەردەم ئەو حاڵەتە و لە پلە و پایەی کەم دەکاتەوە، چ لای هاوکارەکانی و چ لای ئەو پیاوانەی بە مەبەستی کڕینی جەستەیان هاتوون.. بۆیە هەمیشە خۆی وا پیشاندەدات، کە دڵخۆشە و گاڵتەوگەپی سەیر سەیر لەگەڵ هاوکار و کڕیارەکانی دەکات.. ئەم بە ڕاستیی توانایەکی سەیری لە شاردنەوەی نهێنیەکانی ناو دڵیدا هەیە و زۆر زەحمەتە هیچ شارەزایەکی سایکۆلۆژیا و غەیبزانێکی لێهاتوو پەیان پێ بەرێت.. ئەمەش هەر پەیوەندیی بە ئیشەکەیەوە هەیە.. ناوی خۆی و باوک و باپیری و هەر شتێ، کە پەیوەندیی بە ژیانیەوە هەیە، گۆڕیویەتی.. ڕابردوویەکی دیکەی وەهمیی بۆ خۆی درووستکردووە و لە

حیکایەتخوانێکی زۆر شارەزا چاکتر سەربردەی ژیانی دەسکردی خۆی بۆ ئەم و ئەو دەگێڕێتەوە.. ئەوەندەی وتۆتەوە، خۆیشی لێی بووە بە ڕاست.. بەڵام هەر جارێ چاوی بە قوتووی شیری «MADAS» بکەوێت و لە وێنەی منداڵیی خۆی و خوشکەکەی بڕوانێت، کە بە سکێ لە دایک بوون و باوکە پۆلیسەکەی بە هەندێ پارە بە خاوەنی کارگەکەی فرۆشتووە، ڕووداوە ڕاستەقینەکان لە خەیاڵیدا تێکدەقژقژێن و تەواو سەغڵەتی دەکەن.. دەیان جار خۆزگەی بەو بردووە و حەزی کردووە وەکو ئەو هەر بە منداڵیی بمردایە و چاوی لەم ژیانە هیچوپووچە ئاوا بووایە.. ئەوەندە لە یەکتر دەچوون، کەس نەیدەتوانی جیایان بکاتەوە:

ــ بەڵام مردن توانی.

هەموو جارێ لە بەر خۆیەوە ئاوا دەڵێت و دڵی پڕ دەبێت.. هەر زوو فریای زمانی دەکەوێت و لە خەیاڵیدا دەریدەکات.. دەبێ وا بکات.. نابێت لای کەس بیدرکێنێت.. ئیشەکەی ئاوای لێ دەوێت.. ئەوان ئەوەندە حەرامزادە نین، ناپاکیی لە شیری خۆیان بکەن.. ئەمیش بێجگە لەوەی نانبڕاو دەبێت، لای هاوکارەکانیشی نرخی دادەبەزێت و لە پلە و پایەی کەم دەبێتەوە.. بەوە باشە بێجگە لە خاوەنی کارگەکە، کەسی دی ئەم نهێنیە نازانێت، چونکە جۆری کارەکەی ئاوای دەویست.. بەڵام زۆر جار وا هاتووە بەسەریدا خۆی ئاشکرا بکات و لەو دڵەڕاوکێ بێمانایە ڕزگاری بێت، کە هەمیشە پێوەی دەتلێتەوە و وا دەزانێت تاوانێکی زۆر گەورەی لەگەڵ هاووڵاتیانی وڵاتەکەیدا کردووە.. پیرۆزترین شتی ئەوانی پیسکردووە و سیمای زۆر پاکی ئەو وێنەیەی شێواندووە، کە ئەوان تا ئێستاش بە جوانترین شتی دەزانن و لە گیانی خۆیانیان خۆشتر دەوێت.. وەکو بت دەیپەرستن و وا دەزانن ئەو لە مردن ڕزگاری کردوون.. ئێستا چەند پەشیمانە، کە پێش کودەتاکە ئاوای نەکردووە.. تازە ئەگەر بشیەوێت، هەر ناکرێت.. ئیتر کەس گوێی لێ ناگرێت و بە شێت و خەڵەفاویشی دەزانن، ئەگەر قسەیەکی ئاوای لە دەم دەربچێت.. ئاخر سەرۆکی کودەتا تازەکە لە یەکەمین دووانی تەلەڤزیۆنییدا بە خەڵکی ڕاگەیاند، گوایە ئەو منداڵەی وێنەکەی لەسەر قوتووەکە دراوە و ئەوان

وایاندەزانی دووانە، هەر یەکێکە و خۆیەتی.. دەبێ وا بڵێت.. جۆری ئیشەکەی وای دەوێت.. تازە دەبێت «نەهلە باقر» باوەڕ بەوە بهێنێت، کە پیر بووە و ئەو جەستە داهێزراوەی توانای بەخشینی لەزەتی نەماوە.. سەردەم گۆڕاوە و دەبێت خۆی لەگەڵ رابێنێت.. ئەو سەرۆکە تازەیە سەرتاپای شتەکانی هەڵگێڕایەوە، تەنانەت ناوی شیری «MADAS مادەس»یش ئێستا بە پێچەوانەوە دەنووسرێت و دەخوێندرێتەوە.. خۆ ئەو خەڵکەش ئەوەندە حەرامزادە نین، لە شیری خۆیان هەڵگەڕێنەوە و ناپاکیی لەگەڵدا بکەن.
مووسڵ
١٢ـ ١٠ـ ١٩٨٦

* «الگحبە من تتوب تصیر گوادە» پەندێکی عەرەبیە، واتە «سۆزانی، کاتێ تۆبە دەکات، دەبێت بە گەواد». لێرەدا وشەی «تۆبە» بە ئاگاییەوە کراوەتە «پیر».

# ماچی قوتوو

پێشکەشە بە «بەدریە حەمەد خوار»ی دایکم

لەو رۆژەوە باوکم ئەو ژنە عەرەبەی هێناوە، هیچ قسەیەک لەم ماڵەی ئێمەدا نەکراوە.. جاران، تەنانەت دوای مردنی دایکیشم ئێمە لە گەرەک بەوە ناسرابووین، کە زۆر دەڵێین و دەنگمان بەرزە.. دراوسێکان هەمیشە گلەییان لێ دەکردین و جار جار دەهاتنە سەریشمان، چونکە تا درەنگی شەو نەدەنووستین و بە دەنگەدەنگ و قاقالێدان هەراسانمان دەکردن.. کەچی لەو رۆژەوە، تۆ بڵێی لەو ساتەوە، کە ئەو باوەژنەم دوو پێی خستە ئەم ماڵەی ئێمەوە، هەر هەمووومان لەپڕ بێ دەنگ بووین و ئیتر لەسەر ئەو بێدەنگییە راهاتین.. ئێوارەی بەهارێکی درەنگوەخت بوو.. من و «میدیا»ی خوشکم لە هەیوانەکە دانیشتبووین و چاوەڕێی «دڵپاک»ی خوشکمان دەکرد، کە لە مووبەقەکە ماسیی قوتووی بۆ لەناو تاوەکە گەرمدەکردینەوە، لەپڕ دەرگای حەوشە ترازا و باوکم و ژنێکی بالابەرزی قژکورت دەرکەوتن.. هاتن و بێدەنگ لەسەر کورسیەکانی تەنیشت ئێمەوە دانیشتن.. هەناسەی قووڵ قووڵیان هەڵدەکێشا و لێمان رادەمان.. کەسمان چاوەڕێمان نەدەکرد، ئەوان قسەمان بۆ بکەن، هەر وەک بڵێی خۆمان هەموو شتێک بزانین و پێویستمان بەوە نەبێ ئەوان پێمانی بڵێن.. تەنانەت «دڵپاک»ی خوشکم، کاتێ لە مووبەقەکە هاتە دەرێ و سەیری کردن، هیچ بەلایەوە سەیر نەبوو و لە بەردەمیان دانیشت.. پێڵاو و گۆرەویەکانی بۆ داکەندن و سووک سووک کەوتە شێلانی قاچەکانیان.. دوای تاوێ ئەوان هەستان و چوون بۆ ژوورەکەی خۆیان.. «دڵپاک» ماسیی

قوتووەکەی بۆ هێنایین و خواردمان، بەڵام نەیتوانی وەکو هەموو جارێکی دی بە گاڵتە، بۆئەوەی بمانخاتە پێکەنین، لەجیاتی «ماسیی قوتوو» بڵێ: «ماچی قوتوو».

بەیانی لە خەو هەستام و بە چاوی خەواڵووەوە رووم لە مووبەق کرد، باوەژنەکەم بەرچایی ئامادە دەکرد و منی بینی.. سەری نووساندم بە سنگی خۆیەوە و توند توند شانەکانی گوشیم، کەچی متەقی لە خۆی بڕیبوو و چاوەڕێش نەبوو من هیچی پێ بڵێم.. وەک بڵێی هەموو ژیانی لەم ماڵەدا بەسەر بردبێت، شوێنی یەکە بە یەکەی شتەکانی پێدەزانی و بۆ هیچ دانەدەما.. لە چاوترووکانێکدا سفرەکەی رازاندەوە و دەیزانی هەر یەکەمان حەز لە کام خواردنە دەکەین.

سەرەتا وامدەزانی ئەم بێدەنگیە تەنها حەفتەیەک دەخایەنێت و ئیتر زمانمان لە ئاستی یەکتردا دەکرێتەوە، بەڵام کاتێ لە حەفتیانەکە کەسوکاری باوەژنم لە «بەغدا»وە هاتن و بێدەنگ بێدەنگ لەسەر کورسیەکانی ناو باخەکە لێی دانیشتن، بۆم دەرکەوت شتێکی سەیر لەم ماڵەی ئێمەدا رووی داوە و من لێی تێناگەم.. ئیتر زانیم ئەو بێدەنگیە هەنگاو هەنگاو لەگەڵماندا رێدەکات و لێمان جیانابێتەوە.. چەند سەیر بوو..!! هەموویان لە ئێمە و لە یەکتر رادەمان و هیچیشیان نەدەوت.. منداڵەکان یارییان دەکرد و بەسەر درەختەکان هەڵدەگەڕان.. راوی یەکتریان دەنا و دەیان جار کەوتن.. شەڕیان دەکرد و قژی یەکتریان رادەکێشا.. دەموچاوی یەکتریان دەڕنیەوە و خوێنیان لێ دەچۆڕایەوە، بەڵام نەیاندەقیژاند و هیچ ئاخ و ئۆفێکیان لێوە نەدەهات.. جنێویان نەدەدا و لای دایک و باوکیان سکاڵایان نەدەکرد.. باوەژنم بە کراسێکی تەنکی سوورەوە لەناو چیمەنەکە وەکو منداڵێکی زۆر بەناز سەری خستبووە سەر رانی دایکی و پاڵکەوتبوو.. وا دیاربوو ئەو چەند رۆژە بیری یەکتریان کردبوو و بەو دیدەنیە ئاسوودە بووبوون، کەچی زمانیان هەڵنەدەهێنایەوە و وشەیەک چییە لە دەمیان دەرنەدەچوو.. هەر ئەوەندەش دەرگای حەوشەیان کردەوە و قاچیان بردە ئەودیو، تێکڕا، گەورە و بچووک دەستیان کرد بە قسە و ئاوەدانییان خستە ناو ئەو کۆڵانە چۆڵەوە.

رۆژێکیـان باوەژنم لە بەر بەلووعـە دەرشـایـەوە و رەنگی تەواو تێکچـووبوو.. دەسـتـەکانـی گرتـبـوو بـە سـەریـەوە و بەرەو ژوورەکـەی خـۆی دەچوو.. لەپڕ لە ناوەڕاسـتی حـەوشـە بە دەمدا کەوت و من و خـوشکەکانم بـە فریای کـەوتین.. هەڵمـانگرتەوە و بـردمـان بۆ ژوورەکـەی خـۆی.. لەسـەر تـەختـی نووسـتنەکـەی پاڵمـانخـست و بە لێـفـەکـە دامـانپـۆشی.. تایەکـی زۆر گـەرمی لێـهـاتبـوو و هەڵدەلەرزی، کـەچی نەمـانتـوانی لێی بپـرسین چیـیـەتی و چی بۆ بکـەین.. خەمناک خەمناک لە یەکترمان دەڕوانی و پیشمـان دەخواردەوە.. لە ژوورەکەی خۆشـم چەند هـەوڵم دا کەمێ بۆی بگریم، بەڵام نەمـتوانی و بێهوودە بـوو.. خۆم گۆڕی و چووم بۆ ئەو باخەی پشـت ماڵمان، هـەر بۆئەوەی بیر لە نەخۆشـیەکەی بکەمـەوە و هـەندێ فـرمـێـسکی بۆ بڕێژم.. دواتر زانیـم ئەو دووگیـانە و رۆژ بە رۆژ سکـی بەرزدەبووەوە.. ئەمـە دڵخـۆشـی کـردم، هـەر لەبـەر ئەوە نا، کـە من دەبووم بە خـاوەنی برایەک، یـان خـوشکێکی دیکە، بەڵکو بەو هیـوایەی دەنگی گریانی ئەو سـەرەتایەکی تر بێت بۆ دەسـتـپـێکردنەوەی ئێمـە بـە قسـەکردن.. کەچی رۆژێکیـان دوو منداڵی سـاوام لەناو دوو بێـشکەی هەیوانەکـەدا بینی و بێـدەنگ چاوە زیتـەکـانیـان دەگـێـڕا.. ئینجـا زانیم باوەژنم بـە بێـدەنگیی دوانەیەکی بووە و ئێمە نەمانزانیوە.. حەزم دەکرد شەوێ لە شـەوان بە دەنگی گریانیان بێداربـبمەوە، بەڵام مەحاڵ بوو.. سـەرەتا وامدەزانی کەڕ و لاڵن، بەڵام کـاتێ پێـیـان گـرت و چوونە کـۆڵان، وەکـو منداڵانی دی دەدوان و رێکوپێک یارییان دەکرد.. دەیان شەو دەمهێنان بۆ ژوورەکەم و یارییم لەگەڵدا دەکردن.. دواتر لەمـلا و لەولای خـۆمـەوە پاڵمـدەخـستن و دەسـتـەکـانم دەخـسـتـە ژێر سـەریانەوە، کەچی هیـچیـان نەدەوت و وردە وردە خـەو دەیبـردنەوە.. باوەژنم بەئەسپایی دەرگای ژوورەکەمی دەکردەوە و دەهات لەسـەر سـەرم دەوەسـتا.. بێـدەنگ و بێـچـرپـە چاوەکـانی دەبرییە چاومـەوە و نەشـیـدەتوانی هیـچ شـتێ بدرکـێنێت.. یـەک لە دوای یەک منداڵە خـەوتووەکـانی دەکـردە باوەشـیـەوە و دەیبردنەوە سەر جێگاکانی خۆیان.. دەهاتەوە و بە گیانێکی دایکانە لێفەکەی تا سـەر سنگم دەهـێنا.. بـەو پەنجـە باریکانـەی، کـە نینـۆکـە درێژەکـانـی بە سـوورێکی تۆخ تۆخ بۆیە کردبوون و لەژێر رۆشـنایی گڵۆپە پـەمەییـەکەی سـەر

سەرمان جوان جوان دەبریسکانەوە، قژە خاوەکەمی دادەهێنا و ناوچەوانی بۆ دەشێلام.. بەجێیدەهێشتم و دەنگی لێوە نەدەهات.. منیش نەمدەتوانی پێی بڵێم، کە هیچ حەز ناکەم بەتەنیا بەجێمبهێڵێت.. سێ ژەمە و لە کاتی خۆیدا خواردنی بۆ ئامادە دەکردین و هەر مابوو وەکو منداڵ بیکات بە دەممانەوە.. یەک لە دوای یەک دەیبردینە حەمامەکە و رووتیدەکردینەوە.. دەیشتین و وشکیدەکردینەوە.. لە باوەشی دەگرتین و تێر تێر ماچی دەکردین، کەچی دەنگی لێوەنەدەهات.. هەر دەتوت ئەو ژنە قسەخۆشە نییە، کە خەڵکی ئەمسەر و ئەوسەری گەڕەک دەناسێت و رۆژانە بە کوردی و بە عەرەبی لەگەڵیان دەدوێت.. گاڵتەی سەیر سەیریان لەگەڵدا دەکات و دەیانهێنێتە پێکەنین.. زۆر جار دەمەوێت لەوێ قسەی لەگەڵدا بکەم و لە نهێنیی ئەو بێدەنگیەی ماڵەوە تێبگەم، کەچی هەرچەند دەکەم ناتوانم.. خوشکەکانیشم لەملا و لەولایەوە وەستاون و هەژدە بە هەژدە لەگەڵ دراوسێکان قسە دەکەن، بەڵام هەرگیز نەمدیوە لەگەڵ باوەژنم، یان لەگەڵ یەکتردا شتێکیان وتبێت.. باوەژنم لەگەڵ باوکیشمدا نەدەدوا.. من دەیان جار لە پشت ئەو دەرگایە خۆم مەڵاسدەدا و گوێچکەکانم بۆ دەنگێک، چرپەیەک، نووزەیەک دەخستە بۆسەوە، کەچی دەتوت ئەو ژوورە ئەشکەوتێکی چۆڵی دوور لە ئاوەدانییە و هەرگیز کەس رێی تێنەکەوتووە.. زۆر جاریش لە بازاڕ و سەر شەقامە گشتیەکاندا هەنگاو هەنگاو دوایان دەکەوتم و دەمویست شتێکیان لێ ببیستم، بەڵام مەحاڵ بوو و کۆڵم دەدا.

رۆژێکیان لەو ژوورەی خۆم گوێم لە دەنگی هەلهەلە و چەپڵەرێزانێکی سەیر بوو.. لەگەڵیدا دەنگی کۆمەڵێ ژن و منداڵ و پیاوی عەرەبم بیست.. وامزانی لەناو حەوشەکەی ئێمەوەیە، بەڵام کاتێ دەرگاکەم کردەوە، بۆم دەرکەوت لە کۆڵانە.. دیاربوو باوەژن و باوکم و منداڵان و «میدیا»ی خوشکیشم وەکو من بەو دەنگە سەرسام بووبون و هاتبوونە راڕەوەکە.. ئەوەندەمان زانی دەرگای حەوشە ترازا و کوڕێکی بالابەرزی قۆز بە قاتێکی رەش و بۆینباغێکی هەنارییەوە دەرکەوت.. کۆمەڵێ ژن و پیاو و منداڵ بێدەنگ و بێچرپە لە دوایەوە دەڕۆیشتن و بەرەو لای ئێمەوە دەهاتن.. هەر هەموومان حەیران و سەراسیمە

لێیـان رادەماین و نەماندەتوانی دەم هەڵێنینەوە.. کوڕەکە گەیشتـە بەر دەرگای ژوورەکەی «دڵپاک»ی خـوشکم و بەسووکی کردیەوە.. بەبێ ئەوەی سـەیری ئێمە بکات، چووە ژوورەوە.. کـەمێکی پێچـوو هاتە دەرەوە و «دڵپاک»ی خـوشکم بە جلی بووکێنیـەوە قـۆڵی کردبوو بە قـۆڵیدا.. لە بەردەرگـای حـەوشـە هەلهەلە و چەپڵــە دەسـتـی پێکردەوە و بە زمــانی عــەرەبی گـۆرانیـیــان دەوت.. هـۆرنی ئۆتۆمۆبیلەکان دەگەیشتە ئەوسـەری گەڕەک و بۆ یەکتـریان دەسەندەوە.. ئێمە هـەمـوومان لـە یەکدی رادەمـاین و هیـچمان بۆ نەدەوتـرا.. چ نەهامەتییـەک بوو خوشکە گەورەکەمـان شووی کرد و ئێمـە نەمانزانیبوو.. چەند داخێکی گەورە بوو نەمـانتـوانی نە چـەپڵـەی بۆ لێ دەین و نە هـەلهـەلەیەکی بۆ بکێشـین.. دوای حەفتەیەکیش کە لەگەڵ مێردەکەی هاتەوە و یەکە بە یـەکەمانی مـاچکرد، هیچ نەیدەتوانی گلەییـمـان لـێ بکات.. ئێـمـەش نەمــاندەتوانی سـەرزەنشـتی ئەو بکەین، کـە ئاگاداری نەکردبووینەوە.. باوکم لە داخـا رۆژ بە رۆژ لاواز دەبوو و ئێمـە بەئاسـانی هـەسـتمـان پێی دەکرد.. ئەگـەرچی «دڵپـاک» و مێـردەکـەی زوو زوو دەسـتیـان دەکردە ملیـەوە و زۆر بەگەرمـی مـاچیـان دەکرد، بەڵام هـیچ شـتێ لە سـیـمـای خـەمناکی نەدەگۆڕا و زیاتر خـۆی دەخـواردەوە.. خـەمی «مـیـدیا»ی خـوشکیشـمی هاتە سـەر و ئەوەندەی دی لە پەلوپۆ کـەوت.. کـوڕێکی شەقاوەی گــەڕەکی ئـەوبەر شــەو بەدزیەوە چووبـووە ژوورەکــەی و دەست و قــاچـەکــانی بەسـتبـوو.. بەبێدەنگیی ئیشـی خـۆی لەگەڵدا کـردبوو و نەشـیـتوانیبـوو هـاوار بکات.. لە داخـا مـرد و درەنگ پێمـان زانـی.. ئیـتـر باوکم ئارامـی نەمـا و رەنگی مـردووی لێ نیشت.. باوەژنم وەکو منداڵ دەیکردە باوەشـیـەوە و بە بێدەنگیی و بە ئامـاژە دڵنەوایی دەدایەوە، بەڵام سـوودی نەبوو و بەردەوام چـاوی بە قـووڵدا دەچوو.

رۆژێکیـان چوار پیـاوی تێکسـمـڕاو دارەمەیتێکیـان خـسـتـبووە سـەر شـان و بێـدەنگ هـاتنـە حــەوشــەکــەوە.. دارەبازەکــەیان لە هەیـوانەکـە دانا و چـوونە ژوورەکـە.. تەرمـی باوکـمـیـان هـێنا و خـسـتـیـانە ناویەوە.. بـردیانە دەرەوە و باوەژنم خـەمنـاک و پەشێـو دوایان کـەوتبوو.. لـە کۆڵان کـردی بە شـین و واوەیلا و پڕ بـە هـەمـــوو دەنگی دەگــریا.. دوو ژنـی دراوســێــمــان ئەم دەسـت و ئەو

دەستیان گرت و بۆ ماڵەوەیان هێنایەوە.. پەنجەکانی خستبووە سەر ئەملا و ئەولای سەریەوە و بێدەنگ بێدەنگ بەرەو ژوورەکەی خۆی دەچوو.. چوار پیاوەکە تەرمەکەی باوکمیان لە دواوەی پیکابێک بارکرد و بردیان.. لە سەری کۆڵانەکە پێچیان کردەوە و نەمانزانی لە کام گۆڕستان ناشتیان.. ئێستا من و باوەژنم و منداڵەکان لە ماڵەکەدا ماوین و هەر یەکەمان ژووری خۆمان هەیە.. بەقەدەر هەموو دنیا یەکترمان خۆشدەوێت و رۆحمان بە سەریەکەوە دەردەچێت، بەڵام هەرگیز ناتوانین بەیەکەوە بدوێین.

هەولێر

کانوونی دووەمی ١٩٨٧

## لاکێ (*)

«ئەو کەڵەشێرەی جارێ کەڵەشێرێکی دیکە بیبەزێنێت، لە هەموو ژیانیدا هەر بە دۆڕاویی دەمێنێتەوە و تا ماوە دەبێت ملی بۆ کەچ بکات.. دوای چەند ساڵ و لە هەر شوێنێکی دی چاویان بە یەکتربکەوێتەوە، شەڕەکەیان بیردەکەوێتەوە و هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی تر لە نێوانیاندا ڕوونادات».

«لاکێ» دوای ئەوەی تووشی نەخـــۆشـــیی بیـــرچوونەوە بووبوو و بە ڕێککەوتێکی زۆر سەیر گەیشتبووە «بەغدا» و ناو مریشک و کەڵەشێرە مۆدێرنەکانی ماڵی «شاهین»ی فرۆکەوان، ئەم لۆژیکەی هەر بیرمابوو.. ئەم دەیان جار ئەمەی بۆ کەڵەشێر و مریشکەکانی گەڕەکی «سەیداوە»ی «هەولێر» و دواتر بۆ ئەوانەی لادێیـــەکی قـــەراغ شـــار باسکردبوو.. تەنانەت ئەوەندەی وتبووەوە، تەواو ناخۆش بووبوو.. جارێکیان کەڵەشێرێ بە کەمێ ترس و بە لەفزێکی زۆر شیرین پێی وت:

ــ کاکە لاکێ ئێمە هەموومان خۆشماندەوێیت و ڕێزت لێ دەگرین، بەڵام پێت ناخۆش نەبێت، تۆ بە هەق و ناهەق ئەم قسەیە دەڵێیتەوە.

ئەم تووڕەبوو و پۆپنەی سوورهەڵگەڕا.. هەر خێرا پەلاماری دا و بە دەنووک و چڕنووکە ئێجگار تیژەکانی تێیکەوت:

ــ خوێریی ناکەڵەشێر.. هەی هیچوپووچی مریشکانی، تۆ من فێری ئەقڵ دەکەیت..؟!

دوای ئەوەی گیـانی خـەڵتـانی خوێن کـرد و وازی لێ هێنا، بە «ڕازە»ی خۆشەویسترین مریشکی وت، کە پەڕە خوێناویەکانی لە کەلێنی پەنجەکانی قاچی و نێوان دەنووکی دەربهێنێ.. ئینجا بە فیزێکەوە خۆی هەڵدایە سەر

بەرمـیلەکـەی بەردەمـی مـاڵی «مـام هـەیواز» و دوای یەک دوو قـووقـاندن بە کەڵەشێرە خوێناویەکەی وت:

ــ کەڵەشێر بوویتایە و بە درۆت بخستمایەتەوە.. ئەگەر یەک تۆز جورئەتی کەڵەشێرت تیابێت، جارێکی تر بەسەر هیچ مریشکێکدا ناتسێی.

ئەم لە دوو حـاڵەتدا دەچووە سـەر ئەو بەرمـیلە و دەبووایە «ڕازە»ش بێت لە تەنیـشـتیـەوە هەڵنیـشـێت، ئەگـەر شـەڕی لەگـەڵ یەکێ بـووبووایە، یانیش پێشبـینیی ڕووداوێکی ناخـۆشـی بکردایە.. ئەو جارە هەر لەوێ لەگەڵ دەنگی قـووقـاندنی کـەڵەشـێـرێکی تازە بێـداربووەوە.. کـاتێ سـەیری کـرد و لێی وردبووەوە، نـاسـیـەوە و دڵی داچڵـەکی.. گـیـانی دەلەرزی و دەمـارەکـانی کرتەکرتیـان پێکەوتبوو.. خـۆی کردەوە بـە نووسـتـوو و درزێکی بچکۆلەی کردە چاویەوە.. لەو درزەوە دیقـەتـی لێ دەدا و وردە وردە ترسـەکـەی گـیـانی تاوی دەسـەند.. ئـەو لەمـسـەری کـۆڵانەکە، ڕێک لـە بەردەمی مـاڵی «مـام ڕەوەند»ـەوە دەهات و کـەڵەشێر لەسـەر کەڵەشـێری دەبەزاند.. بەسـەر ئەم مـریشـک و ئەو مـریشکدا دەتسی و پەیتا پەیتا نزیکدەکەوتەوە.. کـەڵەشـێرە بەزیوەکان ملی خۆیان شۆڕدەکرد و بەدەم ڕاکردنەوە پێیان دەوت:

ــ قوڕ بەسەرت بۆ کوێ دەچیت، مەگەر کاکە لاکێ خەبەری نەبێتەوە.

«ڕازە» بـەردەوام بـانـگی دەکـــرد و بـە کـــەمـێ مـــــەکــــر و بـە هـەندێ خۆتەسککردنەوە پێی دەوت:

ــ وی لاکێ، ئەوە تۆ ئاگات لەم کەڵەشێرە شەڕانیە نییە..؟! دە هەستە دەی چییت کرد بە خەو..؟! لاکێ..!! لاکێ..!! وی ڕەزاومرێ ئەوە چییتە..؟!

ئەم لە پێشـدا مـتـەقی لە خـۆی بڕیبـوو و وەڵامی نـەدەدایەوە.. دوایی کـە ئەو چەند جـارێ بە دەنووکی سـەرە زلـەکەی ڕاشـەقـاند، ئینـجا بـەحـاڵ دەنگێکی ناڕۆشەنی دەردەکرد، کە ئەو هیچی لێ حاڵیی نەدەبوو.. کەڵەشێرە شەڕانیەکە خۆی هەڵدایە سەر بەرمیلەکە و بەبێ ترس بەسەر «ڕازە»دا تسی.. ئەم خەریک بوو گڕی دەگرت و هیـچیشی بۆ نەدەکرا.. «ڕازە» خۆی تەکاند و بە شێوەیەکی زۆر سەیر وتی:

ــ وی تسی چەند قورسە، ڕیخۆڵەم لەگەڵی هاتە ژان..!!

ئەم هەستی کرد ئەو پێی خۆشە و ئەوەندەی دی لە ناخەوە تێکشکا.. ئاخر چاک لە بیری بوو، کاتێ ئەمیش بۆ یەکەمجار لە ژێر دەستی کەڵەشێرێکی تر هێنایە دەرێ و پیایدا تسی، هەمان قسەشی بەم وت.. بە هەمان شێوە و هەمان نەغمە.. ئەوسا هەستی بە کەڵەشێریەتیی خۆی کرد و جارێکی تریش پیایدا تسیەوە، بەڵام ئێستا لە پەلوپۆکەوتووە و جورئەت ناکات هەستێتەوە.. ئەگەرچی هەموو کەڵەشێرە دۆڕاوەکانی خوارەوە بە یەک دەنگ بانگی دەکەن:

ـ کاکە لاکێ، کاکە لاکێ، هەستە لە خەو.

ئەو لەسەر سەری وەستاوە و لە کەڵەشێریەتیی خۆیەتی پەلاماری نادات، هەرچەند ئەم پڕبەدڵ حەز دەکات وەکو مریشک بەسەریدا بتسێ.. ڕاستە ئەم بەزمە لەناو کەڵەشێردا باو نییە، بەڵام ئەمە چاکترین شتە بۆ کوشتنی ئەو غیرەیەی وا لەناخەوە تێکیدەشکێنێت.. پیشی دەخواردەوە و بە خۆی دەوت: «تازە مەحاڵە بتوانم لەزەت لە جەستەی هیچ مریشکێ ببینم.. من ناتوانم ئەو قسەیەی ڕازە بیر خۆم بەرمەوە».. کەچی جار جار جورئەتی دەنایە بەر خۆی و دەیوت: «هەستە ئەو لۆژیکە بە درۆ بخەرەوە و ڕووبەڕووی بەرەوە.. کێ دەڵێ وەکو ئەو ڕۆژەی مەیدانەکە دەمبەزێنێ..؟! من لە هەموو ژیانمدا هەر ئەو جارە بەزیوم، بەشکو فێڵێکیان لێ کردبم، هەستە ناکەڵەشێر..!!».. دەبووایە هەستێتەوە، چونکە دەستەکەی کەوتبووە ڕوو، ئەو نووستنە تاکەی..؟! کەڵەشێرە دۆڕاوەکان هەر هاوار هاواریان بوو:

ـ کاکە لاکێ، کاکە لاکێ، هەستە لە خەو.

لەو ئانوساتەدا دوو کوڕی هەرزەکار بە پەلەپرووزێ لەسەری کۆڵانەوە دەهاتن و دەیانوت:

ـ ئەمەتا، ئەمەتا هاتووە بۆ ئێرە..!! ئەمەتا وا لەسەر ئەو بەرمیلەیە..!!

گەیشتن و لە ملا و لەولاوە بۆی چوون.. گرتیان و باڵەکانیان تێکپەڕاند.. باوکیان بە چەقۆیەکەوە هات و لەناوەڕاستی کۆڵان سەری بڕی.. «لاکێ» هەر لە درزی چاویەوە سەیری دەکرد و لە چۆڕاوگەی خوێنی ملی ورددەبووەوە.. هەموو گیانی داهێزرا و شەو «پووره مەیاس»ی خاوەنی هەستی پێکرد.. هەر زوو زوو ئاخی هەڵدەکێشا و بە منداڵەکانی دەوت:

ــ دووعا بکەن ئەمشەو نەمرێت، بەیانی دەیبەم بۆ مەیدانەکە و دەیفرۆشم.
خـۆزگـە ئەو شــەوە ڕۆحی دەردەچوو و نـەدەگـەیشـتـە ئەو لادێیـە.. ڕاسـتـە تێکرای کــەڵەشـــێــرەکـــانی ئەوێی بـەزاند و بـۆی هـەبـوو بـەســـەر هـەمـــوو مریشـکـەکاندا بتسـێ، بەڵام تا بیری لە قسەکەی «ڕازە» نەکردایەتەوە و ئەوەی نەهێنایەتەوە بەرچاوی خـۆی، کـە کـەڵەشـێـرە شـەڕانیـەکە بـەسـەریدا تسی، ئارەزووی نەدەکـرد و زەوقی هەڵنـەدەستـا.. مـریشکەکـانیش دەبووایە خـۆیان بتەکێنن و بە مەکرێکەوە بڵێن:
ــ وی تسی چەند قورسە، ڕیخۆڵەم لەگەڵی هاتە ژان.
بۆئەوەی چاکـتـریش دیمەنی ئەو ڕۆژەی بێـتـەوە یاد، بەر لەوەی بـەسـەر هەر مـریشـکێکدا بتـسـێ، پەلامــاری کـەڵەشـێـرێکی دەدا و وەکـو کـەڵەشـێـرە سـەربڕاوەکـەی «سـەیداوە» خـوێنی لە ملی دەهـێنا.. دواییش مـاتەمـینیـەکی سـەیری بـۆ دەهات و تەواو تێکیـدەدا.. وای لێ هات هـەرچی مـریشـک هـەبوو لە بەرچاوی کەوت و بە بینینی جوان و ناشـیرین، تازەبارۆکە و سـەرەمـر و پیر، تـەواو ســـەغــڵـــەت دەبـوو.. پەلامــــاری دەدان و بە دەندووک و بـە چڕنـووک تێـیـاندەکـەوت.. خـووی دابـووە کەڵەشـێـرەکـان و وەکـو مـریشـک بەسـەریاندا دەتسی.. ئەوانیش دەبووایە خۆیان بتەکێنن و بە نازێکی مریشکانەوە بڵێن:
ــ وی تسی چەند قورسە، ڕیخۆڵەم لەگەڵی هاتە ژان.
لەمـــەوە ئەوەندەی دی حـــاڵەتـەکــە یەخــەی دەگــرت و بەســـەر دنیـــاوەی نەدەهـێـشت.. ئەوانـیـشی لـە بەرچاو کــەوت و پەلامــاری دانەوە.. ئـەوەی بۆی مـابووەوە دەنووک و چڕنووک بوو و هـەر لە ملیـشـیـانی دەگرت.. تەنـها شـێـوەی کـەڵەشـێـر بوو، ئەگـینا لـە ناخـەوە بـۆ دەعبـایەکی سـەیر گـۆڕابوو و خـۆیشـی سـەری لە مـاهیـەتی خۆی دەرنەدەکرد.. قەل و مـراوی و قـاز و تەنانەت سـەگە زۆر دڕەکـانـی ئەو لادێیـەش لێی دەترسـان و خــۆیان لە دەندووک و چڕنـووکـە ئێجگار تیژەکانی بەدوور دەگرت.. دەیان جار هەوڵی دا خۆی بکوژێت و سەری نەگرت.. بە چەپک گیای کەڵەشێرکوژەی دەخوارد و هەر نەدەمرد.. بە حەفتە هیچی نەدەخوارد و بەڵای نەدەگەیشتێ.. خۆی دەخستە ژێر تایەی عەرەبانە و هیـچی بەسـەرنـەدەهات.. ئەو لادێیـە گـازڕشـێن کـرا، ئەوەی ڕایکرد و ئەوەی

مـرد، بـەڵام ئەم هـەر مـا و نەمـرد.. «شـاهین»ی فـڕۆکـەوان لەو بەرزاییـەوە بە دووربین سـەیری دەکـرد و پێی سـەرسـام دەبوو.. بۆی دابەزی و بـە یارمـەتیی چەند سـەربازێ گرتی.. خسـتیـە ناو فـڕۆکە و حـەزی دەکرد وەکـو دیاریەکی جوان بۆ «ئیبداع»ی ژنی بەرێتەوە، کە ئارەزووی بەخێوکردنی جۆرە چاکەکانی کـەڵەشـێـری هـەیە و شـارەزاییـەکی زۆری لـەو ژیانە سـەیر و سـەمـەرەیان پەیداکردووە.

ئێـسـتـا «لاکێ» تووشی نەخـۆشـیی لەبیـرچوونەوە بووە و هیـچ شـتـێکی ئەوسای بیرنەماوە، بێجگە لەو لۆژیکە نەفرەتیـە و هـەمیشـە پێوەی دەتلێتەوە.. خۆیشـی نازانێ ئەو قسـەیـە چییە و لە کێ فێری بووە، کە بە وتنەوەی لەزەت و ناخـۆشـیی بەجـارێ لێ دەبینێت: «وی تسی چەند قـورسـە، ڕیخـۆڵەی لەگـەڵ هێنامـە ژان».. ڕۆژ نییـە مـریشکێ، یان کـەڵەشـێـرێ، لەژێر چڕنووکـەکانـیدا نەمرێت، چونکە لە زمانەکەی تێناگەن و ناتوانن، کاتێ بەسـەریاندا دەتسێ، بەدەم خۆتەکاندنەوە بۆی بڵێن.. «ئیبداع»یش زوو زوو بەدیاریەوە دەوەستێت و لێی وردەبێتەوە.. جار جار لە بەر خۆیەوە دەڵێت:

ـ وی کەڵەشێرێکی چەند سەیرە، ئەوە یەکەمجارە شتی وا ببینم..!!

پێشتریش هەمیشە بیری لە مێردەکەی دەکردەوە و دەیوت:

ـ وی پیاوێکی چەند سەیرە، ئەوە یەکەمجارە شتی وا ببینم..!!«**»

بەغداد ١٠ـ ٧ـ ١٩٨٧

* لاکێ: زاراوەیەک بوو لە حـەفـتـاکـان ژنانی هـەولێـر دایانتـاشـی بوو و بەو پیـاوانەیـان دەوت، کـە هـەڵسـوکـەوتی سـەیریان دەکرد. تـا ئێسـتـاش خـەڵک بۆ کەسانی گێل و نەفام بەکاریدەهێنن.

** لە ژمارە ٢٩ی گۆڤاری رابوونیشدا بڵاوکراوەتەوە.

## مردن لەسەر شێوازی شیعر

پێشکەشە بە «عەزیز حەسەن مەولان»ی هاوڕێی سەرتاپای تەمەنم

ئەگەر دەنگم خۆشبووایە و بمتوانیایە گۆرانی بڵێم، کە پێم وایە باڵاترین هونەرە و چاکترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە قووڵاییەکانی ناخم، هەرگیز پەنام بۆ نیگارکێشان نەدەبرد.. ئەگەر لە نیگارکێشان سەرکەوتوو بوومایە، بۆچی بیرم لە وەرزش دەکردەوە.. ئەگەر لە وەرزش ئاوا نائومێد نەدەبووم، مەحاڵ بوو بە لای نووسیندا بچوومایە، کە هەموو شکستەکانم تێدا کۆکردەوە و ئەنجام زانیم چەند سەختە بەم وشە سواوانە باس لەو ژیانە سەیر و سەمەرەیەی خۆم بکەم.

ئێستا من ژنێکی دۆڕاوم، بەڵگەش ئەوەیە شووم کردووە و دوای چەند مانگێکی دی دەبم بە دایک.. من چەند لاواز بووم، خۆ بڕیارم دابوو هەرگیز نەهێڵم پیاو دەستم بەسەردا بگرێت، کەچی سووک و ئاسان پاشگەز بوومەوە و خۆم بە دەستەوە دا.. ئێستا ئەم حاڵەتی قێزکردنەوە و هێڵنجدانەی بە هۆی ئەو سکەمەوە تووشم بووە، لە هەموو کاتێکی دیکە چاکتر دەتوانن ڕابردووە پڕ لە شکست و نائومێدیەکانم بیربخەنەوە و بیرۆکە ئاڵۆز و بێتامەکان وەکو کونەپەپوو ناو کەلاوەی سەرم بکەن بە هێلانە.. ئیتر بیر لە شتی سەیر و سەمەرە و هیچ و پووچ دەکەمەوە و ترس و گومان بەسەر دنیاوەم ناهێڵن.. هەموو ئەوانەش بخەرە لاوە، دەبێت زۆر ئاگام لە زمانم بێت و وریای خۆم بم ئەو نهێنیانە نەدرکێنم، کە لە «گۆران»ی مێردمم شاردوونەتەوە، چونکە من کاتێ ئەو حاڵەتەم بۆ دێت، وڕێنە دەکەم.. بەبێ ئەوەی ئاگام لێ بێت و بە خۆم

بزانم، باسی هەموو شتێکی ناو دڵم دەکەم.. «ئاشتی» و «ڕازاو»ی هاوژوورم، هەموو جارێ بۆیان باس دەکردم، کە لە ڕێگەی وڕێنەوە نهێنییەکانی ناخی خۆمم درکاندووە.. من هەرچۆنێ بووایە قەناعەتم بەوان دەکرد، کە ئەو شتانەی وتوومن، لە ژیانمدا بیرم لێیان نەکردۆتەوە، بەڵام «گۆران» هی ئەوە نییە فێڵی لێ بکرێت.. ئەم بە وشەیەکی سەر زمانم، ڕستەیەکی ناخم دەخوێنێتەوە، بە ڕستەیەک لە بنجوبنەوانی مەسەلەیەکی ئاڵۆزی ناوەوەی ناوەوەی دڵم دەگات.. بۆ نەگبەتییش ئەم ژوورەی ئێستام زۆر لەوەی ئەوسام دەچێت، کە لە گەڕەکی «قادسیە»ی شاری «مووسڵ» بەکرێم گرتبوو.. ئەمە ئەوەندەی دیکە ڕووداوەکانم بە بیردەهێنێتەوە.. تۆ سەیرکە تەنانەت ئەمشەویش هەر لەو شەوە دەچێت، کە دایکمی تێدا مرد.. دەڵێم مرد، ناڵێم کوشتم، چونکە بەڕاستی تا ئێستاش لام ڕوون نییە، ئاخۆ من کوشتم یان خۆی کتوپڕ گیانی دەرچوو.. ئەوساش ئاوا هەورەکان لە شێوەی هێلکەشەیتانۆکەی زل زل بەری ئاسمانیان گرتبوو و سیمایەکی ترسناکیان بەم دەوروبەرە دابوو.. وەکو سیمای ئەو ترسانەی لە خەوندا هەستیان پێ دەکەم و دوای بەئاگاهاتنەوەش کاری خۆیان دەکەن.. دەمخەنە سەر کەڵکەڵەی بیری واوە، کە دوای هێمنبوونەوە دەزانم چەند هیچوپووچ بوون و هەمیشە پێیان تەریقدەبمەوە.

من کاتێ منداڵ بووم و لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی دەمخوێند، هەر جارێ بە ڕۆژ بیرم لەوە بکردایەتەوە، کە قوتابخانە لە تەڵەی مشک دەچێت، ئەوا شەو مامۆستاکانمم لە خەوندا دەبینی.. پشتیان دەنووساندم بە تەختەڕەشەکەوە.. دووانیان بەزۆر دەمیان دەکردمەوە و یەکێکیان کلکی مشکێکی زیندووی دەخستە دەممەوە.. مشکە ترساو و زارەترەکەکە خۆی دەخزاندە ناو بۆڕیی هەواکەمەوە و لەوێ هەڵدەلەرزی.. ئیتر هەناسەم تەنگدەبوو.. لەوەدا بوو بخنکێم، خەبەرم دەبووەوە.. ئانوسات دەرشامەوە و تا تینم تیا بوو دەمزریکاند.. لەگەڵ زریکەی من دایکیشم خەبەری دەبووەوە:

ـ دایکە دیسان مشک چۆتە قوڕگمەوە.

ـ سەد جارم پێ وتووی ئەوەندە بیر لەو شتە هیچوپووچە مەکەرەوە.. نازانم

تۆ کەی بە قسەی من دەکەیت.. نازانم..!!

ئەمەی دەوت و دۆشەگ و سەرین و لێفەکەمی فڕێدەدایە هەیوانەکەوە و هی دیکەی بۆ دادەخستم:

ــ دایکە دەترسم، دەستت بکەرە ملمەوە.

ــ خوام لەو خوایەیە جارێکی تر بە لای ئەو قسە و باسانەدا دەچیتەوە، بەبێ سێ و دوو فڕێتدەدەمە دەرەوە و دەبێت تا بەیانی لەو حەوشە تاریکە هەڵبلەرزیت.

من هەر ئەوە نەبوو دوای خەونەکان دەترسام، دەترسام و لە باوەشی دایکمدا خۆم گرمۆڵە دەکرد، خۆم گرمۆڵە دەکرد و هەڵدەلەرزییم، بەڵکو قێزیشم دەبووەوە و دڵم تێکهەڵدەهات.. بەدەستم بووایە نینۆکەکانم لە قورگم گیربکردنایە و لە بێخەوە هەڵمتەکاندبووایە.. لەو کاتانەدا هیچ جیاوازییەکم لە نێوان تەڵەی مشک و قورگی خۆمدا نەدەبینی.. ئێیستاش من نازانم کەی بۆ یەکەمجار بیرم لەو پرسیارە هیچوپووچە کردەوە.. ئایا لە خەوندا دیم و دوای ئەوە بیرم لێی کردەوە..؟! یان بیرم لێی کردەوە و خەونم پێوەی دی..؟! ئیتر خەون لەسەر خەون دەمدی و دەمدی.. دەمدی و لەلام تازە دەبووەوە..؟! هەر ئەوەندە دەزانم کاتێ لە دایکمم دەپرسی:

ــ بۆچی قوتابخانە لە تەڵەی مشک دەچێت..؟!

ئیتر ئەم ڕەنگی هەڵدەبزڕکا و ترس دایدەگرت.. هەستم بە پەشۆکاوی و دەم و لێو لەرزینەکەی دەکرد.. سەرەتا بە خۆشی و بە نەرم و نیانیی ئامۆژگاریی دەکردم، کە نابێت ئەو قسانە بکەم، بەڵام کە من هەر وازم نەدەهێنا، ئیتر ئەمیش تووڕە دەبوو.. جارێکیان لە بەرچاوی میوانەکانمان لێیم پرسی.. بینیم ئەوانیش وەکو دایکم شڵەژان و بەگومانەوە لێیان ڕوانیم.. هەر خێراش هەستان و ڕۆیشتن.. کاتێ ڕۆیشتن، دایکم تاکێ پێلاوی بۆ هەڵگرتم و کەوتە وێزەم:

ــ بەخوا جوانە..!! من قوتابییەکانم هەر یەکەی ئەوەندەی خۆمن، ناوێرن بێحورمەتیی بە خۆم و بە قوتابخانە بکەن.. تۆ دەتەوێ بەم قسە ناشیرینانە سەرودڵم بگریت..؟! دەسا خوام لەو خوایەیە جارێکی تر ئەمەت لەدەم

دەردەچێت، دەبێت هەموو گیانت لەتوکوت بکەم.

بەڵام کە هەر وازت نەهێنا و سوور بوویت لەسەر پرسیارەکەت، ئیتر بە هەموو هێز و توانایەکیەوە لێی دەدایت.. ئینجا تەواو بۆت دەرکەوت چ نهێنیەکی سەیر و سەمەرە، تۆ بڵێ چ گرفت و گۆبەندێک لەو پرسیارەدا هەیە و ئەوەندەی دیکە ئارام و ئۆقرەی لێ بڕیت.. ئینجا زانیت تۆ خووت داوەتە چ مەسەلەیەکی ترسناکەوە، بەڵام نەشتدەتوانی دەستی لێ هەڵگریت.. هەندێک جار تەواو بەزەییت پیایدا دەهاتەوە، کاتێ دەگریا و لێت دەپاڕایەوە.. لێت دەپاڕایەوە و کز و خەمناک پێی دەوتی:

ــ بەسە واز بێنە.. با بەس بە ڕۆژ لێت بدەم و بە شەویش کاتێ دەنوویت، بە دیارتەوە دابنیشم و بۆت بگریم.. بەس زووخاو بکە بە قوڕگمدا.. هەر ڕۆژێکە لە داخی تۆ دەمرم.

مرد.. بەڵێ، مرد.. شەوە تاریکەکە مرد، بەڵام لە داخی تۆ نەبوو، بەڵکو لە داخی ئەو پرسیارە بوو.. ئەو پرسیارەی ئێوەی کرد بە دوژمنی یەکتر.. ئەو پرسیارەی دڵی ئەوی لە ئاستتدا کرد بە بەردی شاخ و ئەنجام «یوسف»ی دارتاشی کرد بە باوەپیارەت.. خەتای خۆشتی تیا بوو، دەبووایە هەر لە سەرەتاوە، کاتێ دەتدین بە تەنیشت یەکدیەوە نووستوون و دەستیان لە ملی یەکتر کردووە، بێ دەنگ نەبوویتایە.. جا کوا بێ دەنگ بووم..؟! ئەی ئەوە نەبوو، هەر جارێ خەبەرم دەبووەوە و دەمبینین وا لەیەکتر ئاڵاون، تا تینم تێدا بوو قژی دایکمم ڕادەکێشا و بە ئاگام دەهێنایەوە:

ــ ئەم پیاوە کێیە لە تەنیشت تۆوە نووستووە..؟!

ــ دەبنوو دەی.. پیاوی چی و حاڵی چی.؟!

ــ ئا ئەمەتا سەری خستۆتە سەر سەرینەکەی تۆوە.

ــ بە خوا جوانە..!! هەر ئەمەمان کەم بوو..!!

ــ دەزانم یوسفی دارتاشە، ئەوەی تەڵەمشکەکان درووست دەکات.. کورسی و تەختەڕەشەکانی قوتابخانەش هەر ئەم درووستی کردوون.

ــ جارێکی تر ئاوا لە خەودا قژم ڕابکێشیت، هەر خۆم دەزانم چیت لێ دەکەم..!!

ــ ئەی تۆ بۆچی لەگەڵ یوسفی دارتاش دەنوویت..؟!

ــ خۆزگە دەمزانی ئەو یوسفی دارتاشە کێیە هەموو شەوێ دێتە خەونی تۆوە..!!

وایدەزانی ئەوەندە گەمژە و کەمزانم، باوەڕی پێ دەکەم.. نەیدەزانی من لەوسەر هاتوومەتەوە و ئاگام لە هەموو کەین و بەینێکیانە.. بە هەردوو چاوی خۆم دەمدی وا شۆرتێکی ڕەشی لە پێدایە و لە سەر ئەو تەخت و دۆشەگە سپیە لێی نووستووە، کەچی دەیویست بەوە چاوبەستم بکات، گوایە خەونم دیوە.. بەڵام داخی ئەوەم ناچێت، کاتێ دەیوت: «نازانم ئەو یوسفی دارتاشە کێیە هەموو شەوێ دیێتە خەونی تۆوە»، پێم نەدەوت: «نایەتە خەونی منەوە، بەڵکو دێتە سەر جێگاکەی تۆوە».. دەبووایە پێی بڵێم: «تۆ دەیهێنیت و تا بەیانی پشت لە من و ڕوو لەو دەکەیت».. من ئەوسا منداڵ بووم و ئەقڵم بەو قسانەدا نەدەشکا.. ئەمیش زۆرزان بوو، شەوان دوای ئەوەی من دەنووستم، دەیهێنا و بەیانیانیش پێش ئەوەی خەبەرم بێتەوە، بەڕێی دەکرد.. بەڵێ، زۆرزان بوو، نەک هەر لە تۆ، بەڵکو لە هەموو خەڵکی گەڕەکیشی دەشاردەوە.. بەڵام بەخوا چاک ڕیسوام کرد.. هەموو شارم لێی تێگەیاند.. جا خراپتر، لەمەوە تەواو شووڵی لێ هەڵکێشا و بەبێ ئەوەی شەرمی پێ بێت و حیساب بۆ تۆ، یان بۆ کەسێکی تر بکات، بەئێجگاری هێنای بۆ ماڵەکە و کردی بە خاوەنی خۆی و هی تۆ و هی هەموو شتێ.. ئەڵبەتە تۆ نەتدەزانی ئەنجامەکەی ئاوا دەکەوێتەوە، ئەگینا چۆن لای ئەم و ئەو باست دەکرد.. یەکەمجاریش لای «ست پەیمان» درکاندت.. ئەو جارەی، کە وانەی وەرزشتان هەبوو.. دەبووایە هەر دوو دوو بەیەکەوە پێشبڕکێ بکەن.. بۆ نەگبەتییش تۆ کەوتیتە بەرامبەر «ڕۆشنا»ی کچی «یوسف»ی دارتاش.. بێشەرمانە بە «ست پەیمان»ت وت:

ــ من لەگەڵ ئەم شتە پیسە ڕاناکەم.

ــ ئای..!! ئاشنا چۆن دەبێت وا بڵێیت، ڕۆشنا خوشکی خۆتە.

قاچت بە توندی و زۆر بە تووڕەییەوە کێشا بە زەویدا و وتت:

ــ خوشکی من نییە.. ئەوە کچی یوسفی دارتاشە.. باوکی هەموو شەوێ

لەگەڵ دایکم دەنووێت.

«ست پەیمان» لە شوێنی خۆیەوە حەپەسا و کچان تێکڕا دایانە قاقای پێکەنین.. ئەم پەیوەندییە لەگەڵ دایکتدا زۆر خۆش بوو، ئێواران بەیەکەوە لە باخەکەی ئیێوەدا دادەنیشتن و چایان دەخواردەوە، بۆیە ویستی پەردەپۆشی بکات:

ــ منداڵینە ئاشنا خاڵێکی هەیە ناوی یوسفە، ئەویش وەکو باوکی ڕۆشنا دارتاشە و شەوان لایان دەنووێت.

ــ من هەر یەک خاڵم هەیە ئەویش ناوی شوانە.. خۆ درۆ ناکەم وەی..!! هەموو شەوێ، کە خەبەرم دەبێتەوە، باوکی ڕۆشنا پیس بە تەنیشت دایکمەوە دەبینم.

ئیتر لەمەوە بڵاوبووەوە.. هەر دوو دوو و سێ سێ بە یەکدەگەیشتن، ئەو باسەیان دەکردەوە:

«کەرخی کوورەچی» دەیوت:

ــ ئەوەی ئێوە ئەمڕۆ لە دەمی کچەکەیتان بیستووە، من دە ساڵ زیاترە دەیزانم.

«مستەفا کارەباچی» دەیوت:

ــ وایدەزانی گاو گوێرەکەین و نازانین چی دەکات و چی ناکات.

«جەلال هەڵپڕووکاو»ی شاعیر دەیوت:

ــ ئەوەندە بەسە بەئاسانی لە هەموو شتێ بگەیت، کە ناوی کچەکانیان یەک کێش و سەروایان هەیە.. من دڵنیام هەردووکیان یوسف ناوی ناون.

«کەمال هەڵڕووشاو»ی چیرۆکنووسی براشی دەیوت:

ــ جەلالی برام چاکی بۆ چوو، بەڵام دەبووایە سەرنجی ئەوەش بدات، کە نەک هەر ناوەکانیان، بەڵکو خۆشیان کتومت لەیەکتر دەچن.

«نیهاد»ی وایەرمانیش دەیوت:

ــ جا تووخوا دڵی چییمان بەو کچانەمان خۆش بێت، کە مامۆستایەکی ئاوا پەروەردەیان بکات..!!

مامۆستا «هیمداد»ی کۆمەڵناسی پێی دەوتن:

ــ وابزانم پێـویست ناكـات شـانازیی بـەوەوە بكەن، گـوایە هـەر لە زووەوە زانیـوتانـە، چونكە منداڵیش دەیزانی پیـاوێكی بێگانـە بە خـۆڕایی هامـشـۆی ماڵی بێوەژنێكی ئاوا تەڕ و ئاودار ناكات.

كـەس نـەمـا لە گـەڕەك زلوونگەی خـۆی لـەسـەر نەدات و شـتـێكی لـەسـەر نەڵێت.. سەیرەكە لەوەدا بوو، هەر هەموویان دەیانپرسی:

ــ باشە ئەم مامۆستا و ئەو دارتاش، چی بەیەكەوەی كۆكردوونەتەوە..؟!

ئەمە ئەو پرسیارە بـوو، كە هـەر هـەموویـان وەڵامەكەیان دەزانـی، بەڵام كەس زاتی نەدەكرد بیدركێنێت.. ئاخـر ناهـەقیـشیـان نەبوو.. ئەوان تەواو لەوە دڵنیا بوون، وەڵامـدانـەوەی ئەو پرسـیـارە بەڵاهێنـەرە و مـاڵ وێراندەكـات، جـا چۆن دەیانـوێرا خـۆیـانی لە قـەرە بـدەن.. ڕێك وەكـو نـارنجـۆك وابوو، هەریـەكـەی دەیویست لە ژێر قاچی ئەوی دیكەدا بیتـەقێنێتـەوە، ئەگینا چی تێدایە ژنێكی مـامـۆسـتـا شـوو بە پیـاوێكی دارتاش بكات..؟! ئـەمـە كـەی جـێگای سەرسووڕمانە..!!

پیـاوە لادێیـیـەكەی ساڵی پێشـوو ڕێی كـەوتبـووە ئەم ناوەوە و تاكە خـانووی پەڕپووتی ئەو گەڕەكەی بـە كرێ دەستكەوتبوو، بە شـەرمێكی تێكەڵ بە ترسـەوە سەری هێنابووە پێشـێ و وتبووی:

ــ گەلێكم بەلاوە عەنتیكەیە، ئێوە نازانن وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنـەوە.. خۆ مـوعـێن گـەلێ ئاسـانیـشـە.. ژنە مـامـۆسـتـایە، یەعنی لـە مـەتكەبە، پیـاوەش دارتاشـە و كورسـی و مـورسیی مـەتكەبەكەی درووسـتكردووە.. دەها ئاو بێنە و دەستت بشۆ.

هەرهـەموویان وتووبیان:

ــ ئەمەیان ڕێی تێدەچێت.

ــ لەوە دەچێت ئەم مامە لادێییە زۆر شت بزانێت.

مـامـەی لادێیـی لەمـەوپێش هەرگیـز ئـاوا بەم شـێـوەیە گـوێی لێ نـەگیـرابوو، ئەوە یەكـەمـجـار بوو وا هـەست بكات وەكـو یەكێ لە دانیـشـتـوانی گـەڕەكی خانەداننشینی «ڕووناكی» حیسـابی بۆ دەكرێت، بۆیە لە خۆشیا دەیویست چی زووترە خـۆی بگەیێنێتە مـاڵەوە و بۆ ژن و چوار كـچەكـەی بگێڕێتـەوە.. گـەیشتـە

بەر دەرگـا و نەگـەیشت، گـوللەیەکی وێڵ بەر کلێنجـەی کـەوت و لە خـوێندا گەوزاندی.. ئەنجام قـاچێکی لە کارکەوت و کەوتە سـواڵکردن.. ڕۆژانە بێجگە لە دەرگاکەی ئێوە، لە یەکە بە یەکەی دەرگاکانی دیکەی دەدا و دەپاڕایەوە:

ــ خـوا زمـانتـان لە بەڵای وەڵامی پرسـیـاری بەدفـەڕ و پیس بە دوورخـات، پەنجا فلسم بدەنێ.

ڕۆژێکیـان «برزۆ سـوور»ی «نازدار خـان»، کـە بە قـسـەخـۆشی گـەڕەک ناسراوە، پێی وت:

ــ خاڵە گیان هەرچی سواڵکەر هەن دەڵێن: خوا لە قەزا و بەڵای دونیا، یان بەڵای ناگـەهانتـان بە دوورخـات.. تۆ بە تەنهـا ئەمـە دەڵێی.. بگرە ئەوە نەک پەنجا فلس، بەڵکو دیناری، بەس پێم بڵێ مانای ئەم قسەیەی تۆ چییە..؟!

ــ کـوڕی خـۆم ڕۆح شیـرینە.. ژنێک و چوار کچی عازەبیش دوای من کێ بەخێویان بکات..؟!

هەر هەموویان خۆیان گێل دەکرد و دەیانوت:

ــ پرسیارێکی ماقووڵ و وەڵامێکی سەیر..!!

«وەستا عوزێر» بە دەنگە بڵحەکەیەوە وتی:

ــ ئەم خۆی بەبێ هیچ شتێ نیوەئەقڵ بوو، ئینجا گوللەشی بەرکەوت.

کابرای سواڵکەر پێی وت:

ــ دەبێت شـوکـری خـوا بکـەم، کـە نیـوەئەقڵ بووم، ئەگـەر ئەقـڵـی تەواوم هەبووایە و وەڵامـەکـەم بە درووسـتی بدابووایەتەوە، ئەوا گـولله تەوقی سـەرم، یان سـەر گۆی دڵمی پێکابوو.. ئێستـا دەمێک بوو تۆ بە خاکەنازەکەی شـەڕی گەڕەکی پێ دەکەیت، لە گۆڕت نابووم.

ــ چاوتان لێیەتی..؟! خەڵەفاوە یان نا..؟!

ــ هەر پیس خەڵەفاوە.. دەڵێی ڕۆنی گای دزراوی خواردووە.

خۆشترین شتی ئەو پیاوە سـواڵکەرە ئەوە بوو، کاتێ دەگەیشتە بەر دەرگای مـاڵی ئێـوە، خـۆی لـە سـەر جـووتە دارشـەقـەکـەی ڕاگـیـر دەکـرد و قـاچە لەکارکەوتووەکەی بەحاڵ هەڵدەبڕی، ئیتر هەر خـۆی دەیزانی ئەمە چ جنێـوێک بوو بۆی دەناردن.. بەڵام ئێـوە لـەوەتان تێـپـەڕ کـردبوو سڵ لە جنێـو بکەنەوە..

جنێیو..؟!.....

بزانە چەند چاوم قـایمە.. ئەو هەمـوو دەرد و بەڵایەم بیـرچووەوە، کـە لە ئەنجـامی ئەو پرسـیـارە شـوومـەوە بەسـەرم هاتن، ئەوا جـارێکی تریش سـەرلەنوێ، وەک نە بـام دیبـێت و نە باران، دەسـتم پێکردەوە.. ئەوەیە دەڵێ: «بێعاریان خستە کەنوو، بە قنگ بنێشتی دەجوو».. ئاخۆ ئەمجارە سەری کێ بخـۆم..؟! دڵنیـام ئەمـجـارە سـەری خـۆمی لەسـەر دادەنیـێم.. ئـا.. ئا.. هەر کەمـێکی ترە و.... بڵـێم هەر کـەمێکی ترە و چییم بەسـەردێت..؟! بیێگومـان دەمـرم، بەڵام چۆن و بەچی..؟! ئەوەیان نـازانم.. پێویسـتیش ناکات بیـری لێ بکەمەوە، چونکە مەحاڵە پەی بەو نهێنیە بەرم.. وەکو چیرۆکەکانی «مۆپاسان» بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو کۆتاییم پێ دێت.. ئەمە تاکە شتـە، کە بتوانێت کەمێ لەو ترسـەی گیانم لە ئاستی مردن کەم بکاتەوە.. مـن وەکو نەمـهێشت ژیانم لە هی کەس بچیێت، با مردنیشم جیا بێت.. تاکە شتێ، کە دەستم پێی نەگـەیشت و نەمـتـوانی بیگۆڕم، سـەرەتام بـوو، وەکـو هـەر کـەسـێکی تـر بە ئاسـایی لە دایک بووم.. بەوە باشـە هەمیشـە بەوە دڵنەوایی خۆمم داوەتەوە و وتوومـە: «سـەرەتـام ئەوانە لێی بەرپرسـیـارن، کـە گـیـانی سـواویان بە بەردا کـردووم، بـەڵام کـۆتاییـم بێـجگە لە خـۆم هـیچ کـەسـێکی دی هەقی بەسـەردا نییـە».. دەسـا من لەوەتەی هەم ڕقم لە شتی سـواوە.. هەمـیشـە حـەزم کردووە شـێوە و ڕووخسـارم، جووڵە و هەڵسوکەوتەکانم، لە کەسانی دیکە جوودا بن.. تەنانەت خۆم لە هـاوڕێ هـەرە نزیکەکانیشم جیادەکردەوە.. ئەمـەش یەکێک بوو لەو هۆیانەی نـەیهێشت ببم بە نـووسـەرێکی چاک.. هـەرچییـم دەنووسی، چاک یان خـراپ، شـیـعـر یان چیـرۆک، هەر هەمـوویم دەدڕاند و دەسـووتاند.. حـەزم نەدەکرد وشـەیەکم، ڕسـتـەیەکم، ناونیشـانـی بابەتێکم لە هی نووسـەرێکی دیکە بچـێت.. بەڕادەیەک دەمـویست کـۆمـەڵێ پیت و دەنگی سـەربەخـۆ، کـە لە هیچ زمـانێکی تردا نـەبن، دابهێنم و پێیـان بنووسـم.. هەمـیشـە وتوومـە: «مـرۆڤ هێشتا زمـانی نەگرتووە».. جارێکیشـیان لەسـەر لاپەڕەی یەکەمی ئەو دەفتـەرە بەرگشینەی، کە بۆ موحازەرەکانی «سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا»م تەرخان کردبوو، نووسـیم: «مرۆڤ بۆ داپۆشـینی عـەیب و عاری جـەسـتـەی، جلوبەرگی

پۆشی و بۆ شاردنەوەی پۆخڵەواتەکانی ناخیشی وشەی کردە کۆت و پەیوەندی زمانی».

من لەوەتەی فامم کردۆتەوە، ئەو پیت و دەنگانەم بە ئاماژە زانیوە و هەرگیز باوەڕم نەبووە بتوانن لەجیاتی هەستەکانم بدوێن، ئەگینا من هەموو ژیانم هەر بابەتی شیعر و چیرۆک و ڕۆمان و شانۆگەری بوو.. دەمتوانی تەنها دەربارەی لەیەکچوونی قوتابخانە و تەڵەی مشک، درێژترین ڕۆمان بنووسم.. نووسینی ڕۆمانێکی ئاوا بۆ من لە بژاردنی پەنجەکانی دەستم ئاسانتر بوو.. هەرچی لە ئەنجامی بیرکردنەوەی ئەم مەسەلەیە و وتنەوەی ئەو ڕستە شوومەوە بەسەر خۆم و کەسانی ترمدا هێناوە، وەکو خۆی بەبێ زیاد و کەم بمنووسیایەتەوە، لە پێنجسەد لاپەڕەی قەبارە گەورە کەمتری نەدەکرد.. باشتر وام نەکرد.. ڕەنگە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کۆتایی بە دنیا بهاتایە.. هەر پیاوێ بیخوێندایەتەوە، بەبێ چەند و چوون گوللەیەکی وێڵی بەردەکەوت.. هەر ژنێ بیخوێندایەتەوە، وەکو من و دایکمی بەسەردەهات.. جا ئەگەر بمنووسیایە، دەبووایە ناوی بنێم «تاوان»، یان «کۆتایی مرۆڤ» و ناونیشانی لەم بابەتە.. لە سەرتاپای ئەم دنیایە بگەڕێی، سەربەگۆبەندێکی تری وەکو من نادۆزیتەوە.. بزانە بووم بەهۆی مردن و کەنەفتبوونی ئەو هەموو خەڵکە و هێشتا واز ناهێنم.. لە هەموویان زیاتر سوێم لە دکتۆر «نەبیل ئەلجەنابی»ی «دەروونناسی» دەبێتەوە.. داماوە چەندی خۆشدەویستم.. بەو هەموو زلی و قەڵافەتە تێکسمڕاوەی خۆیەوە لێم دەپاڕایەوە و پێی دەوتم:

ــ انتی شاغله کل تفکیری  وکیانی، ما اگدر اتخلێ عنچ.. گولیلی انتی لیش ما تحبینی..؟!

چۆن خۆشمنەدەویست چۆن..؟! بەڵام پێش ئەوەی ئەم پێم بڵێ، لەگەڵ «گۆران» هەموو شتێکمان بڕاندبووەوە.. ئاخر بڵێ من کەی ئەوەندە بەتەنگ بەڵێنەوە بووم، ئاوا لە بەختی ڕەشی ئەم، خۆم کرد بە فریشتەی سەربالسپی.؟! ئێستاش ئەو دیمەنەیم لە بەر چاوە، کاتێ پێم وت:

ــ آنی مرتبطه بغیر واحد، أرجو ان تخرج الموضوع من راسک.

چەند بەداماوی و چەندیش بەحەسرەتەوە سەری خستە سەر مێزە

ڕەشەکەی بەردەمیەوە و دەستی بە گریان کرد.. ئای..!! ئای..!! خۆ ئەو پیاوە زلە خۆش خۆش دەگریا و فرمێسکی دادەباراند..!! مانگ و نیوێ مۆڵەتی وەرگرت و نازانم سەفەری کام لای کرد.. کاتێ هاتەوە، لە پیاوە کەشخەکەی جاران نەدەچوو.. ڕیشێکی نارێک، دەموچاوێکی خەمناک، جلەکانی چرچ و پەڕپووت.. بە دەنگێکی نووساو و ماندوو، موحازەرەیەکی بەناوی «گۆڕانی یادوەری لە یادکردنەوەدا» بۆ وتینەوە.. دەیویست بڵێ گێڕانەوەی چیرۆک و ڕووداو، کاتێ کەس لە دوای کەس دەیگێڕنەوە، گۆڕانیان بەسەردا دێت.. نموونەیەکی زۆر سەیری بۆ هێناینەوە: «وێنەی کونەپەپوو پیشانی کەسێک بدە و دوای ماوەیەک داوای لێ بکە وێنەکەیت بۆ بکێشێت.. وێنە تازەکە پیشانی کەسی دووەم بدە و دوای ماوەیەک پێی بڵێ وێنەکەیت بۆ بکێشێت.. ئەمیش پیشانی کەسی سێیەم بدە و دوای ماوەیەک با وێنەکەیت بۆ بکێشێت.. بەم شێوەیە تا کەسی دەیەم.. سەیر دەکەیت ئەو وێنەیەی کەسی دەیەم کێشاویەتی، هی پشیلەیە نەک کونەپەپوو»....

کاتێ چووە دەرەوە، لە ڕاڕەوەکە وەستاندم و پێیم وت:

ـ دەزانی دکتۆر ئەگەر لەجیاتی وێنەی کونەپەپوو، هی کۆلیژی پەروەردە دابنێین، ئەنجامەکەی تەڵەی مشک دەردەچێت..؟!

ـ دەمخۆش.. بەڕاستی تێبینیەکی جوان و بەجێیە.

هەڵوێستەیەکی کرد و کەوتە تەقاندنەوەی پەنجە لەرزۆکەکانی.. ئینجا بەدەم سەیرکردنی چاوەکانی منەوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و یەکێکی قووڵتری دایەوە.. دواجار سەری داخست و وتی:

ـ ڕاست دەکەیت ئاشنا کۆلیژی پەروەردە لە تەڵەی مشک دەچێت.

ئەمەی وت و بەجێیهێشتم، بەڵام ڕەنگوڕووی بەجارێ گەشایەوە.. تا تەوایش لێم دوورکەوتەوە، ئەمەی لە بەر خۆیەوە دەوتەوە.. ئەوە یەکەمجار بوو کەسێ ببینم، بەم قسەیەی من دڵخۆش بێت.. زۆرم بەلاوە سەیر بوو، بۆیە لە خەیاڵی خۆمدا کەوتمە لێکدانەوەی و دەمهێنا و دەمبرد.. تەنانەت ئەو کاتەی دەنگی لەناکاوی گوللەکەش، وەکو هەموو قوتابیەکانی دیکە ڕایچەڵەکاندم، هەر بیرم لێی دەکردەوە.. ئەوەندەم نەزانی بوو بە هاوار هاوار:

ـ دکتۆر نەبیل ئەلجەنابی، لە ناوەڕاستی باخەکەی کۆلیج گوللەی وێڵی بەرکەوت.

پۆلیسی سەر بە «زانکۆی مووسڵ»، دوای ئەوەی ژوورەکەی گەڕان و بەوردی پشکنیان، لاپەڕەیەکی خورشیدییان لە چەکمەجەی مێزە ڕەشەکەیدا دۆزیبووەوە و بە دەستوخەتی خۆی لەسەری نووسی بوو: «من بڕیارم داوە خۆم بکوژم.. دەمەوێ کۆتایی بە تەمەنێکی کورت و قرچۆک بهێنم، کە ڕێگرە لە بەردەم خۆشەویستیی دڵی هەڵقرچاوم و ئەو کچە ئەفسانەییەی بۆم دەسگیر نابێت، بەڵام تا کاتی نووسینی ئەم چەند دێڕەش، ڕێگایەکی گونجاوم نەدۆزیوەتەوە.. تکایە هیچ کەسێ بە کوشتنم تاوانبار مەکەن».

کاتێ لە پۆلی چوارەمی ئامادەیی بووم و خووم دابووە هونەری شێوەکاری، پیاوێکی نیگارکێشم خۆشدەویست و زوو زوو دەچووم بۆ لای، کە تەمەنی پەنجا ساڵ دەبوو و بە تەنیا لە خانووێکی پەڕپووتی گەڕەکی «ئیسکان» دەژیا.. هەرچەند لە ژووری نیگارکێشانەکەی دەیگرتمە باوەشییەوە و ڕایدەمووسیم، چاوەکانم وەکو دوو ئاسکی برسی لەناو گژوگیای سەر خاکی تابلۆکانی دەلەوەڕان و شتەکان بە شێوەیەکی زۆر جیاواز لەوەی هەبوون، دەکەوتنە بەر بینایی‌م.. ئیتر بە دەنگ دەربارەیان دەدوام و ئەویش بۆی دەسەندمەوە.. «لەناو ئاپۆرەی بازاڕەکەی بەردەم قەڵات ژنێک کز و خەمناک بە پەشتەماڵێک خۆی داپۆشیوە و تەختی نووستنەکەی دەفرۆشێت.. لەناو تەمومژێکی کەمێ چڕدا دەستەیەک دەفڕەنی ڕەشپۆش لە نزیک رەشماڵی قەرەجەکان دەفی زل زل دەژەنن و پۆلە ڕیشۆڵەکەی سەر سەریان وەکو زەخرەفەی قەد دیواری خانووی سەدە کۆن کۆنەکانی مێژوو دیارن.. راهیبەیەک بە پێی پەتی پیانۆیەکی گەورەی خستۆتە سەر شانی و ترساو و زارەترەک بە دەشتێکی چۆڵوهۆڵدا ڕادەکات».. دوای ئەوەی بەجێمدەهێشت و بە تەنیا دەمایەوە، هەموو ئەو قسانەی منی دەکرد بە تابلۆ و لە جێی تابلۆ کۆنەکانی دادەنان، بەڵام هەر ئەو تابلۆیانە جارێکی دیکە لە بەرچاوی مندا دەگۆڕان و دەبوون بە هی زۆر جیاوازتر.. جارێکیان لەسەر تاوێرە بەردێکی قەدپاڵی شاخێکی بەرزدا ڕۆژ سەری دەرهێنا و تیشکەکانی بەسەر

قوتابخانەی لادێیەکی ناو ئەو دۆڵەدا پەرشکردەوە.. منداڵەکان لە پەنجەرەی پۆلەکاندا وەکو چەند مشکێکی زارەترەک دەردەکەوتن و من زەندەقم لێیان دەچوو.. وا دیاربوو وتبووم قوتابخانە لە تەڵەی مشک دەچێت و ئەویش لە دوایدا وتبوومەوە، بۆیە کاتێکم زانی دەستەیەک سەرباز لە ئیڤایەکی ناو تابلۆی سووچی ئەوسەری ژوورەکە دابەزین و دایانە بەر ڕێژنەی گولله.. هەر بەو ترسەوە ڕامکردە دەرەوە و خۆم گەیاندە ماڵ.. نەمزانی بوو من ماوەیەکی زۆرە ماڵی خۆمانم بەجێهێشتووە و دایکم و باوەپیارەکەم هەموو ئەو شارەم بە دوادا گەڕاون.. «ڕۆشنا» بە چاوی پڕ لە گریانەوە بە پیرمەوە هات و پێی وتم:

ــ ئاشنا گیان بە قوربانت بم نەچیتەوە ماڵ.. دایکە زۆر تووڕەیە، سوێندی خواردووە دەتکوژێ.

وەکو زۆر جاری دی خێسەیەکم لێ کرد و پێم وت:

ــ تۆ چەنەبازیی مەکە، دایکی خۆمە ئەگەر بشمکوژێ بە تۆ چی..؟!

هەرکە بە ترسەوە دەرگاکەم کردەوە و قاچم خستە ئەودیوەوە، هەردوو دەستی نایە قژمەوە و لەگەڵ یەکەمین پاڵ، سەری کێشام بە دیواری حەوشەکەدا و خوێن بە ناوچەوان و لاملمدا جۆگەلەی بەست.. جارێکی دی هەر بە تیتک هەڵیبڕیم و بە دەمدا خستمیە سەر ڕیزە کاشیە ڕەش و ڕەقەکانی حەوشەوە و خوێن لە دەم و لووتمەوە فیچقەی کرد.. سەرم دەخولایەوە و بەحاڵ دەوروبەری خۆمم دەبینی.. «ڕۆشنا»م دەبینی و لێی دەپاڕایەوە:

ــ دایکە گیان بە قوربانی پێڵاوەکانت بم، ئەمجارەش مەیکوژە.

لە هەمووی سەیرتر «یوسف»ی باوەپیارەم بوو، بە پرتاوی لە ژوورەوە هاتە دەرەوە و خۆی بۆ کردم بە قەڵغان:

ــ ئێستا پێم ناڵێی تۆ بۆچی گەڕت ئالاندۆتە ئەو کچە داماوە..؟! ئاخر بەس پێم بڵێ چی کردووە، تۆ ئاوا بەبێ ویژدانانە لێی دەدەیت..؟!

ــ تۆ بێ دەنگ بە و ورتەت لە دەم نەیەتە دەرەوە.

ــ بێ دەنگ نابم.. لە بەر چاوم ئاوا دڵڕەقانە لێی بدەیت و بێ دەنگیش بم..؟!

ــ دەسا خوام لەو خوایەیە لاناچیت و دەستم دەگریت.

ــ لاناچم و ڕازییش نابم یەک زللەی تری لێ بدەیت.

ــ ئەوە چییە، هەڕەشەم لێ دەکەیت..؟!

ئەمەی وت و دەستی لە یەخەی گیرکرد.. تا تینی تێدا بوو پاڵێکی پێوەنا.. تا ئەم لەوێ خۆی بە قەدی دارهەنجیرەکە گرتەوە، ئەو خۆی گەیاندەوە سەر سەرم.. هەر خێرا دەستی درێژ کرد و ئینجانەی ڕەشی گوڵە سپیەکەی هات بەدەستەوە.. هەڵیبڕی و کێشای بە مووروەغەی پشتمدا.. ناو دڵمی لەگەڵ هێنایە ژان و ئەوەندەی دیکە بەرچاوی تاریک داهێنام.. ویستم تا تینم تیایە هاوار بکەم و بڵێم: وای دایکە گیان بە ئینجانەی ئەو گوڵەی خۆشمدەویست و ناوەکەیم نەدەزانی کوشتمت، بەڵام زمانم لە گۆ کەوتبوو، هیچم بۆ نەدەوترا.. چەندم حەز دەکرد بە دەم ناڵە ناڵ و گریانی پڕ لە سۆز و بەزەییەوە پێی بڵێم: ئەی دایکە دڵڕەقەکەم، چەند دەترسم لەژێر دەستتدا گیانم دەربچێت و چیتر نەتبینمەوە.. هۆ ژیانە تاڵ و دزێوەکەی لە هەموو شتێ زیاتر ڕقم لێتە و لێت بێزارم، هۆ ژیانە سەیرەکەی هەرگیز لێت تێناگەم و نازانم هەیت یان نییت، خەونی یان ڕاستی، چەند دەترسم لە دەستم بچیت.. ئاخ..!! کە نەمدەتوانی هیچ شتێ بڵێم.. هیچ شتێ.. مۆڵەتی نەدەدام هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشم و چاوە داماو و گوناهەکانمی تێ ببڕم، کە پڕ بووبوون لە ترسی مردن و بڵێم.... چی بڵێم..؟! نازانم.. ئای کە حەزم دەکرد هاوارێک، قیژەیەک، زریکەیەک بکەم و بۆم نەدەکرا..!!

ئەمجارە «یوسف» تووڕەتر لە جاری پێشوو پەلاماری دا.. توند ملی گرت و خستیە ژێر باڵی خۆیەوە، بەڵام دایکم بێجگە لەوەی بە قەلافەت بوو، زۆریش بەهێز بوو، ئاوا بە ئاسانی بۆ «یوسف» دابین نەدەبوو.. ئەوەندەم نەزانی خۆی ڕاپسکاند و بە چەپۆک شالاوی بۆ برد:

ــ نامەرد، تۆ وات لێ هات دەست لە من بەرزبکەیتەوە..؟!

خۆی گەیاندە لای مێزە ڕەشەکەی هەیوان و پەرداخێکی سپیی زلی هەڵگرت، تێی گرت و ئەم خۆی لادا.. لەولاتر بەر قاچی «ڕۆشنا» کەوت و بە تاسدا چوو.. خولایەوە خولایەوە، بەسەر پەرژینی باخەکەدا کەوت.. کەوت و

لەمــــلای منـەوە ڕەهێڵ بوو.. ئیـــتــر «یوسف» ئەوەنـدەی دی کــەللەیی بوو.. بەپڕتاوی پەلاماری ناوقەدی دا و بوو بە زۆران و ڕاکێش ڕاکێش.. لەوە دابوو «یوسف» بکەوێت، «ڕۆشنا» بەدەم گـریانەوە هەســتــایەوە و لە دواوە بە قــژ دایکمی ڕاکـێشـا.. ئیـتـر لە تاوا وردە وردە هێـزی دەسـتـی کـەم دەبووە و بە پشـتـدا دادەهات.. ئەنجـام کـەوتە سـەر ڕیزە کاشـیـە سـپـیـە ڕەقـەکـان و بە هەردووکیان تێیکەوتن.. ئەوەندەیان لێ دا تا بوورایەوە.. ئەوەی سەیر بوو من بووم.. نەمـــدەزانی ســـەرکــەوتنی کـــام لایان لە قـــازانجی منـدایە.. بۆیە نەشمدەزانی پشـتی کامیان بگرم و دژی کامیـان بوەسـتم.. دایکم بە تەنیـا و ئەوان بـە هـەردووکـیــان.. ئـەم دایکمــە و بڕبـڕەی پشــتم، ئەوان هـەردووکــیـــان دوژمنم.. ئەم دەیـەوێت بمکوژێت و ئەوان لـە پێناوی پاراسـتنی گـیـانم، خـۆیان دەکەن بە قـوربانیم.. ئەوسا بە خـۆمم وت: ئەی هـاوار من لە چ ماڵێکی سـەیر و سەمەرەدا چاوم کردەوە و گەورە بووم..!! ئەی هـاوار من لەوە دەسـتـەوسـتانم لە خـۆم بگەم..!! لە مـاڵەکـەم، لە دایکم، لە باوەپیـارە و کـچی باوەپیـارە و ژوور و تەختی نووستنەکەم بگەم..!! کامەیان دۆستمە و کامەیان دوژمنم..؟!

ئەو جـارەی لـەگـەڵ «ئاشـتی» و «ڕازاو» چووین بۆ مـاڵی «جـانێت»ی «مـام تۆما» لە «عەنکاوە» و شەو لەوێ ماینەوە، دەیوت:

ــ چ گەمژەییـەکە بەشداریی لە شەڕێکدا بکەیت، لە کاتێکدا نازانی ناو دڵی دوژمنەکەت چەندی خۆشەویستی و ناو دڵی دۆستەکەت چەندی ڕق تێدایە.

ــ خۆشەویستی و ڕقی چی و بەرامبەر بە کێ..؟!

ــ خـۆشـەویسـتیی ناو دڵی دوژمـنـەکەت بەرامـبـەر بە تۆ، کە شـەڕی لە دژدا دەکەیت و ڕقی ناو دڵی دۆستەکەت، کە بەرگریی لێ دەکەیت.

«ئاشــــتی» و «ڕازاو» گـــاڵتــــەیان لێ دەهات، بـەڵام من کــــە ئـەو ڕۆژەم بیـرکەوتەوە، تەواو بـاوەڕم بە قسـەکەی هێنا.. ئەمـیش وەکـو من کەسـێک بوو سـەیر و سـەمـەرە و هـەمیشـە شتی نامـاقـووڵ و بێتامی دەوت.. هەر لەبەرئەوەش بوو من تاکە کەس بووم تا سەر هاوڕێیەتیم دەکرد و لێی نەدەتەکیمەوە.. خـۆ من زۆربـەی بۆچوونـەکـانیــشــیم بە لاوە ڕاست نەبوون، بەڵام کـــۆڵێ دڵم پێی دەکرایەوە، کاتێ هەستم دەکرد ئەویش وەکو مـن لە هیچ کەسێ ناچێت.. چی

هەیە لەوە خۆشتر بزانی کەسێکی دیکەش هەیە وەکو تۆ لە هیچ کەسێکی تر ناچێت..!! خۆ ئەگەر هەر کەسە و لەوی دی جیا بووایە و کەس لە کەس نەچووایە، هیچ بنیادەمێ هەستی بە تەنیایی نەدەکرد.. هەمیشە واتدەزانی دەوروبەرەکەت ئاوەدانە و جمەی دێت لە خەڵک.. خۆشترین قسەی «جانێت» ئەوە بوو، کاتێ دەیوت:

ــ مرۆڤ چەند گوناهە، کە هەیە و گیانی لە بەردایە.

جارێکیان لە شەقامی «دەواسە» پیاسەمان دەکرد و وای وت، «ئاشتی» لێی پرسی:

ــ چەوسێنەرەکانیش گوناهن..؟!

ــ بۆچی ئەوانیش مرۆڤ نین..؟! ئەوانیش وەکو چەوساوەکان زوڵمیان لێکراوە و بەو گیانەی پێیان بەخشراوە، سزا دراون.. دەبێت چ سزایەک لەوە ناخۆشتر و سەختتر بێت، مرۆڤێک بخوڵقێنیت و بە ساویلکەیی و بەبێ ئەقڵ و هۆش، بە تەمەنێکی کورتی ئێجگار کورتەوە بەرەڵلای ئەم جیهانە جەنجاڵەی بکەیت..!!

من پێم وت:

ــ ئەمەی تۆ دەیڵێیت هەر وتەکەی «مەسیح» دەگرێتەوە، کە دەڵێت: دوژمنەکانتان خۆشبوێت.. نوێژ لە پێناوی ئەوانەدا بکەن، کە دەتانچەوسێننەوە.. دەبن بە کوڕی باوکتان، کە لە ئاسمانە.. ئەو ڕۆژ بۆ سەر چاکەکان و خراپەکان هەڵدەهێنێت و باران دەبارێنێتە سەر زۆردار و زۆرلێکراوان.

ــ ئەمە لە کوێ و ئەو لە کوێ ئاشنا..!! جا خۆ ژیان و مردنی مەسیح چاکترین بەڵگەیە بۆ ئەم بۆچوونەی من.

ئەو شەوە لەو سەربانەی ئەوان تا بەیانی وتمان و وتمانەوە.. هەموو قسە و باسەکەشمان لە منداڵەکەی سکی «ڕازاو»ـەوە هات.. ئەم دەیوت:

ــ هەستی دایکایەتی و باوکایەتی هەستێکی دوژمنکارانەیە.. تەنها هەستی تۆڵەکردنەوەیە پاڵ بە چەوساوە سزادراوەکانەوە دەنێت پەنا ببەنە بەر هێنانەکایەی چەوساوەی دیکە.. تۆڵەکردنەوەیە لەوانەی گیانیان بە

بەرداکـردوون.. داخـڕشـتنە بەوانەی دەسـتـیـان پێـیـان دەگـات و دەتوانن بیـانخـوڵقێنن.. گـیـانی قرچۆکی وەک هی خـۆیانیـان بە بەردا بکـەن و تەمـەنی کورتیان پێ ببەخشن.

ــ بە قسەی تۆ بێت هەموو کەسێ لە یەک کاتدا زۆردار و زۆرلێکراوە.

ــ ڕێک مـەبـەسـتـمـە ئاوا بڵـێم.. دەشـڵـێم مـرۆڤ زۆردار و زۆرلێکراوێکی داماوە.

ــ ئەی ئەوانەی دەستەپاچە و کەنەفتن..؟! ئەی ئەوانەی نەزۆکن..؟!

ــ ئەوانیش هەمـان شت.. زۆرلێکـراون، کـە هەن، بەڵام دەسـتـەوسـتـانن لە ئاستی تۆڵەکردنەوەدا، لە کاتێکدا مەیل و ئارەزوویان لەوانی دیکە زیاترە.

ــ ئەی دەربـارەی ئەوانـە دەڵێی چـی، کـــە نـەزۆک نین و بـەشـــداریـیش لـەو چەوساندنەوەیە ناکەن، کە تۆ باسی دەکەیت..؟!

ــ ئەوانـەش مـادام گـیـانی تۆڵەکـردنەوەیان تێدایە، زۆردارن، بـەڵام ئەوەندە هـەیە قـوفـڵـێک لەو دەرگایە دەدەن، کە مـن ناویم ناوە دەروازەی بەڵا.. من خـۆم وەکو کـەسـێکی زۆردار دەرگـای بەردەمی خۆمم داخسـتـووە، بەڵام بە داخـەوە ناتوانم وا لـە کـەسـانی تریش بکەم دەرگـای بەردەم خـۆیان دابـخـەن.. ئای لە جوانیی ئەو ژیانەی دوای داخستنی هەموو دەرگاکان دێتە کایەوە..!! خـۆ من لەوەتەی هەم لەگەڵ ئەوەدا نییم هیچ کەسێ وەکو ئەوی دیکە بیربکاتەوە، بەڵام تەنـها بـۆ بەرپاکردنی ئەو شـۆڕشـە لە پێناوی داخـستـنـی دەروازەکانی بەڵادا، ئاواتی ئەوە دەخوازم هـەر هـەموومان یەک بیرکردنەوەمان هەبێت.

ــ من پێم نـاخـۆش نییـە تۆ ئەو قسـە بێسـەروبەرانە دەکەیت، چونکە خـۆت دەزانی چـەند حـەز لـە وڕێنە دەکـەم.. بەڵگەشم ئەوەیە، بـەم درەنگی شـەوە بە دیارتەوە دانیشـتـووم و گـوێت لێ دەگرم.. ئـەوەتا ئاشـتـی و ڕازاو بێـزاربوون و خەویان لێ کەوت.

ــ قسەکانی من وڕێنەن..؟! وا دیارە بە منداڵیی ئارەقم خواردۆتەوە.

ئەمەی بە گاڵتـە وت و دەستی کرد بە پێکەنین.. مەبەستیشی من بوو، کە بە منداڵی لە مـاڵـی ئەوان بەهەڵە لەجـیـاتی مـاسـتـاو، پێکی ئـارەقـەکـەی باوکـیم بەسـەر دەممەوە نابـوو.. دایکی من و «ماریا»ی دایکی ئەم، هەردووکیان لە یەک

قوتابخـانەدا مامۆسـتا بوون.. ڕۆژێکیـان چووین بۆ ماڵیان.. لە کـاتێکدا باوکی سـەرقـاڵی قـسـە بـوو لەگـەڵ ئـەواندا، من دەسـتـم بۆ پێکەکـەی سـەر مـێـزە ڕەشـەکەی بەردەمی برد و بەسـەر دەمی خـۆمـەوە نـا.. ئـەوەندەش بە پەلە بووم، نەوەکـا بمبـینێت، بە خـورِ شـۆڕمکردەوە و تەواوێکم لێی خواردەوە.. هـەر خێـرا هـاوارم لێ بەرزبووەوە.. دایکی «جانێت» بـە فریام کەوت و دوو کەوچک مـاستی خەستی بە دەمەوە کردم.. ئینجا هـەر بە گاڵتەش وتی:

ــ ئارەق بەبێ مەزە ناخورێتەوە چاوەکەم.

ئیتـر دوای ئەوە کفت بـووم و خـەوم لێ کەوت.. کـاتێ چاوم کردەوە لـە ماڵەوە بووم.. ئەو ڕۆژەش کە نیگارکێشەکە کوژرا و من بە ترسـەوە گـەڕامـەوە مـاڵ.. گـەڕامەوە و دایکم ئەو ئاژاوەیەی نایـەوە، زۆر سـەیر خـەوم لێ کەوتبـوو.. نازانم ئەو کـاتەی لەسـەر تەخـتی نووسـتنەکـەم چاوم کـردەوە، چەند ڕۆژ بـوو ئاوا بێهۆش و بێئاگا لێی نووستبووم، بەڵام هەر ئەوەندە دەزانم دایکم و «یوسف» و «ڕۆشنا» بە دیارمـەوە دانیشـتبوون و بـە لەفافی سـپی دەست و سەر و قـاچیان پێچـرابوو.. تەخـتـەڕەشـەکەی پۆلی خـۆمـانم بینی، کرابـوو بە چوار بەشـەوە و هەر بەشەی بە جیـا بە دیوارەکەی بەرامبەرمەوە هـەڵواسرا بوو.. لەسەر بەشی یەکەم چەند وێنەیەکی تەڵەمشک و لەسـەر هـی دووەم وێنەی پۆلێ قـاز کێشـرا بوو.. لەسـەر هـی سـێیـەم بە دەسـتـوخـەتی دایکم هـاوکـێشـەیەکی پێکەوەیی شـیکار کـرا بوو.. لەسـەر بەشـی چوارەمـیش ئاوێنەیـەکی چوارگـۆشـەی تەڵخ چەسپ کـرابوو.. مـەنجـەڵێکی ڕەشـی زۆر زۆر گـەورەی پڕ لە شـیـریشم بینی لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دانرابوو.. پشیلە ڕەشـە چاوسپیـە ناسراوەکەی گەڕەک بە قاچ چووبـووە سەر قەراغـەکەی و دەم و لووتی تێنابوو.. دڵم تێکـهەڵدەهات و خەریک بوو بڕشێمەوە.. هاوارم کرد:

ــ ئەو پشـیـلـە ڕەشـە لابـەرن لە بەرچاوم.. ئەو ڕۆژە بە چاوی خـۆم بینیم مـشکێکی سـپیی بە دەمـەوە بوو.. چۆن قـێزتـان دێت دوایی ئەو شـیـرە پیسـە بخۆنەوە..؟!

دایکم هـەسـتـا سێ کـووپی ڕەشی هێنا و لە تەنیـشت قـاچە ڕەشـەکـانی پشـیلەکـەوە، بە کـەوچکێکی بـاغـەی سـپی شـیـری تێکردن.. سێ پارچە نانی

سپییشی لە سەبەتە ڕەشەکە دەرهێنا.. هەرکە سەری سەبەتەکەی لابرد، مشکێکی سپی، کە لەمەوپێش هەرگیز مشکی وا زل و سەیرم نەدیبوو، تێیدا دەرپەڕی.. بە بەرچاوی پشیلەکە و بە تەنیشت مەنجەڵەکەوە خشکەی کرد و لە دەرگاکە ئاودیو بوو.. ئینجا هەرسێکیان بە تەنیشت یەکترەوە دانیشتن و سووک سووک دەیانخوارد.. دەیانخوارد و پەیتا پەیتا شیریان بە سەردا دەکرد.. بە شێوەیەکی زۆر زۆر سەیریش لەمن ڕادەمان.. وای..!! چەند دەترسام، کاتێ ئاوا بە خاووخلیچکی پارووەکانیان دەجوو و وەک سەرنج لە تەرم بدەن، ئاوا سەرنجیان لێ دەدام..!! ئینجا بیرم لەو مەنجەڵە کردەوە، کە یەکەمجار بوو لە ماڵی خۆمانم دەدی.. بە خۆمم وت: ئەمە ئەو مەنجەڵەیە، کە لە گەڕەکی ماڵی «رازیە»ی نەکم تێیدا ئاو بۆ شتنی مردوو گەرم دەکەن.. ئەی بۆچی هێناویانە بۆ ماڵی ئێمە و شیریان لەناو کوڵاندووە..؟! نا.. نا.. من مردووم.. بەڵێ، مردووم، بەڵام بۆچی پێم ناڵێن..؟! من زۆر چاکم ئەو مەنجەڵە لە بیر بوو، کاتێ نەنکم و دوو سێ ژنی دیکە ئاویان بۆ شتنی تەرمەکە تێدا گەرم دەکرد.. ئەمە ئەو جارە بوو، کە لەگەڵ دایکم چووین بۆ ماڵی نەنکم و من شەو درەنگانێ چوومە دەرەوە.. چوومە دەرەوە و لە گۆڕەپانەکەی بەر ماڵیان قازەکانم بینی.. ئەوە یەکەمجار بوو لە نزیکەوە و بە زیندوویی قاز ببینم.. ئای..!! چەند لە بەفری تازە باریو دەچوون..!! ئەمە وای لێ کردم لەو کوڕە بپرسم، کە لەپڕ لە دەرگای یەکێ لە ماڵەکان هاتە دەرەوە:

ـ کوڕەکە ئەم مراویانە هی ئێوەن..؟!

ـ مراوی نین، قازن.

ـ چۆن قاز و مراوی لە یەکتر جیا دەکەیتەوە..؟! دەزانی من نازانم کامەیە قاز و کامەیە مراوی..؟!

ـ قاز گەورەیە، بەڵام مراوی بچکۆلەیە.

ـ هەردووکیان مەلە دەکەن وانیە..؟!

ـ ئا، هەردووکیان مەلەوانن.

ـ دەزانی ئەگەر کەمێک چاوت خێل بکەیت و لێیان بڕوانی، وا دەزانی بەفرن و لە شەودا باریون..؟!

ــ تۆ حەز لە بەفر دەکەیت..؟!

ــ زۆر.. ئەی تۆ..؟!

ــ من نەء.. چونکە جارێکیان لەسەر بەفر خلیسکام، بە پشتدا کەوتم.

ــ بۆچی خلیسکایت..؟

ــ چونکە لەسەر بەفرەکە ڕاوی پشیلە ڕەشەکەم دەنا.. ئیتر لەپڕ کەوتم و دەستم شکا.

ــ دەستت شکا..؟!

ــ ئا، دەستم شکا.. لە خەستەخانە بە لەفافێکی سپی بۆیان پێچام و کردیانە ملمەوە.

ــ زۆر گریایت..؟

ــ ئاخر ئەو کاتە منداڵ بووم.. ئێستا گەورەم، ئەگەر بشکەوم، ناگریم.

ــ تۆ چەندساڵیت..؟

ــ دە ساڵم.

ــ چۆن..؟! من نۆ ساڵم، کەچی بالآم لە بالآی تۆ بەرزترە..!!

ــ ئاخر تۆ کچیت.. نەنکم دەڵێ کچ ڕۆژی بەقەدەر دەنکە جۆیەک گەورە دەبێت، بەڵام کوڕ بەقەدەر دەنکە گەنمێک.

ــ دەنکە جۆ لە دەنکە گەنم گەورەترە وانییە..؟!

ــ ئەی چۆن..!! تۆ لە من گەورەتریت، بەڵام ئەگەر تۆ ئێستا لەسەر بەفر بخلیسکێیت و دەستت بشکێت، زۆر زۆر دەگریت.

ــ تۆش دەگریت.

ــ نا، من ناگریم.. من ئەوجارەش لەبەرئەوە ئەوەندە گریام، چونکە لەفافە سپییەکە لە بەفر دەچوو.

ــ کوڕەکە چەند خۆشە بە هاوین بەفر ببارێت، کەس گەرمای نابێت وانییە..؟!

ــ ئای ئای..!! ئەوە تۆ وتت چی..!!

ــ دەڵێم چەند خۆشە بە هاوین بەفر ببارێت..!!

ــ دەزانی نابێت قسەی وا بکەیت..؟!

ـ بۆ..؟!

ـ کفره..!! بە ئاگر دەمانسووتێنن.

ـ کێ دەمانسووتێنێت..؟

ـ فریشتەکانی خوا.

ـ فریشتەکانی خوا دەمانسووتێنن..؟!

ـ ئا.. ئا.. ئەوان دەمانسووتێنن... دەرزیت پێیە..؟

ـ دەرزیت بۆچییە کوڕەکە..؟

ـ دەیکەم بەسەری پەنجەی خۆمدا، تا خوێنی لێ بێت.

ـ خوێنی لێ بێت..؟! بۆ کوڕەکە.؟! بۆ خوێنی لێ بێت..؟!

ـ تا نەمانسووتێنن.

ـ کێ نەمانسووتێنێت کوڕەکە کێ..؟!

ـ فریشتەکانی خوا.. فریشتەکانی خوا.. ئەی پێم نەوتی فریشتەکانی خوا..؟!

ـ دەرزیم پێ نییە.. بچم لە ماڵی نەنکم بیهێنم.

ـ نا.. نا.. نەچییت.. نابێت لە شوێنی خۆت بجووڵێیت.

ـ بۆ نابێت لە شوێنی خۆم بجووڵێم کوڕەکە..؟! بۆ نەجووڵێم..؟! ئەی ئەگەر بجووڵێم..؟!

ـ ئەگەر بجووڵێیت، دەمانسووتێنن.

ـ فریشتەکانی خوا دەمانسووتێنن..؟!

ـ ئا.. ئا.. ئەوان.. پێم نەوتی ئەوان..؟!

ـ هەر دەرزیی دروومان دەبێت، یان هی تریش..؟!

ـ هەر شتێکی نووکتیژ بێت، قەیناکا.

ـ دەرزیی تۆقەکەم دەبێت..؟!

ـ دەبێت، بەڵام نابێت خۆت لێی بکەیتەوە.

ـ ها تۆ لێی بکەرەوە..........

ـ بوەستە.. بوەستە... یەک تۆز سەرت نەویکە.. کەمێکی تریش.. ئەوە چۆن دەکرێتەوە..؟!

ـ به پەنجە پاڵی پێوە بنێ، سەری دەرزیەکە خۆی لە کونەکە دێتە دەرەوە... کردتەوە..؟!

ـ ئا.. ئا.. کردمەوە.. دەزانی تۆ قژت زۆر نەرمە..؟!

ـ ئا، دەزانم.. پوورم هەموو جارێ کە دەمشوات، پێم دەڵێت: بە قوربانت بم ئاشنا گیان تۆ قژت زۆر نەرم و خاوە.

ـ پوورت دەتشوات..؟!

ـ ئا، پوورم دەمشوات.. ئینجا کە لە ئاوێنەی حەمامەکە سەیری خۆم دەکەم و لەبەر کەفاوەکە چاوم بەحاڵ دەکرێتەوە، وا دەزانم بەفر لەسەر سەرم باریوە.

ـ حەمامەکەتان ئاوێنەی تێدایە..؟!

ـ ئاوێنەیەکی گەورەی تیایە، بەڵام ئەگەر بتەوێت سەیری خۆت بکەیت، دەبێت بە خاولی بیسڕیت، ئەگینا ناتوانیت خۆت ببینی.. من هەر بە پەنجە هەڵمەکان دەسڕم.. کوا تۆ دەرزیەکەت نەکرد بە پەنجەی خۆتدا..؟! کوڕەکە بەڕاستیی خوێنی لێ دەهێنیت..؟!

ـ هەموو جارێ هەر پوورت دەتشوات..؟!

ـ هەندێ جاریش دایکم.. بەڵام ئەم لێم تووڕە دەبێت، ئەگەر بە پەنجە ڕووی ئاوێنەکە پاک بکەمەوە.. پێم دەڵێت ئەگەر گەورەبیت، دەبیت بە کچێکی چەتوون و هار.. چڕنووک لە خەڵک دەگریت.. ئەوە کوڕەکە تۆ کەی ئەو دەرزیە دەکەی بە پەنجەی خۆتدا..؟! هەر بەڕاستیی خوێنی لێ دەهێنیت..؟!

ـ تۆ حەز دەکەیت دایکت بتشوات، یان پوورت..؟

ـ حەزدەکەم پوورم بمشوات، بۆئەوەی بە پەنجەکانم هەڵمەکان بسڕم.. کوڕەکە تۆ چۆن دەوێری دەرزی بکەیت بە پەنجەی خۆتدا..؟!

ـ بۆچی حەز دەکەیت بە پەنجەکانت هەڵمی سەر ئاوێنەکە بسڕیت..؟

ـ ئاخر زۆر خۆشە.. چونکە سووک سووک هەموو گیانم دەردەکەوێت.. وا دەزانم منداڵی ساوام و لە ئاوێنەکەدا لە دایک دەبم.

ـ خۆ ئاوێنە ژن نییە، تا منداڵی ببێت..!!

ـ دەزانم.. دەزانم.. خۆ من ئاوا ناڵێم.. دەزانی ژن کە منداڵی دەبێت،

هەموو گیانی خوێناویی دەبێت..؟!

ــ بۆ..؟!

ــ ئاخر چونکە منداڵی دەبێت.. کوڕەکە تۆ دیوتە ژن منداڵی ببێت..؟

ــ نەء، نەمدیوە.. ئەی تۆ دیوتە..؟

ــ پوورمم دیوە.. دەزانی زۆر گوناه و داماو بوو، لە تاوا دەیقیژاند.. سیستەرێک هاتە ژوورەوە و دەرزیەکی لێ دا، بۆئەوەی ئازار نەچێژێت.. کوڕەکە تۆ دەرزی دەکەیت بە پەنجەی خۆتدا ناگریت..؟!

ــ تۆ خۆت بینیت، کە پوورت منداڵەکەی بوو..؟!

ــ ئا.. ئا.. خۆم بینیم.. ئەویش هەموو گیانی خوێناویی بوو.. پەنجەکانی زۆر زۆر بچکۆلە بوون.. کوڕەکە تۆ دەرزیەکە دەکەی بە کام پەنجەتدا..؟!

ــ منداڵەکە بۆچی هەموو گیانی خوێناویی بوو..؟

ــ ئاخر تازە بووبوو.. دایکم پێی وتم نابیێت جارێ ماچی بکەم، چونکە تا گەورە نەبێت، پاکنابێتەوە، ئەگینا من زۆر حەزم دەکرد پەنجە بچکۆلەکانی ماچ بکەم.. کوڕەکە تۆ کە دەرزیەکە دەکەیت بە پەنجەی خۆتدا، چاوت دەنووقێنیت..؟!

ــ دایکت پێی وتی تا گەورە نەبێت، نابێت ماچی بکەیت..؟!

ــ ئا، وای پێ وتم.. ئێستا گەورە بووە، هەموو جارێ ماچی دەکەم.

ــ کوڕە یان کچە..؟

ــ کوڕە ناوی دانیارە.

ــ دایکت ڕازیی دەبێت ماچی بکەیت..؟!

ــ ئەی چۆن..!! خۆ ئێستا گەورە بووە.. پێی گرتووە و پاکبۆتەوە.. گیانی خوێناویی نیە.. کوڕەکە تۆ کە دەرزیەکە بکەیت بە پەنجەی خۆتدا، بەچی خوێنەکەی دەسڕی..؟!

ــ منیش ماچ دەکەیت..؟

ــ تۆش ماچ بکەم..؟!

ــ ئا، ئینجا منیش تۆ ماچ دەکەم.

ــ دەی ڕوومەتت بێنە با ماچی بکەم.... لاکەی تریشت.. ئممم.. ها تۆش

ماچێکم بکە.... ها یەکێکی تریش.... ئەملایەم ماچ بکە.. دەی لاکەی تریش.. هانێ دەمیشم.. ئەوە کوڕەکە بۆچی ئەو قازانە نیوەیان بە پێوەن و نیوەکەی تریان هەڵنیشتوون..؟!

ــ ئەوانەی هەڵنیشتوون مێیەکان و ئەوانەی وەستاویشن نێرەکانن.

ــ بۆچی نێرەکان لە تەنیشتیان نانوون..؟! ئەی شەو نیە..؟!

ــ ئەوان نانوون، نەوەکا چەقەڵ بێت و بیانخوات..؟!

ــ وەی..!! کوڕەکە من لە چەقەڵ دەترسم.

ــ دێیتە باوەشم..؟!

ــ ئا، بمکەرە باوەشتەوە.. من زۆر لە تاریکی و لە چەقەڵ دەترسم.

ــ سەرت بخەرە سەر سنگم.. نا.. نا.. بوەستە.. بوەستە.. من دادەنیشم و تۆش سەرت بخەرە سەر ڕانم.. سەیری چاوی من بکە و گوێ لە قازەکان بگرە.. هەر کاتێ کردیان بە قیرە قیر، ئەوە چەقەڵ نزیکبۆتەوە و خۆت بنووسێنە بە منەوە.

ــ خۆم بنووسێنم بە تۆوە..؟!

ــ ئا، خۆت بنووسێنە بە منەوە، بۆ ئەوەی نەترسیت.

ــ کوڕەکە باش بوو دەرزیەکەت نەکرد بە پەنجەی خۆتدا و خوێنت لێی نەهێنا، ئەگینا نەماندەتوانی یەکتر ماچبکەین.. وانیە..؟!

ــ بۆچی کە ماچمکردی، چاوت نووقاند..؟!

ــ چونکە وامدەزانی خەون دەبینم.. کوڕەکە تۆ کام دەستەت شکابوو..؟

ــ من پێت نالێم، بزانم خۆت دەیزانی..؟!

ــ ئەوەی سەر سنگم..؟!

ــ نەء، نەتزانی.

ــ ئەوەی ناو دەستم..؟!

ــ ئا.. دەزانی نینۆکەکانت زۆر جوانن هەر لە بەفر دەچن..؟!

ــ نەء، لە پەڕی قاز دەچن.

ــ ئەی قازەکانیش وەکو بەفر سپی نیین..؟! خۆ ئەگەر کەمێک چاوت خێل بکەیت و لێیان بڕوانی، وا دەزانی بەفرن و لە شەوی هاویندا باریون.

ــ کوڕەکە ئەوە بۆچی چەقەڵ نایەت..؟!
ــ حەز دەکەیت بێت..؟!
ــ ئا، بۆئەوەی بیبینم.
ــ تۆ چەقەڵت نەدیوە..؟!
ــ بەڕاستیی نەء، بەڵام وێنەکەیم لە کتێبی قوتابخانەدا دیوە.. کوڕەکە تۆ دەزانی قوتابخانە لەچی دەچێت..؟!
ــ ئەی چۆن نازانم..!!
ــ دەی لەچی دەچێت..؟!
ــ لە بەهەشت.
ــ نەتزانی.
ــ چۆن..؟! ئەی مامۆستاکان وا ناڵێن..؟!
ــ کوڕەکە دەزانی قوتابخانە لە تەڵەی مشک دەچێت..؟!
ــ وای باوکەنەڕۆ..!! ئەوە بۆچی وات وت..؟! من دەترسم.. هەستە سەرت لەسەر ڕانم لابە.. دەستم بەردە، من دەڕۆم.. خوایە گیان من نەبووم.. خوایە تۆبە من وام نەوتووە.. خەڵکینە من وام نەوتووە.. ئەم بوو وتی: قوتابخانە لە تەڵەی مشک دەچێت.
ــ وەرە کوڕەکە وەرە.. ئیتر وا ناڵێم.. وەرە ماچێکی تریشت دەدەمێ.. وەرە ڕامەکە ئاقڵ گیان چی دیکە قسەی وا ناکەم.. ئەو تۆقەیەم بدەرەوە دەرزیەکەی دەکەم بە پەنجەکانی خۆمدا و خوێنیان لێ دەهێنم.. وەرە کوڕەکە ماچم بکە و منیش ماچت دەکەم....... وەرە دەی......
ــ هەی بێئەدەب ئەوە چییە ئەم قسانە..؟!
ــ دایکە گیان من...
ــ ئەوە بۆچی قژت کراوەتەوە..؟! ئەی کوا تۆقەکەت..؟!
ــ دایکە قازەکان.... ئەو کوڕە.....
بە تیتک ڕایکێشام و بردمیە بەردەم نەنکم......:
ــ دایکە ونبوونی تۆقە لە شەودا چییە..؟
ــ ڕەنگی چۆنە..؟

ــ سپیه.. له شێوەی قاز درووستکراوه.

ــ ئۆه..!! ڕاست دەکەیت بینیبووم.. ئەمڕۆ کە ماچم کرد، دیم بەسەریەوه.. تۆقەی سپی وەکو بەفر، لەسەر شێوەی قاز.. شەوی ڕەش وەکو کراسەکەی من.. قژی زەرد وەکو ڕۆژی پێش ئاوابوون.. باشه.. خراپه.. باشه.. خراپه.... خراپه.. بەڵێ، خراپه.. قژ بەڵایە و تۆقە دەیبەستێ.. کاتێ تۆقه نەمێنێت، قژ پەرش و بڵاو دەبێتەوه و دەرد و بەڵامان بۆ دەهێنێت.. قازیش حەز و ئارەزووه بۆ بێناموسی.. مەیله بۆ.... سەربەگۆبەند بۆچی بەم شەوه ڕەشه چوویته دەرەوه..؟! برۆ کچم جوانه بیبەره حەمامەکەوه و ڕووتیکەرەوه.. ڕووتیکەرەوه و به ئاوێکی شلەتێن بیشۆ.. ئینجا کاتێ هێناته دەرەوه، پێت دەڵێم چی له دەست و قاچی بکەیت.......

ــ دایکه حەز دەکەم له بەر ئاوێنەکه بوەستم، بۆئەوەی ئەمجاره لەجیاتی بەفر، قازەکان بەسەر سەرمەوه ببینم.

ــ کچی وەکو تۆ چاوقایمم نەدیوه.

ــ بۆ دایکه..؟! بۆ چاوقایمم..؟! قازەکان له بەفری باریوی شەوی هاوین دەچن ئای..!! حەز دەکەم سەیریان بکەم.

ــ ده خێرا دەی چەنەبازیی مەکە.. با جلەکانت له بەر بکەم، نەنکت چاوەڕێمان دەکات.

ــ بۆچی نەتهێشت سەیری قازه هەڵنیشتوو و لەسەریەک قاچ وەستاوەکانی سەر سەرم بکەم..؟!........

ــ دایکه ئەوه به ئاوێکی شلەتێن شتم، ئینجا پێم بڵێ چی له دەست و قاچی بکەم..؟!

ــ بیانخەره ناوگەڵی خۆتەوه.

ــ دایکه بۆچی ئاوا تووڕه بوویت..؟!

ــ هێشتا تووڕه نەبم..؟!

ــ چی بووه دایکه پێم بڵێ.

ــ له خۆت و له کچەکەت بپرسه.. سەرت له قوڕ نێن بۆ خۆت و بۆ ئەو زۆڵەی لەو ناوگەڵە بۆگەنەت خەڵق بوو.

ــ ئێستا پێم ناڵێی چی بووە..؟!

ــ ئەی گوێت لەو زریک و هووڕی گریان و ڕۆڕۆیە نییە..؟!

ــ ئەوە لە کام ماڵەیە..؟!

ــ لە کام ماڵەیە..؟! کوڕی دە ساڵان، جوان و نازدار، لە بەردەم ماڵی خۆیان گووللەی بەرکەوت، تۆ و کچە سەرەخۆرەکەت خۆش.

نەنکم ئەمەی وت و ڕای کردە دەرەوە.. من و دایکیشم بە دوایەوە.....

مەنجەڵە ڕەشەکە لەسەر سێ بەردی سپی دانرابوو.. ئاوەکەی ناوی قوڵپی دەدا:

ــ نەنە ئەوە بۆچی ئاو گەرم دەکەن..؟!

بە رقێکەوە سەیری کردم و هیچیشی نەوت.

ــ قازەکان سەر دەبڕن..؟! تووخوا سەریان نەبڕن، چونکە هەر لە بەفری باریوی شەوی هاوین دەچن.

دایکم لەولاوە هات بە تیتک ڕایکێشام و دووری خستمەوە:

ــ کوا ڕۆژێ ئاواش ئاومان بۆ تۆ گەرم بکردایە.

نەنکم باوەشێ چیلکەداری خستە ژێر مەنجەڵەکەوە و وتی:

ــ ئەو سەربەگۆبەندە سەری هەمووومان دەخوات و خۆی بە تەنیا دەمێنێتەوە.

ــ ئەگەر قازەکان بخەنە ئاوی گەرمەوە، دەتوێنەوە و لە ناو ئەو مەنجەڵە ڕەشەدا وەکو شیریان لێ دێت.

ئەمەم وت و سەرم بە ماڵی کوڕەکەدا گرت.. لەسەر تەختێکی ڕەش پاڵیان خستبوو، بە پارچەیەک خامی سپییش دایانپۆشی بوو.. ئەوە یەکەمجار بوو لە نزیکەوە مردوو ببینم .. هەموو گیانم مووچڕکی پیادا دەهات.. ئاخر بینینی مردوو خۆی ترسناکە، ئینجا لە شەوەزەنگێکی ئاواشدا.. دواییش هەرچەند بیرم لەو شەوە دەکردەوە و تەرمەکەیم دەهێنایە بەرچاوی خۆم، قێزم دەکردەوە و دڵم تێکهەڵدەهات.. ئەو ڕۆژە بۆ ناڵێی، کە مەنجەڵەکەم لە ماڵی خۆماندا بینی و پڕیانکردبوو لە شیر.. هەر خەریک بوو ڕۆحم دەردەچوو، کەچی ئەوان دەیانخواردەوە و گوێیان نەدەدایە ئەوەی پشیلە ڕەشەکە دەم و لووتی تێنابوو..

دواییش دەیانویست منی پێ بشۆن.. کەواتە هەردووکمانیان بە یەک ئاو شت.. بەڵام سەیرە من بە لایەنی کەم شەش ساڵ دوای ئەو مردم.. مردنی چی بۆ خاتری خوا..؟! ئەوە چییە ئەو قسەیە من دەیکەم..؟! هەر ئەوە مابوو بیری لێ بکەمەوە.. ئەوەتا زیت و زیندووم.. ئەگەر ترس و گومان لێمبگەڕێن، لە هەموو کەسێ ئاسوودەترم.. هەمووی چەند مانگێکی دیکەشە، دەبم بە دایک و ئەو ترس و گومانەشم لە دڵدا نامێنێت.. ئەو دڵتێکهەڵاتن و ڕشانەوەی ئەمڕۆ جارێکی دیکە ئەو پرسیارە هیچوپووچەی بیر خستمەوە.. ئەو بوو جارێکی دی خستمیەوە گێژاوی بیرکردنەوە و خەیاڵی بەدفەڕ و بێ سەروبنەوە، ئەگینا زۆر باش بووم.. وابزانم هەموو ژنێک لە کاتی سکپڕییدا حاڵەتی وای بۆ دێت.. ئەوەندە هەیە ئەوەی من زیاد لە پێویست هەراسانی کردووم.. خۆ دەبێت ئاگام لە خۆم بێت، وەکو «ڕازاو»ی جوانەمەرگم لێ نەیەت.. ئەویش یادی بەخێر هەر زوو زوو بێزووی بە گۆشتی کۆترەوە دەکرد.. کۆتریش بە «ئاشتی» نەبووایە، بە هیچ کەسێکی دیکە ڕاو نەدەکرا.. ئەم بە فێڵێکی زۆر سەیر، کە کچان پێیان وابوو سیحرە، دەیگرتن.. هەردوو دەستی دەکرد بە دامێنی کراسەکەیەوە و لە یەخەیەوە دەریدەهێنان.. لە چاوترووکانێکدا دووانی بەم دەست و بەو دەستی دەگرت.. ئەو کاتانەی ئەم لەوێ نەبووایە، «ڕازاو» حاڵی پەرێشان بوو.. وەکو شێت جلەکانی لە بەر خۆی دادەکەنی و پەنجەکانی دەکرۆشت.. توند توند سەری بە دار و دیواردا دەکێشا و ئەوەندەی نەدەبرد دەبوورایەوە.. دوایی خوویێکی زۆر سەیری گرت.. کاتێ ئەم حاڵەتەی بۆ دەهات، منیشی لەگەڵ خۆیدا ڕووت دەکردەوە.. دەست و پەنجەی منیشی لەگەڵ هی خۆیدا دەکرۆشت.. دواجار بەوەشەوە نەوەستا، داوای لێ کردم لەسەر کورسیە بەرزەکەی ناوەڕاستی ژوورەکە دابنیشم و قاچەکانم شۆڕکەمەوە.. ئیتر ئەم بە زمان بنی پێم و پەنجەکانمی دەلستەوە.. سەرەتا ختووکەم پیادا هات و قاقام لێ دا.. ئەمیش لەوە تووڕە بوو:

ــ بە چی پێدەکەنی قۆندەرە..؟!

ــ چی بکەم ختووکەم دێت وەی..!!

ــ درۆ دەکەیت.. ختووکەت نایەت، بەڵکو لەزەت وات لێ دەکات ئاوا لە

قوولایی دڵتەوە پێبکەنیت.

ــ لەزەتی چی دادە..؟!

ــ لەزەتی زەلیلیی من.. تۆ لەزەت لەوە دەبینی، کە من بنی پێت دەلسمەوە.

هەموو جارێ لەگەڵ «ئاشتی» لێمان دەبوو بەشەڕ.. من پێم دەوت:

ــ بە کۆترەکانی تۆ مرد.

ئەو بەرپەرچی دەدامەوە و دەیوت:

ــ تۆ کوشتت.

ماوەیەک قسەمان بە یەکەوە نەدەکرد.. ئەو ڕۆژە ئاشتبووینەوە، کە «جانێت» لە بەردەم دایەرەی «نفووس و سەرژمێری»دا گڕی لە گیانی خۆی بەردا و بوو بە قەرەبرووت.

دوو ڕۆژ دوای ئەوە دایکت هات بۆ لات و شەو لات مایەوە.. لە تەکسیەکە دابەزی و خێرا و زۆر بەگەرمیەوە لە باوەشی گرتیت.. نە ماچێک و نە دووان و نە دە تینوویەتیان نەدەشکاند.. بەکوڵ دەگریا و تۆیشی هێنایە گریان.. فرمێسکەکانتان تێکەڵ بە یەکتر بوون و وەکو دوو پۆل قازی شووشەی ئاویی ورد ورد، لەمبەر و لەوبەر، بەرەو چەناگەتان ڕێچکەیان بەست.. لەوێ تێکەڵ بە یەکتر بوون و بۆ ناو سنگتان شۆڕبوونەوە.. دوایی کاتێ دەستتان لەیەکتر بەردا، ئەم جارێکی دیکەش سەری نووساندی بە سنگی خۆیەوە.. چەند ماچێکی تریشی کردیت و بە دەم گریانەوە پێی وتی:

ــ ئەمەش لەجیاتی باوکت و ڕۆشنای خوشکت.

ــ تووخوا دایکە ئەوە بۆچی ئەوان نەهاتوون..؟! خۆ خوانەخواستە شتێ نەبووە..!!

ئەم لە کاتێکدا بە کلینس چاوەکانی دەسڕی وتی:

ــ مەترسە ڕۆحەکەم هەموو لایەک ساغ و سەلامەتن.. باوکت ئەو ماوەیە زیاد لە پێویست سەر قاڵی ئیش و کاری دووکانە، ئەگینا زۆر حەزی دەکرد بێت لەگەڵمدا.

ــ ئەی ڕۆشنا..؟!

ــ ئەویش لەبەر خوێندنەکەی نەهات.

بۆ ئێوارەکەیشی بە جووتە چوون بۆ بازاڕ، وەکو دوو هاوڕێ قۆڵتان کردبوو بە قۆڵی یەکدا و پیاسەتان دەکرد.. لە بەردەم سینەمای «قادسیە»دا تووشی «بەختیار»ی هاوڕێت بوون و دایکتت پێی ناساند:

ــ ئەمەش دایکمە، جوانەی ناوە.

ئەم بە گەرمی تۆقەی لەگەڵدا کرد و بەسەرسوڕمانێکی تێکەڵ بە گاڵتەیەکی هاوڕێیانەوە وتی:

ــ چۆن ئەمە دایکتە..؟!

تۆ ڕووت لێی گرژ کرد:

ــ بۆچی ئاوا بە لاتەوە سەیرە..؟!

ئەم کەمێ تەریقبووەوە و پێی وتی:

ــ ببوورە ئاشنا، من مەبەستم ئەوە نەبوو.

ــ ئەی مەبەستت چی بوو..؟!

ــ وامزانی خوشکتە.

بۆئەوەی دڵی تۆ ئاشتکاتەوە و خۆیشی لەو هەڵوێستە ناخۆشە دەرباز بکات، بە پێکەنینێکەوە ئەمەشی بۆ زیاد کرد:

ــ بە شەرەفم هەر دەڵێی دووانەشن..!!

خێسەیەکت کرد و پێت وت:

ــ من ئەوەندە گەورە دیارم..؟!

ئەم ئەوەندەی تر تەریقبۆوە و ڕەنگوڕووی تەواو گۆڕا.. دایکت لەولاوە هەڵیدایە و بە پێکەنینێکەوە، کە زیاتر مەبەستی دەربازکردنی «بەختیار» بوو وتی:

ــ نەخێر، من مناڵ دیارم.. وا نییە کاک بەختیار..؟!

ئەم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و یەکێکی قووڵتری دایەوە.. ئینجا بە شەرمێکەوە وتی:

ــ بەڵێ، وایە.

ئەمەی وت و خواحافیزیی لێکردن.. تۆ لەمەوە سەرودڵت گیرا و لووتت لە دایکت کرد.. ئەم هەستی پێ کردیت و کاتێ لە ترافیکەکەی بەرامبەر ئۆرزدی

دەپەڕینەوە، لێی پرسیت:

ــ دەبینم بێ تاقەت بوویت لە قسەی ئەو کوڕە.. پێت ناخۆشە دایکت لە بەر چاوی خەڵک وەکو خۆت گەنج دیار بێت..؟!

ــ دایکە گیان تۆ بۆچی بە هەڵە لە من تێدەگەیت..؟! بڕوا بکە من لەوە سەغڵەت نەبووم، بەڵام ئەو کوڕە هەر خۆی زۆر چەنەبازە و چارەیم ناوێت.

ئەڵبەتە ڕاستت نەدەکرد و ئەویش زۆر چاک دەیزانی درۆ دەکەیت.. باشە تۆ بۆچی دڵت بەوە تەنگ دەبوو، کاتێ دایکتت ئاوا بە گەنجیی دەبینی..؟! نایزانی..؟! نا.. نا.. وانییە.. زۆر چاکی دەزانی.. بەڵام ئەوە گرنگ نییە.. ئیشێکی باشت کرد، کە قۆڵت کردەوە بە قۆڵیدا و سەیرێکی بەژن و باڵایت کرد، هاوکات سەرنجی چاوەکانیت دا و بە گاڵتەوە پێت وت:

ــ بە خوا ناهەقیان نییە بە خوشکمت بزانن، خۆ ئێستاش لە دەی وەکو من جوانتریت.. دەڵێی چی کوڕێکی قۆزت بۆ بدۆزمەوە..؟!

دەستی کرد بە پێکەنین و وتی:

ــ کچی خۆمیت و دڵت وەکو دڵی خۆم پاکە، وەکو من لەوپەڕی تووڕەییدا گاڵتەی خۆت دەکەیت.

ــ بەڵام دایکە حەز ناکەم وا بزانی لەوە تووڕە بووم، کە.....

ــ دەزانم.. دەزانم بە قوربانی باڵات بم.. تۆ بڵێی نەزانم..؟!

دایکت دڵی ڕەنجابوو، بەڵام بەسەر خۆی نەدەهێنا و نەیدەویست تۆش سەغڵەت بکات.. بەوەدا دەتزانی، کە پێت وت:

ــ دایکە ئەو شەقامەی ئەوسەر پێی دەڵێن «شەقامی کچان»، زۆر خۆشە، دەڵێی چی بچین لەوێش هەندێ پیاسە بکەین..؟!

ئەم کەمێ بە بێزارییەوە وتی:

ــ زۆر ماندوو بووم ئاشنا گیان.. ناتوانم.

کاتێ گەڕانەوە ژوورەکەش، خێرا خۆی گۆڕی و چوو لەسەر کۆنە جێگاکەی «ڕازاو»ی جوانەمەرگدا پاڵکەوت.. هەر جارێ ئاوا زوو بچووایەتە سەر جێگا، دەتزانی دڵی لە یەکێ زویر بووە.. کاتێ «ئاشتی» هاتەوە، ئەم خەوی لێ کەوتبوو.. «ئاشتی» لە هەیوانەکەوە بەپەلە پێڵاوە ڕەشەکانی دادەکەنی،

دەیویست چی زووترە خۆی بگەینێتە ژوورەوە و دایکت ببینێت:

ــ بەختیار دەڵێ دایکت هاتووە.. کوا لە کوێیە..؟!

بە تووڕەییەوە پێت وت:

ــ ئەوە تۆ کەی فێری ئەوە دەبیت بە دەنگی نزم قسە بکەیت..؟!

ئەم تەواو تەریقبووەوە و لە شوێنی خۆیەوە وشک بوو.. بە حەپەساوییەوە وتی:

ــ چی بووە..؟! بۆچی ئاوا تووڕە بوویت..؟!

ــ ئەی نازانی دایکم نووستووە..؟!

ــ نووستووە، نەنووستووە، چاوی دەرێ لەگەڵ هی تۆش.

ــ ئەوە لەگەڵ کێتە هەی بەڕەڵڵا..؟!

ــ لەگەڵ تۆمە.. بە گۆڕی ئەو باوکەم دەم هەڵێنیتەوە، هەر ئێستا هەردووکتان تا سەری کۆڵان بە تیتک ڕادەکێشم.

ــ چاوحیزی هیچوپووچ، دەڵێی نێرەکوڕی بەم درەنگی شەوە....

ــ درەنگی شەو نییە، بەڵام ئێوە خەڵەفاون و شەو و ڕۆژتان لێ بووە بەیەک.. ئەم شارە سەراپا بگەڕێی، دەبەنگێکی دی نادۆزیتەوە، ئاوا بەم ئێوارەیە نووستبێت.. هێشتا کۆترەکێوی نەچوونەتەوە کولانەکانیان هەی گەوج و نەفامینە.

ــ بەڕاست ئاشتی بە قسەی کۆتر، دەزانی ئەمشەو سەر دیوارەکەی ئەملا و پەنجەرەی باڵکۆنەکە پڕیەتی لە کۆتر..؟!

ــ وانەڵێی..؟!

ــ ئەی کە هاتیتەوە، سەیرت نەکرد..؟!

ــ بە خوا هاتنی دایکت هەموو شتێکی لە بیر بردمەوە.. ئەگەر دەزانی، کاتێ بەختیار پێی وتم لە شەقامی دەواسە دیومن، چۆن لە خۆشیا لە شەقامی حەلەبەوە تا ئەوێ ڕامکردووە، ڕەنگە باوەڕ نەکەیت.. ئەو دوو کوڕەم بینی، کە زۆر لە یەکتر دەچن و هەمیشە بە یەکەوەن، عەزیز حەسەن مەولان و کاروان عومەر کاکەسوور، لێیان پرسیم: ئەوە چییتە ئاوا ڕادەکەیت..؟! پێم وتن: لە ئاشنا و دایکی دەگەڕێم، نەتاندیون..؟! وتیان: نەء.. بەڕاست ئەوە چییتان

لێهات..؟!

ئەمەی وت و بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بکات، هات لەسەر سەری دایکت وەستا و لێی ڕاما.. ئینجا بە سووکی ناوچەوانی ماچ کرد و وتی:

ــ چەند لە تۆ دەچێت ئاشنا..!!

ــ ئەی چۆن..؟! دایکم نییە..؟!

ــ بەختیار ڕاست دەکات، هەر دەڵێی دووانەن..!!

ــ ناوی ئەو هەتیوەم لا مەهێنە.. بە دەست خۆم نییە چارەیم ناوێت.

سەیرێکی کردیت و سەری بادا.. لەسەر کورسییە ڕەشەکە دانیشت و گۆرەوییە سپییەکانی داکەند.. هەردووکیانی بە یەکەوە لوولکردن و بۆ پشت دەرگا ڕەشەکەی هەڵدان:

ــ ئەرێ ئاشنا گیان هیچ هەیە بیخۆم..؟!

ــ بە قوربان ئێمەش تۆزێ لە پێش تۆوە گەیشتین.. خۆشمان بێ تۆ ناخۆش لە دەرەوە نانمان خوارد.. بەڵام تۆ ماندوویت، دانیشە و پشووێک بدە، هەر ئێستا شتێکت بۆ ئامادە دەکەم.

ــ ئەیەڕۆ ئاشنا گیان تۆ لە من ماندووتریت.. بەساقەت بم عەزیەتی خۆت مەدە.

ــ دەبڕۆ دوو کۆتر لەسەر تاقی دەرەوەی پەنجەرەکە بێنە و خۆم بۆتیان ئاوەڕووت دەکەمەوە، هەر خۆشم بۆتیان لێدەنێم.

ــ هەر ئێستا دەچم.

ئەمەی وت و ڕایکردە دەرەوە.. ئەم هەمیشە، کە هەڵوێستێکی سەیر و کتوپڕی لێ دەبینیت، بە پرسیار هەراسانی دەکردیت و دەیویست بە هەر شێوەیەک بێت بگاتە بنجوبنەوانی مەسەلەکەوە، کەچی ئەمەی بە لاوە سەیر نەبوو، تۆ ئەو هەموو کاتە لەگەڵیدا دەتکرد بە شەڕ و قڕە لەسەر ئەوەی ملی کۆترەکانی هەڵدەکێشا، تەنانەت کاتێ «ڕازاو»یش بێزووی پێوە دەکردن، ڕازیی نەدەبووی بۆی بگرێت، کەچی ئەوجارە خۆت داوات لێی کرد بچێت بیانگرێت و هیچ وا خۆی پیشان نەدایت بە لایەوە سەیرە، بەڵام کاتێ کۆترەکانی هێنا و لە پەلەپەلیا سەری بەر قەراغی دەرگا کەوت.. بەریکەوت و

خوێن بە لا ڕوومەتیدا هاتە خوارەوە، شێت و هار بوو.. ناهەقیشی نەبوو زۆر بە توندی بەریکەوت و چووە شارای مەرگەوە.. بە پەڕ و باڵی کۆترەکانی دەستی خوێنەکەی دەسڕی و جنێوی ناشیرینی پێ دەدان.. لە چاوتروکانێکدا کۆترەکانی بە خوێن سوور کرد.. تۆ لەفافێکی سپی و هەندێ لۆکەت لە چەکمەجەی مێزەکەدا دەرهێنا و شووشە عەترە سوورەکەی ناو جانتا ڕەشەکەی دایکتت بەسەردا قلْپکردنەوە.. هەر خێرا لۆکەکەت خستە سەر برینەکەی و ئەم هاواری لێ بەرزبووەوە:

ـ وای..!! قەحپەدایک ئەوە چییت لێ کرد، ئاوا ئازارەکەی زیاد بوو..؟!

ـ دان بە خۆتدا بگرە ئاشتی گیان، ئەمە عەترەکەی (دایکمە)، زۆر چاکە.

ـ لایبە نامەوێت.. ڕۆحی دەرهێنام.. وای..!! لایبە عەتری ئەو قەحپەیەم ناوێت.. ئای باوکە مردم.

ـ بە عەترەکەی (دایکم) ئازارەکەی زیاتر بوو..؟!

ـ زۆر.. وای..!!

ـ تۆ هاوار مەکە، نەوەکا (دایکم) خەبەری بێتەوە.. بۆ خۆی نووستووە.. ئەها چۆن چۆتە خەوی قووڵەوە..!!

ـ با خەبەری بێتەوە.. ئەو نەگبەتە چی بوو هێنات بۆ ئەم ژوورە..؟! وای..!!

ـ دە تۆ وا مەڵێ، با خەبەری نەبێتەوە.. دەترسم دوایی خەوی بزڕێت.

ـ خەوی دەزڕێ، چاوی دەرێ.. وای..!! هەموو خەتای ئەو بوو.

ـ خەتای (دایکم) بوو..؟!

ـ خەتای ئەو شتە پیسە بوو.. وای..!!

ـ ئاشتی کۆترەکانت دیوە لە ناو دەستتدا چۆن هەموو گیانیان خوێناویی بووە..؟!

ـ ئاخر..!! ڕاست دەکەیت..!!

ـ دەی بزانم دەزانی ئێستا لەچی دەچن..؟!

ـ نازانم.

ـ نازانیت..؟! دەی باشە لە ژوورەکەدا چاو بگێڕە، بزانە لەچی دەچن.

ـ نازانم، تۆ پێم بڵێ.

ــ له (دایکم) دەچن.. تۆ سەیری ئەو ماکسیە سوورەی (دایکم) بکە، دەڵێی خوێنی سەر پەڕ و باڵی کۆترەکانە.. کۆترەکان لە (دایکم) دەچن وانییە..؟!

ــ زۆر نا.

ــ دە تۆ چاوت خێل بکە و لێیان بڕوانە، بزانە چەند لە کۆترەکان دەچێت.

ــ وایە..!!

ــ ئێستاش هەست بە ئازار دەکەیت..؟

ــ زۆر... ئەوە تۆ چی دەکەیت..؟!

ــ بەم لەفافە سپیە سەرت دەبەستم.

ــ حەز ناکەم ئەو لەفافە بەسەر ئەو قژە ڕەشەمەوە ببینم.

ــ مەترسە ئێستا خوێنەکەی پیادا پەرش دەبێتەوە و وەکو کراسەکەی (دایکم)ی لێ دێت.

ــ ئەوە بۆچی کاتێ باسی کراسەکەی دایکت دەکەیت، ئاوا دەلەرزیت و زمانت تەتەڵە دەکات..؟! دەشەپۆکێیت و ڕەنگت هەڵدەبزڕکێت..؟!

ــ لەبەرئەوە نییە ئاشتی گیان، بەخوا لەبەرئەوە نییە، بەڵام من کاتێ خوێن دەبینم، دەشڵەژێم.. کراسەکەی (دایکیشم) زۆر لە خوێن دەچێت.. ئەی تووخوا وانییە..؟!

ــ حەز ناکەم تۆ ئاوا بە ترس و لەرزەوە قسەم لەگەڵدا بکەیت.. هەر دەڵێی شتێک ڕووی داوە و من نایزانم.

ــ هیچ ڕووی نەداوە ئاشتی گیان، بە خوا هیچ ڕووی نەداوە.. ئەوەتا من لە بەرامبەرت وەستاوم و (دایکیشم) بۆ خۆی نووستووە.. بڕوا بکە هیچ نەبووە.

ــ دەزانم.. دەزانم، بەڵام تۆ بۆچی من دەترسێنیت..؟!

ــ تۆ خۆت دەترسی.. بۆیە دەترسیت، چونکە ئەمشەوماڵەکە چۆڵە، ئەوانی ژوورەکانی تر سەفەریان کردووە.. دەزانی ئێستا هەر ئەو سێیەمانین و (دایکیشم) بۆ خۆی نووستووە..؟! نووستووش لە شوێنێکی ئاوادا وەکو نەبوو وایە ئاشتی.. ئا.. ئا.. وەکو نەبوو وایە.. ئەی وانییە..؟! ئینجا (دایکم) خەویشی زۆر قورسە دەزانی..؟!

ــ خەوی زۆر قورسە..؟!

ـ ئا.. ئا.. خـەوی زۆر قـورسـە.. پێم بڵـێ تۆ کـەی سـەری کـۆترەکـان هەڵدەکێشیت..؟!

ـ نازانم.. من زۆر دەترسم.. دیوتە هەمـوو گیـانم دەلەرزێت..؟! هـەر دەڵێی شتێک ڕووی داوە و من نایزانم.

ـ مەترسە گوڵم.. مەترسە.

ـ ئەو کـۆترانەم لێ بگرە، من ئیـتر ناوێرم بیانگرم بە دەسـتـەوە.. وای..!! ئاشنا زۆر دەترسم.. تووخوا هیچ شتێ نەبووە..؟!

باوەڕم نەدەکرد بتـوانی کـۆترە خـوێناوییـەکـان بەو دەسـتـە لەرزۆکـانەت بگریت.. کـەچی ئازا ئازا هەردووکـیـانت بەم دەست و بەو دەست گـرت و بە پەنجەکانت هەستت بە دڵەکوتێیان دەکرد:

ـ تۆ لە ترسـا نیـیـە گـیـانت دەلەرزێت، بەڵکو هی ئەو خـوێنـە بوو، کـە لەسـەرتەوە هات.. خـەتای منیـشی تیـابوو، نەدەبووایە بەو عـەترەی (دایکم) بیـبـرژێنمـەوە.. عـەترەکـە ئێـجگار ئازاری پێ گەیاندیت وانیـیـە چاوەکـەم..؟! خەتای عەترەکەی (دایکم) بوو.. وانییە..؟!

ـ نازانم نا.. من زۆر دەترسم زۆر.. ئەوە خوێنی منە بە دەستی تۆوە..؟!

ـ ئاخر بە پەڕ و باڵی کۆترەکانەوە بوو، دەستی منیشی سوور کرد.

ـ وابزانم شتێ ڕووی داوە و من نایزانم.. ئاشنا گیان بە سووکی تاکێکی پەنجەرەکە بکەرەوە و کۆترەکان بەڕەڵلاکە.

ـ نابێت بە قوربان.. نابێت.

ـ بۆ نابێت..؟! تووخوا بۆ نابێت..؟!

ـ ئەی نابینیت هەمـوو گیانیـان خوێناوییە..؟! خوێنی تۆ پەڕی باڵەکانیـانی بە یەکـەوە نووسـاندوون، ئێـسـتـا ئەگـەر بەڕەڵلاشـیـان بکەم، ناتوانن بفـڕن و سنگیـان دەکـەوێتـە سـەر کـاشـیـە ڕەقـەکـانی حـەوشـەکـەوە و پشـیلە ڕەشـە چاوسپییەکە بە ئاسانی هەردووکیان دەخوات.

ـ دەتۆ بەڕەڵلایان بکە، بەشکو بفڕن.

ـ نێـرەبدۆشـەم لەگـەڵدا مـەکـە، تازە نافـڕن.. پێش هەمـوو شـتێ شـەوە، ئەوانیش کـۆترن، شـەمشـەمـەکوێرە نین.. سـیـماشـیـان تەواو گۆڕاوە و ئیـتر

ناتوانن لەگەڵ پۆلە کۆترەکانی تردا بژین.

ــ دەسا من ناتوانم لە ژوورێکدا بنووم، ئەو کۆترە خوێناویانەی تیا بێت.

ــ دەڵێی چی تەختی نووستنەکانمان جووت بکەین، بۆ ئەوەی تۆ لە نێوان من و (دایکم)دا بنوویت..؟!

ــ وای..!! تووخوا ئاشنا گیان دەترسم.. دە تۆ هەڵیاندە حەوشەکەوە، قەیناکا با پشیلەکە بیانخوات.

ــ وا باشترە سەریان هەڵبکێشیت، بۆئەوەی کەمتر ئازار بچێژن.

ــ بڕوا بکە من ناوێرم بیانگرم بە دەستەوە.. تووخوا لە پەنجەرەکەوە هەڵیاندە دەرەوە.

ــ ئەی ئەگەر هەڵیان نەدەمە دەرەوە، چی دەکەیت..؟!

ــ وەی..!! بە قوربانت بم ئاوا قسەم لەگەڵدا مەکە، دەترسم.. وا دەزانم شتێ بووە و من لێی بێئاگام.. دە تووخوا بەرەڵلایانکە و دەستەکانیشت بشۆ، با چیتر خوێنی خۆمیان بەسەرەوە نەبینم.

وێنەی مشکێکی ترساو و زارەترەک، خۆی خزاندبووە کونجێکەوە و بە سەری شکاوەوە هەڵدەلەرزی.. ئەوە یەکەمجار بوو کەسێ ببینیت بەڕاستیی لێت بترسێت.. چ هەستێکی سەیر بوو خزایە گیانتەوە، ئاوا بارگە و بارخانەی ترسی کەڵەکەبووی ئەو هەمووساڵەی وەکو ڕەشماڵی قەرەجەکانی قەراغ شار، لە دڵتدا پێچایەوە و بەدەری نا.. ئەوە چ پەیوەندیەکی سەیر و سەمەرە و شاراوە لە نێوان ترسی ئەم و ڕقی تۆدا هەبوو..؟! بۆچی پەییت بەو نهێنییە نەدەبرد..؟! ئەی چ پەیوەندییەک لە نێوان ڕق و ئەو جورئەتەدا هەبوو، کە لەپڕ بە ناو دەمارەکانتدا گەڕا و بە ئاسانی هەستت پێی دەکرد..؟! ئەم دەترسا و تۆ غیرەت دەیگرتی.. ئەم هەڵدەلەرزی و تۆ دەمارەکانت گرژ دەبوون.. تا تینت تێدا بوو کۆترەکانت لە ناو دەستەکانتدا گوشی و سک و سنگیانت بە یەکەوە نووساندن.. ڕیخۆڵە و هەناویانت بە فلیقاوەیی لە کۆمیانەوە هێنانە دەرێ، کەچی گوێت لە دەنگیان نەبوو.. وردە وردە ملیان لار و دەنووکیان بە سستی دەکردەوە، تا لە جووڵە کەوتن و بەملا و بەولادا سەریان شۆڕبووەوە.. ئینجا زانیت کۆترەکان بەبێ دەنگ و بێ پەلەقاژە، بەبێ

هەست و خوست، زۆریش بە ئەدەب و گوێڕایەڵانە دەمرن.. چەند لەو خەونانەی منداڵیـــیت دەچوو، کـــاتێ دەســـتت هەڵدەبڕی و پەڵەهەورێکی ئەوەندەی کۆترەکێویەکانی سەربانی قوتابخانەکەتانت دادەگرتە خوارەوە.. نەرم نەرم وەکو پەشمەک و زۆر زۆر شێدار وەکو پێستی بۆقەکانی باخی گڵکەند.. سەرنجت دەدان و قەستت دەکرد بیانجوویت، کەچی وات نەدەکرد و لە ناو مستتدا دەتگوشین.. دەتگوشین و ئاوت لێ دەهێنان.. هەندێ جار لاپەڕەی کتێبەکانتت پێ تەڕدەکردن، هەندێ جاریش بە دزییەوە دەتتکاندنە پشتملی کچانی پۆلەکەت، پشتیان دەتەزی و لە پێشدا هەر ئەوەندە دەما بە تاسدا بچن، دەمیان بستێک دەکردەوە و بەحاڵ فریای هەناسەوەرگرتن دەکەوتن، ئینجا هاواریان لێ بەرزدەبووەوە و دەیانقریشکاند.. هەر جارێ لە دوای ئەو خەونانە خەبەرت دەبووەوە، پەنجە باریک و تەزیوەکانت لە ناو دەمتدا دەبینی.. بەقەدەر یەک دنیا حەزت دەکرد بەو شەوەڕەشە بچیتە حەوشەکەتانەوە و پەڵەهەورێکی ڕەشی ئەوەندەی گۆرەویە سپیەکانت بهێنیت.. بەسەر دەموچاو و سەر سنگی «ڕۆشنا»دا، بتکێنیت، کە لەسەر تەختە سپیەکەی تەنیشتتەوە نووستبوو، بەشکو بەدەم هاوار و زریکە زریک خەبەری بێتەوە و گەشکە بیگرێت.. زیرە بکات و بۆ خۆی شێت بێت، بەڵام نەتدەوێرا لە ترسی پشیلە ڕەشە چاوسپیەکەی حەوشە دوو پێت بخەیتە دەرەوە.. ئەوسا دوای خەونەکان واتدەزانی بەڕاستی دەتوانی وەکو نانی تیری پارچە پارچەی بچووک لە هەورەکان بکەیتەوە.. ئای..!! لەو ئەقڵە ساکار و کاڵوکرچەی، کە هەتبوو..!! چمکی پەردە سپیەکەت بە سووکی و زۆر زۆر بە ترسەوە لەسەر ڕووی پەنجەرە ڕەشەکەدا لادەدا و پشیلە ڕەشەکەت دەبینی، چاوە سپیەکانی دەبریسکانەوە و کلکە ئەستوورەکەی بادەدا.. بایدەدا و دەیخستەوە ناو گەڵیەوە.. ئیتر لە ترسا بە سووکی و بە لەرزەلەرزە تەختی نووستنەکەتت لەگەڵ ئەوەی «ڕۆشنا»دا جووت دەکرد و خۆت دەخزاندە باوەشیەوە.. بە سووکی، بەبێ ئەوەی بهێڵیت خەبەری بێتەوە، دەستیت هەڵدەبڕی و دەتخستە ملتەوە.. بەیانی کاتێ دایکت دەهات بۆ قوتابخانە خەبەرتان بکاتەوە و هەردووکتانی بەسەر جێگاکەوە دەبینی، دەیوت:

ــ بەساقەی جووتە خوشک بم، بزانە چۆن دەستیان لە ملی یەکتر کردووە و نووستوون..!!

لە خۆشیا لە ناوەڕاستی هەردووکتانەوە پاڵدەکەوت و دەستی دەخستە ژێر سەرتانەوە.. تێر تێر ماچی دەکردن و بە خۆیەوەی دەنووساندن.. دوایی ڕووی دەکردە تۆوە، ئاخر تۆ دەسپێشکەریی ئەو هەستی خۆشەویستیەت کردبوو، پێی دەوتی:

ــ کچی خۆمیت و وەکو خۆم دڵت پاکە و پڕیەتی لە خۆشەویستی.

«ڕۆشنا» وەکو کای کۆن گڕی دەگرت و دەیپرسی:

ــ ئەی من دایکە..؟!

ــ تۆش ڕۆشنایی چاوم، تۆش دایکە بە قوربانت بێت.

ــ بەڵام هەر من دێم بۆ سەر جێگای تۆ، تۆ هیچ نایەیت.

بەو منداڵییەی خۆت دەتزانی درۆ بکەیت و ڕاستیی بشاریتەوە.. ئەگەر پشیلە ڕەشەکە نەبووایە، تۆ ئاوا تا بەیانی و بەکوڵ کچی «یوسف»ی دارتاشت نەدەکردە باوەش و سەرت لە دایکیشت تێکنەدەدا.. بۆ هەر لە دایکت.. زۆر جار لە خۆشت.. زۆر سەیر بوو.. خۆ هەندێ جار هەر بەڕاستیی هەستت دەکرد خۆشتدەوێت.. هەر لە خۆتەوە بەزەییت پێدا دەهاتەوە و پڕبەدڵ دەتویست دەست بە قژە زەرد و خاوەکەیدا بهێنیت و تێر تێر بۆی بگریت.. بۆی بگریت و لەجیاتی وردەبارانی تەزیوی پەڵەهەورە ڕەشەکانی ناو دەستت، فرمێسکی گەرمی چاوە سەوزەکانتی داباریێنیتە سەر دەموچاوی.. لەگەڵ دەنگی گریانی پڕ لە خۆشەویستی و سۆز بە ئاگای بێنیتەوە.. جارێکیان لە دایکتت پرسی:

ــ دایکە ئەوە بۆچی کاتێ یەکێ ببینم نووستووە، زۆر بەزەییم پیایدا دێتەوە..؟!

ئەم توند توند لە باوەشی گرتیت و تێر تێر ئەملا و ئەولای ماچ کردیت.. ئینجا پێی وتی:

ــ گوڵەکەی دایە هەر پرسیاری ئاوا جوانم لێ بکە.

کەچی وەڵامیشی نەدایتەوە.. ئاخر لەوە نەدەچوو بیزانێت.. ئەم لە

قـوتابخـانەش هـەر وابوو، کـاتێ یەکێ پرسـیـارێکی لێ دەکـرد و نەیدەزانی وەڵامـەکـەی بداتەوە، تا زەنگەکـە لێی دەدا هـەر ئافـەرین و سـوپاسی دەکـرد، بەبێ ئەوەی بەلای وەڵامەکەیدا بچێت....

کاتێ کەمێ هەراش بوویت و ئەو ڕۆژانەت بیردەکەوتەوە، لە خەیاڵی خۆتدا دەتهێنان و دەتبردن، بەشکو شتێکیان لێ هەڵکرێنیت و ئەنجامێکت دەسگیر بێت.. جـارێکیـان تازە مـەمکت کـردبوو، لە سـەربانەکـەی خـۆتان جلە شـۆڕاوەکانت لەسەر تەنافەکە هەڵدەخست و سەیری «تەنیا»ت دەکرد، کە لە سـەر کـورسیی ناوەڕاستی باخـەکەی خۆیاندا دانیشـتبوو، بە کەمـانەکەی ئاوازی «وەرە لـە سـەربان بێـرە خـوارەوە»ی دەژەنی، جـار جـاریش چاوە ڕەشـەکانی لە تۆ دادەگرت و مـاچی بۆ هەڵدەدایت.. لە خۆشیا گیانت تەزووی پیـادا دەهـات.. هەسـتت دەکـرد گـەورە بوویت و کـوڕانی گـەڕەک چاوت تێ دەبڕن.. کەچی نەتزانی بۆ لچێکت هەڵقورتاند و بە خۆتت وت: «خۆشەویستی بەبێ ترس نایەتە کـایەوە.. ترس وا لە مـرۆڤ دەکـات پەنا بـۆ خـۆشـەویسـتی بەرێت».. کچێ هەی سەرت بتاشن، تۆ ئەو کاتە هەر دوانزدە ساڵێک دەبوویت و نەدەبوویت، ئەوە چۆن ئەقـڵت بەوەدا دەشکا..؟! دە ئێـسـتـر بزانە لەپاڵ ئەو پرسیارە شووم و بێتام و چێژانەوە، وتە و حیکمەتی جوانیشت هەیە.. دواتر ئەو دوو ڕسـتـەیەت دەکـردە دەسکەلا و دیمەنـەکـەت پێ دەهـێنانەوە بـەرچاو.. جلەشـۆڕاوەکـان.. هەتاوە نە زۆر گـەرم و نـە زۆر کـەمـتـینەکـەی ئەو بەهارە.. حـەوشـە و باخـەکـەی مـاڵی «تەنیـا».. کـەمـانجە ئارام و لەزەتبـەخشـەکە.. چاوە جـوانـەکـانی «تەنیـا».. مـاچە هـەواییـەکـانی.. زۆری تریش.. زۆری تریش.. هـەر جـارێ نهێنیـەکی تازەت تێدا دەدۆزیەوە.. ڕۆژێکیـان زۆر ئازایـانە، تۆ بڵێ زۆر ڕووقـایمانـە زاتت کـرد و لـە دڵی خـۆتدا وتـت: «ئەو ڕۆژەی ترس نـامـێنێت، خـۆشـەویسـتـیـیش کـۆتایی پێ دێت».. کـەمێ ڕامـایت و وتت: « جـا کـە ترس نەمێنێت، چ پێویسـتیمان بە خۆشەویستیی دەبێت..؟!».. هەر دەتوت تاوانێکی گەورەت کردووە، هـەمـوو گیانت دەلەرزی و مـووچڕکەی پێدا دەهات.. ئینجا زانیت ئەو کاتانەی دایکت دەهات لە نێوانتاندا پاڵدەکەوت و ماچی دەکردن، لە خـۆشـەویسـتـیـەوە نەبوو، بەڵکو ترسـێک پاڵی پێـوەدەنا.. ترسـێک، وەکـو ئەو

ترسەی، کە تۆی ناچار دەکرد «ڕۆشنا»ت خۆشبوێت و بەزەییت پێیدا بێتەوە، بەڵام ئەو ترسە چی بوو..؟! نەتدەزانی.. ئێستاش نایزانی.. تەنها ئەوەندەت دەزانی، کە پەیوەندیەکی بەتین و تێکچڕژاو لە نێوان و ترس و خۆشەویستییدا هەیە، بەڵام نە لە جۆری ئەو پەیوەندیە دەگەیشتیت و نە دەشتوانی لەیەکیان جیابکەیتەوە.. هەر جارێ بیرت لە جیاکردنەوەی ترس و خۆشەویستی دەکردەوە، ئەو خووەت بە بیر دەکەوتەوە، کە بە منداڵیی گرتبووت.. خووی شکاندنی هەڵماتە ڕەنگاوڕەنگەکان.. دانە دانە دەتخستنە سەر بەردێکی زل و بە یەکێکی تر تێیان دەکەوتیت.. دەتویست ڕەنگەکانی ناویان لە قاوغەکانیان جوودا بکەیتەوە.. هەموویانت وردوخاش دەکردن و هیچت دەسگیر نەدەبوو.. ئەنجام هەر ئەنجام بوو، کەچی هەر وازیشت نەدەهێنا.. دەزانی دیمەنێکی جوان و چەندیش بڵێی دڵگیر بوو، کاتێ وردە هەڵماتە شکاوەکان بەو ناوەدا بڵاودەبوونەوە و لە بەرتیشکی ڕۆژدا دەدرەوشانەوە..؟! کاتێ کەمێک چاوت خێل دەکرد و لێیان ڕادەمایت، واتدەزانی مافووری پڕ لە نەخش و نیگارت داخستووە.. لە خۆشیا هەموو گیانت مووچڕکی پێدا دەهات و قەستت دەکرد وەکو مافوورەکەی ماڵی نەنکت، کە بە وێنەی قاز نەخشا بوو و ڕۆژانی جەژن دایاندەخست، خۆتی هەڵدەیتە سەر، قیرۆسیا لەوەی هەموو گیانت یەک پارچە دەبوو بە خەڵتانی خوێن.. هەر ئەمەش بوو حەزی شکاندنی هەڵماتەکانی لا تازە دەکردیتەوە.. تۆ بەڕاستیی گەرەکت بوو کامیان لە کامیان جیا بکەیتەوە..؟! مەبەستم ئەوەیە کامیانت دەویست..؟! قاوغە سپییە ئاوییەکان، یاخوود ناوەڕۆکە ڕەنگاوڕەنگەکان..؟! نایزانی..؟! ئەو کاتەش نەتدەزانی، بەڵام ئەوەت بۆ ڕوون بووەوە، کە قاوغ و کاکڵی هەڵمات ئەوەندە تێکەڵ و تێکچڕژاون، زۆر زەحمەتە لەیەکتر جیا بکرێنەوە.. هەر لەتێکی بچکۆلەت دەگرت بەدەستەوە، لە قاوغ و کاکڵ پێکهاتبوو.. ئەوەیان ڕاستە، بەڵام خۆ پارچەکان خرێتیەکان نەدەما و بۆ شێوەی دیکە دەگۆڕان.. کەواتە تۆ هیچی لێ حاڵیی نەبوویت.. ئێستاش زۆر بەئاسانی و بەبێ ترس و دوودڵی دەتوانیت بڵێی: هەر گەرد و وردکەیەکی خۆشەویستی بخەیتە ناو لەپی دەستتەوە و لێی ورد بیتەوە....... بەڵام بەچی دەچێت، کە نەتوانی بڵێی: ئەمەیان ترسە و

ئەوەیان خۆشەویستی.. ئەوەندە هەبوو دەتتوانی بڵێیت لەتەهەڵماتەکان، کاتێ تیشکی ڕۆژ لێی دەدان و بریقەوباقی پێ دەخستن، لە ئەستێرە دەچوون و هی ئەوەبوون بۆ هەر یەکێکیان ناوێ بدۆزیتەوە.... جاران کە منداڵ بووم و شەوانی هاوین لە سەربان، لەسەر پشت ڕادەکشام، بەزەییم بە ئاسماندا دەهاتەوە، کە ئەو هەمووو چاوەی هەیە و ناتوانێت تێکرا لێکیانبنێت.. لێکیانبنێت و بۆ خۆی وەکو دایکم و «یوسف» چۆن لە سەربانەکەی سەرووی ئێمەوە، لە ناو کوللە سپیەکەدا بەجووتە نووستوون، ئاوا لە باوەشی نەرمی شەودا بنوێت و پشوو بدات.. «ڕۆشنا»ش لە تەنیشت منەوە، بەڵام لەسەر دەم نووستبوو.. ئەم چونکە لەسەر دەم پاڵدەکەوت، زوو خەوی لێ دەکەوت، بەڵام من کە هەمیشە هەر لەسەر پشت ڕادەکشام، تا درەنگ چاوەکانم وەکو چاوەکانی ئاسمان زیتەیان دەهات.. دەمووت: خۆر چاوی ڕۆژی ئاسمانە و ئەستێرەکانیش هی شەوین.. کاتێ ئەمان دادەخات، ئەویان هەڵدێنێت.. مانگیش ئەو چاوەیەتی، کە جار جار خۆی پێوە دەنوێنێ.. خەمی بێخەوی و ماندوویی ئاسمان دەبووە مۆتەکەی سەر سنگم و خەویان لە چاوانم تەرە دەکرد.. ئاخر بڵێ من، منی لەچاو ئاسمان هیچ، خەمم بۆی بخواردایە یان نا، چی پێ پێکدەهات.. زستانم چەند خۆشدەویست، کاتێ بە هەورە ڕەش و سپیە شێدارەکانی ئاسمانی دادەپۆشی و خەوی لێ دەخست..!! دواتر لەوەش کەوتمە گومانەوە و دەمووت: کێ دەڵێت نووستووە.. کێ ناڵێت لە ژێرەوە چاوەکانی ئەویش وەکو چاوەکانی من زیتەیان نایەت.. جارێکیان «ست کەوسەر»ی «ئاین» پرسی:

ــ جیاوازیی نێوان ئاسمان و زەوی چییە..؟!

هەر خێرا بەبێ ئەوەی دەستم هەڵبرم و مۆڵەت وەرگرم، وتم:

ــ ئاسمان هەمیشە بەئاگایە و زەوی هەمیشە نووستووە.

ئەم تفێکی خەستی کردە چاومەوە و بە ڕووێکی زۆر خۆشەوە وتی:

ــ ئاسمان پیرۆزە و زەوی بە نەفرەتکراوە.. ئاسمان لەسەر سەرمانە و شوێنی فریشتەکانە، زەوی لەژێر قاچەکانمانەوەیە و مرۆڤی پیس و دڵ پڕ لە گومانی لەسەر دەژی.

بەهارێکی درەنگ بوو، تازە لەسەربان دەنووستین.. ئەو شەوە کاتێ سەیری ئاسمان و چاوەکانیم دەکرد، شەرمم لە خۆم دەکردەوە.. بۆچی..؟! نازانم.. وابزانم لەبەرئەوە بوو، کە تا ئەو کاتە من نەمدەزانی ئاسمان ئەوەندە پیرۆز و گەورەیە، پێویستی بە سۆز و خۆشەویستیی منی بچکۆلە و هیچ لەبارنەبوودا نییە.. ئەو شەوە منیش وەکو «ڕۆشنا»ی خوشکم لەسەر دەم ڕاکشام، بەڵام وەکو ئەو خەوم لێ نەکەوت.. خەوی چی..؟! بیرم لە جیاوازیی نێوان ئاسمان و زەوی و مامۆستا و قوتابی دەکردەوە.. بیرم لە تفەکەی «ست کەوسەر» دەکردەوە.. زۆر سەیر بوو..!! خۆ ئەم بەبێ ئەوەی قسەکەی من سەغڵەتی بکات و لێم تووڕە بێت، ئەو تفەی لێ کردم.. وابزانم دەیویست من بیری لێ بکەمەوە و لە حیکمەتەکەی بگەم.. حیکمەتی تف.. تفی خەستوخۆڵ.. تفی مامۆستای بەڕێز و خۆشەویست لە قوتابیی لاسار و یاخی.. تفی گەورە لە بچووک.. تفی نەوەی کۆن لە نەوەی تازە.. تفی پیرۆزی دایکی میهرەبان لە کچی چەتوون.. تف لە سەرەوە بۆ خوارەوە.. تف.. تف.. تف.. تف.. تف.. تف.. خخخخخخخخخخخخخخخخ.. تفففففففففففففففف.. دڵم پڕ بوو.. گریام.. فرمێسکی دیکەم ڕشت.. سەرینەکەم، کە نەنکم بە پەڕی قاز بۆی کردبووم، بە ئەسرینەکانم خووساند.. بۆنی پەڕی قازەکان دەهات بە لووتمدا و بەزەییم بە قازی سەربڕاو و خۆم و زەویدا دەهاتەوە.. ئاسمانیشم هەر خۆشدەویست، بەڵام شەرمم لێی دەکرد.. وامدەزانی تاوانێکی گەورەم دەرهەق کردووە.. کاتێ لێی ڕادەمام، تەریقدەبوومەوە و سەرم دادەخست.. ئەوسا زەوییم دەبینی وەکو من سەری کزکردبوو.. ماوەیەکی زۆر هەر لەسەر دەم پاڵدەکەوتم، ئەگەرچی نەمدەتوانی و زەحمەت بوو، بەڵام زۆرم لە خۆم دەکرد.. ئینجا زانیم یاخیەکان لەسەر پشت و ڕوو لە ئاسمان، ئەوانی دیکە لەسەر دەم و ڕوو لە زەوی دەنوون.. من ئاسمانم خۆشدەویست و لێی یاخی نەبووم، بۆیە ڕووم تێیکردەوە و سووک سووک شەرمم لێی شکایەوە، بەڵام چیتر بەزەییم پێیدا نەدەهاتەوە.. نەخێر، ئینجا زانیم دەستەڵات لەوێوەیە.. هەمیشە چاوە داماو و گوناهەکانم تێدەبڕی و داوای بەزەییم لێی دەکرد.. بەشکو دوو ئەستێرەی بچکۆلە بچکۆلەی خۆیم بۆ بکات بە چاو و کاتێ دامخستن،

یان هەرکە بەو پەڵەهەورانەی لە خەونەکانمدا دامدەگرتنە خوارەوە، دامپۆشین، کەس نەتوانێت بمبینێت.. تەنها ئاسمانە، کاتێ چاوەکانی دادەخات، کەس ناتوانێت بیبینێت.. دواتر خووێکی سەیریشم گرت و تا ماوەیەکی زۆر بەرم نەدا.. کاتێ دەچوومە سەر جێگا، تا بیرم لە تفەکەی «ست کەوسەر» نەکردایەتەوە، خەوم لێ نەدەکەوت.. من هەر وابووم، هەمیشە خووی هیچوپووچم دەگرت.. وەکو خووی شکاندنی هەڵماتە ڕەنگاوڕەنگەکان.. واز لەویان هەر بێنە.. ڕۆژانە هەرچیم وەردەگرت، لە دووکانی سەر سووچەکە، هەڵماتم پێی دەکڕی و دەمشکاندن.. کچ و کوڕی گەڕەک تێکڕا گاڵتەیان پێ دەکردم، کاتێ دەیانبینی لەجیاتی مووروو و هەر شتێکی دیکەی کچانە، هەڵمات دەکڕم.. لەمەوە ناوی «ئاشنا کوڕانی»یان بە سەردا بڕیم، بەڵام مەحاڵ بوو ئاوا بە ئاسانی دەستی لێ هەڵگرم.. هەستم دەکرد ئەو پارەیەی ڕۆژانە وەریدەگرم، بەشی چەند دەقەیەکی ئەو خووەم ناکات.. ئیتر پەنجە بزێوەکانم لە گیرفانە تەنگەبەرەکاندا دەکوتا و شتێکیشم لەوێ دەست دەکەوت.. سەرەتا لە گیرفانی بچووکی «ڕۆشنا»وە دەستم پێ کرد.. زۆر لێزانانە دەستم دەخزاندە ناوی و پەنجاییەک، سەدییەک، روبعێکم تیادا دەردەهێنا.. دوایی قوتووە ڕەشەکەی «یوسف»م پێ زانی، کە لە سەر تاقەکەی لای سەرووی بۆفیە سپییەکەدا دانرابوو و پڕی بوو لە وردە.. کورسییەکەم ڕادەکێشایە ژێر قاچەکانمەوە و هەردوو چنگم پڕ دەکردن.. ئێوارەیەکیان، کاتێ دایکم و «شەرمن»ی پوورم لە مووبەقەکەدا خەریکی درووستکردنی محەلەبی و کێک بوون، بە هەلم زانی و خۆم گەیاندێ.. دەستم لە ناو قوتووەکەدا بوو، کاتێ دایکمم لێ پەیدا بوو.. هەر خێرا بەبێ چەندوچوون بە دەستە ئاردادوییەکانی قوتووە ڕەشەکەی لە دەستم وەرگرت و کێشای بە سەرمدا.. ئان و سات خوێن فیچقەی کرد.. بەر چاوم تاریک داهات و لەسەر کورسییەکەوە کەوتمە سەر کاشیە ڕەقەکانەوە.. ئەوە یەکەمجار بوو خوێن ببینم و نەبوورێمەوە.. دەستم بە سەرمەوە گرت و ڕامکردە هەیوانەکەوە.. لەوێ قاچم لە پێڵاوەکانی «یوسف»ـەوە هەڵنووتا و بەدەمما کەوتم.. پوورم و «ڕۆشنا» و «یوسف» لە ناوەڕاستی چیمەنەکەدا لە دەوری مێزەکە دانیشتبوون، هەر سەیریشیان

نەدەکردم.. دایکم بە پرتاوی لە ژوورەوە هاتە دەرەوە و بە تەنیشتمدا بەرەو مووبەقەکە چوو.. هەر خێرا مەحەلەبی و کێکەکەی هێنا و لەسەر مێزەکەی دانان.. لە تەنیشت «یوسف»ـەوە دانیشت و بە چەقۆ قازەکەی بە گوێزی هیندی لەسەر کێکەکەی نەخشاندبووی کرد بە چوار لەتەوە.. هەر لەتەی خستە سەر قاپێکی بچکۆلەوە و لە بەردەمی خۆی و ئەوانی دانان.. چوار قاپی مەحەلەبییش لە تەنیشتیانەوە و دەستیان بە خواردن کرد.. «رازیە»ی نەنکمم بینی عەبای بەسەرەوە بوو، لە دەرگای حەوشەدا وەستابوو.. پشتی لە ئێمە و رووی لە کۆڵان بوو.. وردە وردە لە بەر چاوم بچووکدەبووەوە.. بچووکبووەوە.. بچووکتربووەوە تا ئەوەندەی بوتڵە شیرێکی لێ مایەوە.. «ست ناسک»م بیردەکەوتەوە، کاتێ رۆژی پێشوو لە وانەی «نیگار»دا لێم تووڕە بوو، چونکە پێم وت:

ـ ژنی عەبابەسەر لە دواوە وەکو بوتڵی شیر وایە.

ئەم چاوی پەڕیە پشتی سەریەوە.. تا تینی تێدا بوو قژی ڕاکێشام و پێی وتم:

ـ بێئەدەب ئەوە چییە ئەو قسە ناشیرنانە..؟!

کچان دەستیان بە پێکەنین کرد و من تەریقبوومەوە.. دامە پرمەی گریان و ناوچەوانم خستە سەر مێزەکەی بەردەمم.. دوایی سەرم هەڵبڕی و بەدەم هەنسکی گریانەوە وتم:

ـ من دەڵێم ئەگەر وێنەی ژنێکی عەبابەسەر لە دواوە بکێشیت، وەکو وێنەی بوتڵی شیر دەردەچێت.

ـ هەی بێئەقڵ ژنی عەبابەسەر لە کوێ و بوتڵی شیر لە کوێ..!! ئەمیان گەورە و ئەویان بچووک..!! ئەمیان ڕەش و ئەویان سپی..!!

ـ ئاشنا لە کۆڵانیش هەر ئاوا قسەی بێتام و ناشیرین دەکات.

هەرکە «ساکار»ی چاودێری پۆل ئەمەی وت، «ڕۆشنا» خێرا پەلاماری قژی دا و پێی وت:

ـ قسە بە خوشکی من نەڵێی مەیموون.

«ست ناسک» هەردووکیانی کردە دەرەوە.. من لە پەنجەرەکەوە سەیرم

دەکردن، کاتێ لە ڕاڕەوەکەدا دەستیان نایە قژی یەکترەوە.. «ساکار» لەو گەورەتر بوو، ساڵێ لە پۆلی چوار و ساڵێ لە پێنجدا مابووەوە، بۆیە لەویش بەهێزتر بوو.. قژی «ڕۆشنا»ی گرت و سەرەتا پشتی بە دیوارەکەدا کێشا.. دواییش پاشقۆلی لێگرت و دای بەزەویدا.. ئینجا بە چڕنووک دەموچاوی ڕنییەوە و خستیە ژێر لەقە.. کاتێ بەڕێوەبەر بە فریای کەوت، دەموچاوی خوێنی لێ دەچۆڕایەوە.. زەنگەکە لێدرا و جانتاکەی هەڵگرت.. بە گریان و بە سەروگوێلاکی بریندارەوە گەڕایەوە ماڵ....

کاتێ نیوەڕۆ چوومەوە، دایکم لەسەر کورسیی ناوەڕاستی چیمەنەکە دانیشتبوو، «ڕۆشنا»شی وەکو منداڵی ساوا کردبووە باوەش.. هەرکە منی بینی، ئەمی لادا و بەرزەپێ هەستایەوە.. چاوەکانی ئاگریان دەهاویشت و بەرەو ڕووم هات.. نوقرچێکی توندی لە نەرمەی قۆڵم گرت، وای چەند ئێشا..!!
بە تووڕەییەوە پێی وتم:

ــ باشە بەهۆی تۆوە ئەو خوشکەت ئاوا دەموچاوی وێران بوو..؟!

ــ من بڵێم چی..؟!

ــ تۆ کەی واز لە قسەی ناشیرین دەهێنیت کەی..؟!

ئەمەی وت و چوو بۆ مووبەقەکە.. منیش لە داخا بەتوندی قژی «ڕۆشنا»م ڕاکێشا و پێم وت:

ــ تۆ نەبوویتایە دایکم نەیدەزانی من ئەو قسەیەم کردووە.. جارێکی تر ئاوا بکەیت، هەر خۆم دەزانم......

نەنکم لەپڕ ڕووی وەرگێڕا و سووک سووک و تەق تەق بە قاپقاپە سپییەکانیەوە بەرەو ناوەڕاستی حەوشەکەوە هات.. هات و لە ئاستی جانتا ڕەشەکەی قوتابخانەم، کە لە قەراغی باخەکەدا دانرابوو و زۆریش گەورە دەهاتە بەرچاوم، دانەویەوە.. بە پەنجە ڕەق و لەرزۆکەکانی زنجیرە سپییەکەی کردەوە و دەفتەری نیگارکێشانەکەمی تێدا دەرهێنا.. پەڕەکانی گەورە و ڕەش بوون، دەتوت لە وسمە گیراون.. پەڕەپەڕەی کرد و ناوەڕاستەکەی کردەوە.. وێنەی بوتڵەشیرێک لەسەر هەردوو لاپەڕەکەدا بە گەورەیی کێشرا بوون.. من کێشابووم، بەڵام بە بچووکی، نەک ئاوا بەو زلیە.. ئەی باشە چۆن ئاوا گەورە

کرابوون..؟! کێ بە ڕەنگی سپی بۆیەی کردبوون..؟! دەستەکانی پێدا دەهێنا و لەژێر لێویەوە وێرد و دووعای دەخوێند.. بەڵام چۆنی دەست پیادا دەهێنا..؟! هەروەکو دەست بە کێلی گۆڕەکەی باپیرمدا بهێنێت.. چەند دەترسام، کاتێ بە خاوخلیچکی سەری هەڵدەبڕی و چاوە تەپیو و ماندووەکانی دەبڕیە ئاسمان.. دەستە لەرزۆکەکانی دەکردنەوە و بە سستی لچ و لێوی ڕەقهەڵگەڕاوی بە یەکدا دەدا، گوایە بەدەم دووعاوە دەکڕووزێتەوە..!! چەند ناشیرین و دزێو دەهاتە بەر چاوم و چەندیش لێی دەترسام.. سیما و ڕوخساری تەواو گۆڕا بوو.. هیچ لەو ژنە جوان و ڕۆحسووکەی لەمەوپێش نەدەچوو.. زۆر پیر دیار بوو زۆر.. دەستەکانی چرچ چرچ و پەنجەکانی ڕەق و وشک.. خۆ جارانیش دەموچاوی کۆمەڵێ هێڵی کورت کورت و چاڵی کەمێ قووڵی تێدا بوو، بەڵام ئێجگار ئاوا نەبوو.. هەموو جارێ کە لێم دەپرسی:

ــ نەنە ئەوە بۆچی دەموچاوی تۆ ئاوا چرچ بووە..؟!

هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و دەیوت:

ــ کاتێ گەورەبوویت، دەزانیت.

سەیر بوو..!! من تا ئەم دواییەش باوەڕم نەدەکرد ڕۆژێ لە ڕۆژان وەکو ئەو پیر ببم و چاوم کز و پشتم کۆم و قژم سپی و پێستم چرچ بێت، هەروەکو چۆن باوەڕم نەدەکرد نەنکیشم وەکو من منداڵ و هەرزەکار و عازەب بووبێت.. چەندم بەلاوە سەیر بوو، کە هەموو جارێ باسی کچێنیی خۆی دەکرد، چۆن کوڕانی «سابوونکەران» ناوەکەیان لەسەر پشتی دەست و قۆڵ و باسکیان کوتیوە و دەستەخوشکەکانی بەخیلییان بە جوانیەکەی بردووە.. کاتێ وێنە ڕەشوسپییەکانی ئەو سەردەمەی خۆی پیشان دەدام، باوەڕم نەدەکرد ئەو بێت، کەچی سوێندی دەخوارد خۆیەتی.. قژە درێژ و خاوەکەی وەکو گەڵای تاقە دارخورماکەی گەڕەکی «باداوە»، لەملا و لەولاوە بەسەر ڕوومەتەکانیدا بۆ سەر سنگیەوە شۆڕبووبوونەوە و چاوەکانیشی هەر بە ڕاستیی دوو دەنک خورمای ڕەشی گەییو بوون.. وێنەکانی پیشان دەدام و نەشیدەهێشت من بیانگرم بە دەستمەوە.. خۆیشی بە پەنجەی دۆشاومژەی، بەڵام بە سووکی و زۆر زۆر بە پارێزەوە، نەوەکا پەلاویی ببن، ئاماژەی بە دەستە خوشکەکانی دەکرد و ناوی

یەکە بە یەکەیانی پێ دەوتم.. ئافتاو، نەخشین، خورشە، نوسرەت، ڕەعنا، ئاجەر.... هەرچەند ئاوای دەوت، چاوەکانی پڕ دەبوون لە فرمێسکی ورد ورد.. بە چمکی کراسە ڕەشەکەی دەیسڕین و بەدەم ئاخ و حەسرەتهەڵکێشانەوە دەیوت:

ــ نایەتەوە ئەو ڕۆژگارە ئاشنا گیان.. تازە نایەتەوە.

ئەم هەرچەند گوێی لە گۆرانیی «ڕازیە»ی «حەسەن زیرەک»یش دەگرت، زۆر خەفەتبارانە دەگریا و دەیوت:

ــ ئەم گۆرانیەی بەسەر مندا وتووە.. ئەگەر بە دیقەت گوێی لێ بگریت، هەست دەکەیت بە گریانەوە دەیڵێت.

ــ ئەی باشە نەنە بۆچی شووت بە حەسەن زیرەک نەکرد..؟! خۆ دەڵێن زۆر یەکترتان خۆشدەویست..!!

ــ باوکم ڕازیی نەبوو.. کاتێ هات بۆ داوام، پێی وت: تۆ چاوەشیت، دەتوانی لە بەر دەرگای حەوشەکەم گۆرانی بڵێیت، بەڵام ناتوانیت بێیتە ژوورەوە و ناماقووڵیی ئاوا بکەیت.

وێنەیەکی گەورەی «حەسەن زیرەک»ی لە جام گرتبوو و لە ژوورەکەی خۆی هەڵواسیبوو.. دەیان جار دایگرتبوو و ماچی کردبوو.. بە سنگیەوە نووساندبووی و لەپاڵ خۆیدا نواندبووی.. تا ئەو جارەی من قاچم کەوتە سەری و جامەکە وردوخاش بوو.. پارچە شکاوەکان چوون بە بنی پێمدا و سەر دۆشەگەکەیم لە خوێندا سوورکرد.. تا ئەو دۆشەگەم ئاوا نەدی، نەمدەزانی من ئەو هەموو خوێنەم لەبەر ڕۆیوە.. ئینجا زیاتر ترسام.. «ئاشتی» ئەوجارە ناهەقی نەبوو ئەوەندە دەترسا، کاتێ خوێنی سەری خۆی بەسەر دەستەکانی منەوە دەبینی.. داماوە چەند لێم پاڕایەوە بچم دەستەکانم بشۆم و بە قسەیم نەکرد.. کاتێ کۆترەکانی بە فلیقاوەیی لەناو دەستەکانمدا بینی، ئەوەندەی دیکە زیرەی کرد.. باشە بۆچی دەمویست خوێنی ئەو بەسەر دەستەکانمەوە وشکبێتەوە..؟! بۆچی کۆترە مرادەرەوەبووەکانم فڕێ نەدەدا..؟! چ چێژ و لەزەتێکم لێ دەبینین..؟! ئەدی بۆچی حەزم دەکرد تەختەکەم لەگەڵ تەختی «ڕازاو»ی جوانەمەرگدا جووتکەم، کە دایکمی لەسەر نووستبوو و

«ئاشـتی»یش لە ناوەڕاسـتی هـەردووکـمـاندا بنوێت..؟! دایکم ئەو کـاتە بەو ماکسیەی بەریەوە، هەر ڕێک لە مەیموونە سوورەکە دەچوو، کە بە منداڵی لە خەونمدا دیم و.......... ئەم بەڕاستی زیاتر لە من دەترسا.. لەوە دەترسا لەپڕ پەلامـاری بدەم.. پەلامـاری بدەم و لە چاوترووکـانێکدا..... کـەچی من هیچ مـەبەسـتم ئەوە نەبوو، بەڵکو تەنهـا ئەوەندەم دەویست لە ناوەڕاسـتی هەردووکـمـاندا بنوێت.. ئەم هەر ئەوە نەبوو دەترسـا.. دەترسـا و زەندەقی چووبوو، بەڵکو دابوویە کەللەڕەقییش.. ماڵی ئەویشم بە قوڕ گرت، قسە هەر قسەی خۆی بوو.. «نا»ی هەر نا و «ئا»ی هەر ئا بوو.. تا درەنگی شەو هەوڵم لەگـەڵی دا و هەر ڕازیی نەبوو.. ئەوەندە بە پێـوە وەسـتـام، تا سـەرم کـەوتە خـولانەوە و دیمەنی شـتـەکـانم بە تەواوی لە بەرچاو گـۆڕان.. ئەوەندەی پێ نەچوو (تاپ) بەسەر دایکمدا کەوتم.. کەوتم و کۆترە فلیقاوەکانی ناو دەستم کـەوتنە سـەر کـراسـە سـوورەکـەی، کـەچی ئەم هەر بێـدار نەبووەوە.. هەر جووڵەیەکیشی نەکرد.. گیانی بووبوو بە تەختە.. سار سارد وەکو شەختە.. هەستم بە جووڵەی دەمار و ماسولکەکانیشی نەدەکرد.. بەبێ ویست و ئارەزوو دەستە خوێناوی و پیسوپۆخڵەکانمم بۆ یەخەی برد و مەمکەکانیم دەرهێنا.. هەر جارێ دەمم بە یەکێکیانەوە دەنا و وەکو منداڵی شیرەخۆرە مژم لێ دەدان.. ئەو شـیـرە ساردەی بە خـوڕ بۆ ناو دەمم فـوارەی دەکـرد و فـێنکم دەبووەوە.. سـەرەتا هیچ بە لامـەوە سـەیر نەبوو، کـە مەمکەکـانی ئەو هەمـوو شـیـرەیان تێدا بوو، دوایی لەپڕ بیـرم کـردەوە و ترسـام.. ترسـام و گـیـانم مـووچڕکی پیـادا هات.. باشـە دایکم نزیکەی بیـست ساڵ بوو منی لە شیـر بڕیبـووەوە، ئەی ئەو......؟! بۆن بوخـوردێکی سـەیریشـیـان لێ دەهـات.. بۆنی بوخـورد..؟! سـەیر بـوو..!! خـۆ دایکم بە پێـچـەوانـەی نەنکم زۆر ڕقی لە بۆنی بوخورد بوو.. ئەی ئەو بۆنە.....؟! ئەم هەمیشە لە نەنکم تووڕە دەبوو، چونکە ئەو بـوخـردی لەسـەر گـۆڕی باپیـرم دادەگـیـرسـاند.. نەنکیـشم وەک بڵـێی ڕقـەبەرایەتیی ئەو بکات، لە مـاڵەوەش دایدەگـیـرسـاند.. فـرمـێسکەکـانی دادەباراندنە سـەریـان و دەچووە خـەیاڵی قـووڵ قـووڵەوە.. دایکم چاوی دەپەڕیە پشتی سەریەوە و پێی دەوت:

ــ پیرەژن ئەگەر ئیتر نەهاتم بۆ لات، گلەییم لێ نەکەیت.. تۆ ئەمماڵەت کردووە بە گۆڕستان و بەڕاستی من ناوێرم تیایدا دانیشم.

سەرەتا من بە پێچەوانەی دایکم زۆر حەزم لە بۆنی بوخرد دەکرد و پێی گەشبین دەبووم.. هەرچەند بۆنەکەی دەهات بە لووتمدا، وامدەزانی ڕۆژی هەینیە و قوتابخانە نییە، بەڵام لەو ئێوارەیەوە، کە لەگەڵ دایکم و «ڕۆشنا» و «یوسف»ی باوەپیارەم چووین بۆ لای و لە هەیوانەکەدا مەنجەڵە ڕەشەکەی خستبووە سەر پریمز و شلەیەکی سپیی لەناو دەکولاند، ئیتر منیش وەکو دایکم..... ئەو ڕۆژەش زۆر سەیر بوو، هەر لە خەون دەچێت.. کەواتە زۆر بەکەڵکی من دێت و وا چاکە بە شێنەیی و چەندیش بکرێت بە حەزەوە، چرکە بە چرکەی بێنمەوە بەر چاوی خۆم.. خۆ من زۆر جاری تر بیرم لێی کردۆتەوە و لە نیوەیدا خەیاڵم پچڕ پچڕ و ئاڵۆز بووە، بەڵام ئێستا ئەوسا نییە.. ئێستا لە هەموو کاتێکی دیکەی تەمەنم زیاتر دەستەڵاتم بەسەر خەیاڵ و بیرکردنەوەی خۆمدا دەشکێت و دەتوانم وەکو لیگۆی منداڵان هەرچۆنم بوێت، وایان ڕیز و لەسەر یەکتر هەڵبچنم.. ئێستا نەنکم لە هەیوانەکە و لەبەرامبەر مەنجەڵە ڕەشەکە دانیشتووە و کەوچکێکی ڕەشی داری بە دەستەوەیە.... نا.. نا.. لەوێوە نا.. لەوێوە نا.. با هەر لەو کاتەوە دەست پێ بکەم، کە هەر چوارمان لە ئۆتۆمۆبێلەکەی «یوسف» دابەزین.. بۆنی بوخرد دەگەیشتە ناو کۆڵان.. بەڵێ، دەگەیشتە ناو کۆڵان.. من لە پێش هەموویانەوە پاڵم بە دەرگاوە ناو قاچم خستە حەوشەوە.. حەوشەی چی و ژووری چی..؟! هەر هەموو شتێ گۆڕا بوو.. مامۆستا «سوارە عینایەت»ی «مێژوو»م بینی مرادخانیەکی ڕەشی لەبەر و کڵاوێکی سپیی لەسەر کردبوو.. جامانەیەکیشی وەکو ملپێچ کردبووە ملیەوە.. لە سووچێکی حەوشەکەوە مەنجەڵێکی سپی سپیی زۆر لەوەی نەنکم گەورەتری خستبووە سەر پریمزێکی نەوتی و پڕی کردبوو لە... لە... لە... بڵێم لە چی..؟! نازانم.. هەر ئەوەندە دەزانم شلەیەکی ڕەش بوو، بە کەوچکێکی باغەی سپی دەیکردە قاڵبی کێلی گۆڕەوە و هەر خێرا ڕەق دەبوو.. بە بۆیەی سپی وێنەی قازێکی گەورەی لەسەر دەنەخشاندن و بە دیوارەوەی هەڵدەپەساردن.. چەپکێ بوخردیشی لەسەر تاقی پەنجەرەکەدا داگیرساندبوو،

دووکەڵە ڕەشـەکانیـان بەسـەر ڕووی پەنجـەرەکەوە دەنیشـتـەوە و لە شـێوەی پەڵەهەور دەردەکـەوتن.. پەنجـەرەکـە ئاسـمـانێکی تەڵخ بوو، چاوەڕێی کـزە بایەکی سـاردی دەکـرد، تا بەسـەر کـێلە ڕەشـەکـاندا کلوەبەفـری ورد ورد ببارێنێت.. ئای کە شتێکی سـەیر بوو، چەندیش بڵێی جوان و دڵگیر بوو ئەگەر بباریبـووایە..!! بـەفری تازە باریو و بۆنبوخـوردی سـەر کـێلە ڕەشـەکان وەکو پۆلەقـازی شـەوی تاریک دەردەکـەوت، بـەڵام نەبـاری و نـەباری.. ئـەگـەر بشبـاریبووایە من لـەزەتم لێ نەدەبینی، چونکە ئەوسا تەواو واقم وڕما بوو.. لە شوێنـی خۆمـەوە جووڵەم بۆ نەدەکرا.. نەمدەتوانی لە مـامۆسـتا «سـوارە» زیاتر بیـر لە هیچی دیکە بکەمەوە.. ئێستـاش وەکو ئەوسا لە خـۆم دەپرسـم و دەڵێم: باشـە چی ئـەمی هێـنابووە ئـەوێ..؟! ئەم مـامـۆسـتـا بوو، بـۆچی بووبـوو بە وەسـتای کێلی گۆڕ..؟! هـەرچەند سـەیریم دەکرد، خـەو دەیبردمـەوە و باوێشکم دەدا.. لە پۆلیش وابووم، هەرکە دەمدی، خـەو بەر چاوی دەگرتم.. هـەر ئەوەندە دەمـا سـەرم بکەوێتـە سـەر مـێـزەکـەی بەردەمم و بە ئـاگـا دەهـاتمەوە.. ئیـتـر دیمەنـی شـتـەکـانم تەواو لە بەر بینـاییم دەگۆڕان.. خـەتای ئەویش بوو، لـەگـەڵ هـەر ڕسـتـەیـەک، کە لەبەری کردبوو و دەیوتـەوە، باوێشکێکی دەدا.. هـەمـیـشـە دەتوت بەیانیـە و تازە لە خەو هەستاوە.. ڕۆژێکیـان بە تەباشیـری سپی لـەسـەر تەختـەڕەشـم نووسـی: «لە وانەی سوارە عینایەت، کێ خەوی نـایەت..؟!».. کاتێ هـاتە ژوورەوە و خوێندیەوە، بەدەم باوێشکێکی قووڵەوە وتـی:

ــ بە خوا خۆشم خەوم دێت.. لە خەوا چاوم بۆ هەڵنایێت.

ئیتر لەمەوە شەرمم لێی شکا و پێم وت:

ــ باش نییە مـامۆسـتایت و شـوفێر نیت.. ئێستـا ئەگەر خـەوت لێ بکەوێت، تەنهـا وانەیەکـمـان لە دەست دەچێت، ئەمـەش ئاواتـی هـەمـوومـانە، بەڵام ئەگـەر شوفێر بوویتایە، گیانی خۆت و هی ئێمەشت لەسەر دادەنا.

«دیدەن»ی تەنیشتم سەری هێنایە پێشێ و بە گوێچکەیدا چپاندم:

ــ سـەیری ئەو شانسـە.. ئەم قوتابخـانەیە بە درێژی و پانی ئەوی تێدا نێرە، ئەویش ئەو کەروێشکە خەوخۆشەیە.

دەستم کرد بە پێکەنین و لێم پرسـی:

ــ مامۆستا ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان ببینیت یەکێکمان نووستووە، چی دەکەیت..؟!

به گاڵتەیەک، کە هیچ لێی نەدەهات وتی:

ــ چاکترین مامۆستای مێژوو ئەوەیە، کە بەدەم خەوەوە وانەکە دەڵێتەوە و دەتوانێت زۆرترین ژمارەی قوتابییەکانی بنوێنێت.. ئێمە تەنها لە خەودا لە مێژوو دەگەین.. بۆ ئەوەی لە مێژوو بگەین، دەبێت بیکەین بە لایلایە.. مامۆستای مێژوو هەمیشە دەبێت وا بزانێت دەستی بە بێشکەوەیە و بەدەم لایلایە و بەند و بالۆرەوە ڕایدەژەنێت.

ــ بە قسەی تۆ بێت، من چاکترین قوتابیی ئەم پۆلەم.

ــ بەڵێ، بەڵام من خراپترین مامۆستای مێژووم، چونکە لە سی قوتابی، دەتوانم تەنها بەڕاستیی خەو بخەمە چاوی تۆوە.. کاری مامۆستای مێژوو ڕێک لە کاری وەستای کێلی گۆڕ دەچێت.

ــ بۆچی..؟!

ــ نازانم.. ئەگەر هەر ڕۆژێ ئەوەم زانی، ئەوا بەبێ یەک و دوو واز لەم پیشەیەم دەهێنم و دەبم بە وەستای کێلی گۆڕ.

ــ مامۆستا تۆ ناترسی ئاوا دەڵێی..؟!

ــ نەخێر، چونکە ئەوەی من دەیڵێم هیچ ترسی تێدا نییە.. من هەمیشە لە گازینۆی مامۆستایان، کە ئێوە ناوتان ناوە گازینۆی قەرزاران، بە مامۆستاکانی هاوڕێم دەڵێم: قوتابخانە لە پاسێکی گەورەی زەبەلاخ دەچێت.. تاکە جیاوازییان هەر ئەوەیە قوتابخانە زیاتر لە شوفێرێکی هەیە.

ــ ئەی مامۆستا بۆچی ناڵێی قوتابخانە لە تەڵەی مشک دەچێت..؟!

هەرکە ئەمەم وت، داماوە ڕەنگی هەڵبزڕکا و گیانی کەوتە لەرزین.. دەستی کرد بە کۆکە کۆک و خەریک بوو بە دەمدا بکەوێت.. دەستی کوتا و بە مێزەکە خۆی گرتەوە.. «هاژە» و «ڕاژە» ئەم قۆڵ و ئەو قۆڵیان گرت و لەسەر کورسیەکەیان دانا.. بە کوڵ دەگریا و فرمێسکی دەڕشت.. دوایی سەری هەڵبڕی و چاوە فرمێسکاویەکانی بە ترس و لەرزەوە بڕیە چاوەکانمەوە و هیچیشی نەدەوت، بەڵام هەموویان دەیانزانی بۆچی......

ئەو ڕۆژە لە ماڵی نەنکم زۆر هاوارم کرد:

ــ مامۆستا سوارە.. مامۆستا سوارە.

نازانم لەبەر گـڕەگـڕی پریمــزە نەوتیــەکـە گـوێی لە دەنگم نەدەبوو، یان نەیدەویست وەڵامم بداتەوە.. زۆر بە پەرۆش بووم لێی بپرسم: «جیـاوازیی لە نێوان وەستای کێلی گۆڕ و مامۆستای مێژوودا چییە..؟!» چونکە دڵنیا بووم وەڵامەکەی دۆزیبووەوە.. وردە وردە لێی نزیککەوتمەوە و دەستم خستە سەر شانی.. بە توندی ڕامتەکاند و بانگیم کرد:

ــ مامۆستا سوارە.. مامۆستا سوارە.

ئەو بە دەستی ڕاستی دەستی چەپ و بە دەستی چەپیشی دەستی ڕاستی گرتم.. تا هێزی تێدا بوو پاڵێکی پێوە نام و لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا خۆم گرتەوە.. کاتێ سەیری دەستەکانی خۆمم کرد، بە پێچەوانەی دەستەکانی ئەم ڕاستەیان ڕەش و چەپەیان سپی بووبوو.. بیرم لە جیاوازیی نێوان خۆم و ئەو دەکردەوە و ترس دایدەگرتم.. هەر خێرا چوومە بەر بەلووعەکە و دەستەکانمم خستە بەری.. لەمیان ڕەشاو و لەویتریان سپیاو دەهاتە خوارێ.. ئەمیان بەسەر کاشیە سپیەکان و ئەویان بەسەر کاشیە ڕەشەکاندا جۆگەلەی جیا لە یەکتریان بەست.. ئای لەو شتە سەیرە..!! هەردووکیان بە تەنیشت یەکتردا بەرەو خوار دەبوونەوە و تێکەڵ بە یەکدیش نەدەبوون..!! تەنانەت هەر یەکەیان بە جیا لەوی دیکەیان دەرژایە زێرابەکەوە.. دەستبەجێش پۆلێ کۆتری سپی سپی و پۆلێ قەلەرەشی ڕەش ڕەش لە حەوشەکەدا نیشتنەوە.. ئەمان لەسەر جۆگەلە ڕەشەکە و ئەوان لەسەر جۆگەلە سپیەکە.. دەیانخواردەوە و مەلەیان تێدا دەکرد.. ئەمـان وەک تەختـەڕەش ڕەش ڕەشـهەڵگەڕان و ئەوان هەمـوو گیانیان وەک تەباشیر سپی بوو.. جۆگەلەکانیش هەر دەڕۆیشتن و تێکەڵ بە یەکتریش نەدەبوون.. ئای لە بێئەقڵی و ساویلکەیی منیش، چووم سەری مەنهۆڵەکەم هەڵدایەوە، تا بزانم لەوێش تێکەڵ بە یەکدی نابن.. بۆنبۆگەنێکی زۆر سەیر هات بە لووتمدا و سەرم خولایەوە.. تەواو کاس بووم و بە لادا هاتم.. لەنێوان هەردوو جۆگەلەکەدا کەوتم و ڕشامەوە.. ئەوەندە ڕشامەوە، هەموو گیانم داهێزرا و دواتر ژێر ئارەقە کەوتم.. کاتێکم زانی دوو کچی

سپیپۆش سەرو کووپی ڕەشیان بە دەستەوە بوو، هاتن ئەم دەست و ئەو دەستیان گرتم و بۆ ناوەڕاستی حەوشەکەیان هێنام.. پشت لە مامۆستا و ڕوو لە نەنکم لەسەر کورسیەکی ڕەشیان دانام.. خەڵکی سەیر سەیری وام لەو حەوشەیەدا دەبینی، کە لە هەموو ژیانمدا نەمدیبوون و ئەوانیش زۆر بە حەپەساویەوە سەیریان دەکردم.. هەر دەتوت سەرنج لە مردوو دەدەن.. نەنکم کەوچکێکی گەورەی داری گرتبوو بەدەستەوە و شلە سپیەکەی ناو مەنجەڵەکەی پێ تێکدەدا.. کۆمەڵێ بە کووپی گەورەوە بە دیاریەوە وەستابوون و سەیریان دەکرد.. راهیبەیەک بێدەنگ و بێچرپە هات و هەر خێرا جلە ڕەشەکانی، سەرپۆشە سپیەکەی، پێلاوە قەترانیەکانی، گۆرەویە شیریەکانی، هەر هەمووی داکەندن و یەکە بە یەکەی خستنە ناو مەنجەڵەکەی نەنکمەوە.. ئانوسات توانەوە و مەنجەڵ لەسەری ڕژایەوە.. دوو جۆگەلە، یەکێکی سپی و یەکێکی ڕەش لە مەنجەڵەکەوە هەڵقولان.. سپیەکەیان بەسەر کاشیە ڕەشەکان و ڕەشەکەیان بەسەر کاشیە سپیەکاندا ڕۆیشتن، بەبێ ئەوەی تێکەڵ بەیەکتر بن.. کەچی دواتر لە ناوەڕاستی حەوشەکەوە، لەو شوێنەی دوو جۆگەلەکەی دەستی ڕاست و چەپی من دەستیان پێ دەکرد، سپی تێکەڵ بە سپی و ڕەش تێکەڵ بە ڕەش بوون و بەرەو زێرابەکەوە ملیان نا.. بەڵام ئەوە سەیر نەبوو، بەڵکو ئەوەی سەیر و سەمەرە بوو ئەوە بوو، بۆچی ژنە ڕاهیبەکە خۆی ڕووتکردەوە..؟! هەرچەند دەمکرد سەرم لەوە دەرنەدەکرد.. هەر بە ڕووتی و بە هەنگەشەلێ، بە تەنیشت مندا ڕۆیشت و بە قادرمەکەدا چووە سەربان.. هەر کاتێکم زانی لە هەر چوار دەوری ماڵی نەنکمەوە، منداڵ و ژن و پیاو، کەوتنە هووها و فیکەکێشان.. دواییش بەردبارانیان کرد.. گیانی بوو بە خەڵتانی خوێن.. جۆگەلەی خوێن بە کونی چۆڕاوگەی سەربان‌دا دەرژایە ناو مەنجەڵەکەی نەنکمەوە.. لەوێشەوە بۆ سەر کاشیەکان و هەموو جۆگەلەکانی تێکەڵ بە یەکتر کرد.. حەوشەکە تانوپۆی سووردەچووەوە.. بەردەکانیش بەردەوام دادەبارینە ناو حەوشەکەوە.. ئەوان خۆیان لە ژوورەوە نابوو، من بە تەنیا نەمدەتوانی لە شوێنی خۆمەوە جووڵە بکەم.. هەر بەرد بوو سەرم، دەستم، قاچم، پشت و ئەژنۆمی دەشکاند.. هەموو گیانم بە خوێن

سـووڕهەڵگەڕا و چۆڕاوگـەی خـوێنی منیش تێکەڵ بە خـوێنی ڕاهیـبـە و جۆگەلەکانی حەوشەکە بوو.. وەکو مەیموونە سوورەکەم لێ هات و گیانم کەوتە لەرزین.. بۆن بوخـردێکی زۆر سـەیریش لە خـوێنەکـەم دەهات.. ئینجـا زیاتر ترسام.. ترسام و تا تینم تیا بوو قیژاندم:

ــ ڕاهیبەکە لە سەربانی ماڵی نەنکم مردووە و خوێنی من بۆنی بوخردی لێ دێت.

ئەوان هەر هەموویان لە هەر چوار تاکی پەنجەرەکەوە سەریان دەرهێنابوو، زەق زەق سەیریان دەکردم و پێدەکەنین:

ــ بەچی پێدەکەنن..؟! ڕاهیبەکە لە سەربانی ماڵی نەنکم مردووە و خوێنی من بۆنی بوخوردی لێ دێت.

دوایی زانییم ناهەقیان نەبوو پێبکەنن.. ئاخر من دوو ڕستەی زۆر سەیرم بەیەکەوە پەیوەست کردبوو.. ڕاهیبەکە لە سەربانی ماڵی نەنکم مردووە لە کوێ و خوێنی من بۆنی بوخردی لێ دێت لە کوێ..؟! هەر بەڕاستی بێسەروبەر و ناماقووڵ بوو.. دەسا ناهەقیشم نەبوو.. من خوێنم بدیایە، دەترسام.. دەترسام و وڕێنەم دەکرد.. یەکەمجار خوێن ببینم و نەترسم، ئەو جارە بوو، کە خوێنی سەری «ئاشتی»م بینی.. نەک نەدەترسام، بەڵکو جورئەتیش گرتبوومی، کەچی ئەو کچەتیوە بە قسەی نەدەکردم و نەدەکردم.. بەس بمزانیایە بۆچی نەیدەوێرا لە نێوانماندا بنوێت، من هیچم نەدەویست.. ئاخ..!! ئێستاش نەمزانی بۆچی دەترسا..!! وەکو ئەو ترسەی من ئەو ڕۆژە لەناو حەوشە گەورەکەی ماڵی نەنکمدا هەستم پێی دەکرد.. دواتر نازانم چۆن گەیشتبوومە ناو دەرگای حەوشەی خۆمان و کێ گەیاندبوومی.. وەکو کوێر دەستم دەکوتا و بە مەزەندەی خۆم بۆ لای بەلووعەی بەردەرگای مووبەقەکە دەچووم.. تا دۆزیمەوە، نازانم چەند جار قاچم هەڵنووتا و بەسەر چەند شتدا کەوتم.. سەر ئەژنۆ و ناولەپەکانم ڕووشان و دەکزانەوە.. خێرا خێرا و بە هەردوو دەست ئاوم دەکرد بەسەر سەرمدا.. وردە وردە چاوەکانم دەکرانەوە و درزی ئاسۆییان تێ دەکەوت.. ڕیشاڵی خەستی خوێنم دەبینی بەسەر ناوچەوانمدا دەهاتە خوارێ و بەسەر دوو ڕیزە کاشیە ڕەش و سپییەکەدا

جۆگەلەی جیا لەیەکتریان دەبەست.. بەملا و بەولای پشیلە ڕەشەکەدا، کە وەکو ژنی زەیستان پاڵکەوتبوو و چوار بێچووە سپیەکەشی گوانیان دەمژی، ڕێیان دەکرد و لەولاتر بەجیا دەرژانە زێرابەکەوە.. دڵم تێکهەڵات و لە ناوەڕاستی هەردوو جۆگەلەکەوە ڕشامەوە.. ڕشامەوە و ئەوەندەی دی بەر چاوم تاریک بوو.. هێندەی دیکە دیمەنی شتەکانم لێ گۆڕان.. دواتر پشیلەکە هەستایەوە و کلکە ئەستوورەکەی بە چەماوەیی خستە سەر پشتی.. لاسار و چەتوونانە کەوتە بازبازێن بەسەر جۆگەلەکاندا و بێچووەکانیشی زەق زەق سەیریان دەکرد.. لەپڕ ئەوانیش، دووان لەملا و دووان لەولا، خۆیان تێخست و هەموو گیانیان سوور هەڵگەڕا.. لەژێر تیشکی چوار گڵۆپە نیۆنە شیریەکەی بە ستوونی و بە هەر چوار بۆریی کەپری مێوەکەوە چەسپکرابوون، گیانیان دەبریسکایەوە و سێبەرەکانیان بە گەورەیی و چەندیش بڵێی بە ڕەشی لەسەر دیوارە سپیەکەی نێوانماڵی ئێمە و ماڵی «کاوە»دا دەردەکەوتن.. شوێنپێکانیشیان لەسەر کاشیەکان وێنەی تەڵەمشکی بچکۆلەی خوێناوی بەجێدەمان.. ئینجا ترس دایگرتم و ڕامکردە هەیوان.. لەشپرزەییدا بەسەر حەوزی ماسیەکەدا کەوتم، کە نەمدەزانی بۆچی و کێ هێنابووی بۆ ئەوێ.. جاران پشتی بە دیوارە سپیەکەی ژووری میوانەوە بوو.. ماسیە ڕەش و سپیەکانی ناوی، کە دەتوت قەڵەمی بۆیەن و کراون بە کونی پرگاڵدا، هەمیشە وەکو چەند هێڵێکی باریک بە یەکدا دەچوون و تێکدەقژقژان.. جارێ، هەر تاقە جارێ چییە نەمدی یەکێکیان بوەستێت.. شەوان کاتێ گڵۆپە شیریەکەش دەکوژایەوە، ئەوان هەر نەدەسرەوتن.. سپیەکان لە تاریکایشدا هەر دیاربوون و بێهودە ئەمسەر و ئەوسەریان دەکرد.. کاتێ لە دوو کونەکەی لای سەرەوە خواردنمان دەدانێ، بەبێ ئەوەی لە جووڵەی خۆیان بکەون، بە دەمە زۆر بچکۆلەکانیان خواردنەکەیان دەقۆزتەوە و هەر بەدەم ڕێگاوە دەیانخوارد:

ـ دایکە ئەوە بۆچی ناوەستن..؟!

ـ ئەمانە ماسیی جوانیین.. هەموو جوانیەکەشیان لەو ڕاکەڕاکەیاندایە.

ـ چەند گوناهن دایکە، کە ناتوانن بۆخۆیان بوەستن و پشوو بدەن.

ـ خۆیان ئاوایان پێ خۆشە گوڵم، تۆ پێویست ناکا خەفەتیان بۆ بخۆیت.

بەڵام خـۆیـان ئاوایان پێ خـۆش نـەبوو، بەڵکو لەودیوی ئەو جـامــە ئاویەوە، سـەر و سیـمای ئێـمەیان زۆر دزێو و ترسنـاک دەبینی و زەندەقیـان لێمـان چوو بوو.. مـن ئەو جـارە بۆم دەرکـەوت، کـاتـێ لەســەر تەخـتــەکــەی پشــتـیــەوە پاڵکەوتبـووم و لێـیـەوە سـەیری دایکم و «یوسـف»م دەکـرد، بۆ خـۆیان لەسـەر سـەکـۆی ناو بـاخـەکـە، لەژێر تیـشکی گڵـۆپە سـتـوونی و ئـاسـۆییـەکـاندا دانیشتبـوون.. سیمایان زۆر ناشیرین و ترسناک دیار بوو.. وێنەکانیان جووت جووت، وەکو وێنەی سەر شـەکردانە ڕەشـەکەی نەنکم دەردەکـەوتن.. «ڕۆشنا»، کە لە تـەنیـشتـیـاندا لەژێر لێفـە سـپـیـەکـەیەوە نووسـتـبوو، وەکـو هێڵـەکانی پەڕینـەوەی سـەر شـەقـامـەکـان دیار بوو.. پشـیلە ڕەشـەکـە و چوار بێـچـووە سوورەکـەی بووبوون بە دە و بە دەوری ئەواندا بازنەیەکیان پێکهێنابوو.. دواتر لە هـەر دوو دانەی وەکـو یەکی شـتــەکـان، یەکـێکیـان لە بـەر چاومـدا کـاڵ دەبووەوە.. تـا وای لێـهـات بـە تەواوی ونبــوون.. کـەچی ئەوانـەی مـانـەوە هـەر ناشــیــرین و دزێو بـوون.. هـەر ترسـناک و تۆقـێنـەر بوون.. دایکم و «یـوسف»، ئەمـیـان تەرمـۆزە ڕەشـەکەی چا و سینـیـەکی پلاسکۆی ڕەش و دوانزدە پیاڵەی شـیـریی و ئەویان قـاپێ ئـارەق و قـاپـێ جاجک و سـەتڵـە ڕەشـە بچکۆلەکـەی سـەردەمی منداڵیی منی پڕکـردبوو لـە سـەهۆڵ و لەســەر مـێـزە سـپـیـەکـەی بەردەمـیـەوە دانیابوو، جـار جـار هەڵدەسـتـان و بە شـێـوەیەکی زۆر سـەیر لە سـەربان ڕادەمـان.. هـەر جـارێ یەکـێکیـشـیـان بە هەنگاوی کـورت کـورت و هەرچەندیش بڵێی بە ترس و پارێزەوە دەچووە بەر دەرگا سپیەکەی حەوشەوە، کە نازانم بۆچی وەکو دەرگا زل و زەبەلاحـەکەی قوتابخـانە دەهاتە بەر چاوم، زۆر بەشـێنەیی درزێکی تێدەکرد.. سـەرێکی دەکێشـا و بەمـلا و بەولای خـۆیدا دەیڕوانی.. من دەمزانی چاوەڕێی کەسێکن، بەڵام نەمدەزانی ئـەو کەسە کێیە و بۆچی چاوەڕێی دەکەن.. هەرچەندیش مێشکمم بگوشیایە و خۆمم پێوە ماندوو بکردایە، هـەر نـەمــدەزانی.. هـەرگــیــز باوەڕم نـەدەکـرد ئـەو پیــاوە ســەیر و سەمـەرانە، لە شەوێکی ئاوادا، میوانداریی مـاڵی ئێمـە بکەن.. من تا ئێستاش نەمزانی و خۆشیان پێیان نەوتم، لە کوێ و چۆنیـان دەناسین.. باشە تۆ بڵـێی خــەون نـەبووبێت..؟! خــەونی چی..؟! بە هـەردوو چاوی خــۆم دیم، کــاتـێ بە

ســـووكی و بەبێ دەنگیی دەرگـــایان ترازاند و یەک بە دوای یەکـــەوە هاتنە ژوورێ.. هەر دوانزدەیان بە ڕیز لەسەر سەکۆکە دانیشتن و چەکەکانیشیان، کە قۆنداخەکانیان بە ڕەش و لوولەکانیشیان بە سپی بۆیە کردبوون، لە بەردەمی خـۆیانەوە دانان.. دایکم و «یوسف»یش لەســەر کـورســیــەکــانی بەرامبەریاندا دانیشتن و وەک بڵێی یەکەمجار بێت بیانبینن، لە دەموچاویان وردبوونەوە.. جلوبەرگیان هی سەردەمە زووەکان و هەڵسوکەوتیشیان هی ئەم زەمانە بوو.. کورتەبنەکەیان هەستا و بە تفەنگەکەی کەوتە وەراندنی پرتەقاڵە سەوز و کاڵەکان، کە هیچ یەکێکیان لە تۆپێکی تێنس گەورەتر نەبوون.. دوایی هەر هەموویانی لەسەر چیمەنەکە کۆکردەوە و کردنیە گیرفانە زلەکانی پاڵتۆ خوریەکەیەوە، کە لە ڕاستیدا لێفەیەک بوو، لەملا و لەولاوە دوو کونی بۆ قۆڵەکانی تێکرابوو.. ئینجا چوو لە بەردەمی ئەواندا گیرفانەکانی بەتاڵکرد و بڵاوی کردنەوە.. ئەوانی تریشیان هەر یەکەی لە گیرفانی خۆیەوە مشت مشت بەڕوویان دەردەهێنا و تێکەڵی پرتەقاڵە کاڵەکانیان دەکرد.. لە دڵی خۆمدا وتم: ئاخۆ چ یارییەکی سەیر و سەمەرەیان پێ بکەن.. بە دیقەت سەیری دەستیانم دەکرد، کە چەپەیان شەش پەنجە و ڕاستەیان چواری پێوە بوو، تا فێری ئەو یارییە بم، کە ئێستا نا ساتێکی تر دەیکەن، بۆئەوەی منیش دواتر «کاوە» و «ئارام» و «تەنیا» فێرکەم.. بەڵام یاریی چی..؟! بە نینۆکە زلەکانیان توێکڵە ئەستوورەکەیان لێ دادەماڵین و وەکو مزرەسێو خرم خرم دەیانکرماندن.. جارێک پرتەقاڵی سەوز و جارێک بەڕووی کاڵ.. چەندم بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە، کاتێ لەگەڵ قووتدانی هەر دانەیەک، چاوەکانیان توند توند دەنووقاند و ئاوێک، کە هیچ لە فرمێسک نەدەچوو، پیایاندا دەهاتە خوارێ و دەمـــاری ڕوومـــەت و لاملیـــان لە تاوا گـــرژ دەبوون.. چاوەکـــانم پڕ بوون لە فرمێسک و لە دڵی خۆمدا وتم: خۆ ئەوانە میوانن.. بە تۆز و خۆڵی دەموچاو و سەر جلەکانیاندا دیارە لە ڕێگای زۆر زۆر دوورەوە هاتوون، ئەی بۆچی دایکم ناچێت چێشتی گەرمیان بۆ بهێنێت..؟! دوایی زانیم ئەمان خۆیان شتی تفت و تاڵ دەخۆن، بۆئەوەی ڕاستیی بڵێن.. بەوەدا زانیم کە تا دەنکێ پرتەقاڵ، یان بەڕووێکی کاڵیان نەخواردایە، قسەیان نەدەکرد.

من ئەگەرچی هیچ لەو پیاوانە تێنەدەگەیشتم، چونکە هەر دەتوت بە زمانێکی تر دەدوێن، بەڵام لەوە دڵنیا بووم هەرچی دەیڵێن، ڕاستە.. هەندێ وشەیان دەوت، من هەر لە هەموو ژیانمدا گوێم لێیان نەبووبوو.. هیچی وەکو «ماتریال» خۆش نەبوو، لە هەموو وشەیەکی تر زیاتر دەیانوت و دەیانوتەوە.. سەرەتا وتم: دۆزیمەوە.. ئێستا زانیم ئەمانە چین.. ڕاوچین و ڕاوی «ماتریال» دەکەن.. ئەو تفەنگانەشیان هەر بۆ ئەوە هەڵگرتووە.. ئینجا بیرم لە «ماتریال» کردەوە.. ئاخۆ باڵدارە، یان ئاژەڵ..؟! ئەگەر باڵدارە شێوەی چۆنە..؟! لە کۆتر دەچێت، یان لە کەو..؟! ڕەنگی چۆنە..؟! سپیە، یان ڕەش..؟! دەنگی لە دەنگی کام باڵندەی تر دەچێتت..؟! ئەی ئەگەر ئاژەڵە لە کەروێشک دەچێت، یان لە ئاسک..؟! دواتر وتم: «ماتریال» مێیە و «تریال»یش نێرەکەیەتی.. وەکو کەو و ماکەو، چین و ماچین، گا و مانگا، کەر و ماکەر...

من لەو خەیاڵانەدا بووم، کاتێ باڵابەرزەکەیان هەستا و چوو بۆ لای دارهەنجیرەکە.. پەیتا پەیتا بە تفەنگەکەی هەنجیرە سەوزەکانی دەوەراند و سەیری هاوێکانی دەکرد.. وێنەکەی «مەسیح»م بیردەکەوتەوە، کە بە قژی زەردی تا سەرشان و سمێڵ و ڕیشی حەڵوایی و تێکەڵ بە یەکیەوە، لە بەرامبەر دارهەنجیرە ڕووتەکەوە وەستاوە و گەڵا سەوزەکانیشی بەسەر زەویدا بڵاوبوونەتەوە.. نووکی دارە درێژەکەی لە زەویە نەرمەکە چەقاندووە و بە دەستە سپی و گۆشتنەکەشی لە ناوەڕاستەوە گرتوویەتی.. هەر جارێ دەچووین بۆ ماڵی «مام تۆما»، من قنج لەسەر کورسیەکەی بەرامبەر ئەو وێنەیە دادەنیشتم و چاوەکانم لێی نەدەترووکاند.. بیرم دەکردەوە و دەچوومە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە.. جارێکیان «مام تۆما» پێکی وێسکیەکەی خستە سەر مێزەکەی بەر دەمیەوە و چیرۆکی دارهەنجیرەکەی بۆ گێڕاینەوە:

ـ بەیانییە و مەسیح بەرەو شار دێتەوە.. برسیەتی و دەچێتە لای ئەم دارهەنجیرەی سەر ڕێگا.. بەڵام بێجگە لە گەڵا هیچی تری پێوە نییە، بۆیە ئەمیش لێی تووڕە دەبێت و پێی دەڵێت: تا ماوی بەر نەگریت.. دارهەنجیر خێرا وشک دەبێت و گەڵاکانی دەوەرن.. قوتابیەکانی، کاتێ ئەمە دەبینن، سەریان سوڕدەمێنێت و لێی دەپرسن: ئەوە چۆن ئاوا زوو ئەو هەنجیرە وشکی

کرد..؟! پێیان دەڵێت: بەڕاستیی پێتان بڵێم: ئەگەر ئێوە بڕوادارین و گومانتان لە دڵدا نەبێت، ئەوە بەو دارهەنجیرە دەکەن، کە من پێم کرد، بگرە ئەگەر بەم کێوەش بڵێن: هەستە خۆت بخەرە دەریاوە، بۆتانی دەکات.

بەڵام دارهەنجیرەکەی ئێمە هەنجیری زۆر پێوە بوو، لەو دارهەنجیرە زڕە نەدەچوو، کە بەر ڕق و نەفرەتی لەناکاوی «مەسیح» کەوت.. چەند جار کڵاوە سوورەکەی سەری پڕکرد و بردی لای ئەوان هەڵیڕشت، هەر تەواو نەدەبوو.

یەکێ لەو پیاوانە، کە لە هەموویان بە تەمەنتر بوو، لەوەدەچوو دەمڕاستیان بێت، ئەو ئینجانە ڕەشە گەورەیەی هەڵگرت و کێشای بە قەراغی پەرژینی باخەکەدا، کە گوڵێکی سپیی تێدا ڕوێنرا بوو و بۆنێکی سەیری لێ دەهات.. ئینجانە  پارچە پارچە و گوڵیش بەژێر گڵە ڕەشەکەیەوە بوو.. ئەمە ئەو گوڵە بوو، کە من و «یوسف» خۆشماندەویست.. بەڵام ئەوسا «یوسف» ئەوەندەی خواردبووەوە، ئاگای لە دنیا نەمابوو.. بەحاڵ قنگی خستبووە سەر قەراغی کورسیەکەوە و دەتوت ها ئێستا نا ساتێکی دی دەکەوێتە خوارەوە.. هەردوو دەستی بەشلیی لەسەر ئەژنۆکانی دانابوو، سەریشی شلتر بۆ خوارەوە شۆڕکردبووەوە.. جار جار بەحاڵ چاوەکانی دەکردنەوە و هەر خێرا دایدەخستنەوە.. ئەمەیان خەتای ئەو پیاوانە بوو، ئەگەر ئەوانیش لەگەڵیان بخواردایەتەوە، ئەوا ئەم وەکو شەوانی تر، تەنها کەمێکی دەخواردەوە و ئاوا سەرخۆش نەدەبوو.. باشە بۆ نەیاندەخواردەوە..؟! خۆ ئارەقیش تاڵە.. من ئەو جارەی، کە منداڵ بووم و لە ماڵی «مام تۆما» بە هەڵە لەجیاتی ماستاو خواردمەوە، زۆر تاڵ بوو، ئەی بۆچی نەیاندەخواردەوە..؟! چاکەی دەستی دایکیشم، ئەگەر شەکریان تێنەکردایە، تاڵ بوو، ئەمیان بۆ نەدەخواردەوە..؟! من زۆر شت لەو پیاوانە تێنەدەگەیشتم، کەچی هەر خۆشیشمدەویستن.. هەر بەزەییشم پیایاندا دەهاتەوە.. ئاخر زۆر داماوبوون و لە شوێنی زۆر دوورەوە هاتبوون زۆر.. ئەو ئینجانەیە هەر کەسێکی دی بیشکاندایە، لێی خۆش نەدەبووم، کەچی ئەم بەقەستیی شکاندی و دڵیشم گەردی نەگرت.. شکاندی و کردی بە سەدان لەتی جیاواز جیاواز.. یەکێ لە پارچەکانی هێنا و بە دەسکی ڕەشی خەنجەرە سپیەکەی بەر پشتی، بەڵام زۆر بەسووکی لە قەراغەکانی

دەدا و بچووکی دەکردەوە.. بە شێوەیەکی خڕ دەریهێنا و خستیە بەر چاوی.. سەرنجی لێ دەدا و فووی لێ دەکرد.. ئینجا بڕبەندێکی سپیی لە گیرفانی ناوەوەی مرادخانیە ڕەشەکەی دەرهێنا و پێی تەنک و لووس کرد.. بە پەنجە زیادەکەی دەستی چەپی و هی ئەسپێکوژەی دەستی ڕاستی تۆقە سپییەکەی لە قژی دایکم کردەوە و لە پێشدا نووکی دەرزیە گرنج گرنجەکەی کرد بە پەنجە زیادەکەیەوە، هەر خێرا لەو کونە بچکۆلەیەوە خوێن بەربوو و لەتە ئینجانەکەی پێ نەخشاند، ئینجا وەکو نووکی پڕگاڵ خستیە سەری و دوو کونی خشتی تێ کرد.. نازانم ئەو دەزووە سپیەشی لە کوێ پەیدا کرد، ئاوا خێرا لە کونەکانی هەڵکێشا.. ئەم جەمسەری کردە پەنجە زیادەکەی و ئەو جەمسەری لە پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستیەوە هەڵکێشا و کردی بە خولخولۆکە.. ئەم سەرگەرمی خولاندنەوەی بوو، یەکێ لە هاوڕێکانی هەنجیرێکی کاڵی خستە دەمیەوە.. دوای ئەوەی تێر تێر جووی و قووتی دا، سەری لەسەر خولخولۆکەکەی دەستی بەرزکردەوە، کە ئەوەندە بە خێرایی دەخولایەوە لە شێوەی سەدفلسەیەکی سوور دەهاتە بەر چاوم.. دەنگێکی وەکو گڕوگاڵی منداڵیشی دەردەکرد، کە ئێستاش ئەگەر بمەوێت دەتوانم لێوی خوارەوەم بەحاڵ بخەمە ژێر دانی سەرەوەم و لاسایی بکەمەوە: «بڤڤڤڤڤڤ.. بڤڤڤڤڤڤ.. بڤڤڤڤڤڤ».. لە چاوەکانی دایکم ڕاما و وتی:

ــ ئێمە ماتریالیستین.

ئینجا من زانیم بە هەڵەدا چووم، «ماتریال» نە مەلە و نە ئاژەڵ.. جارێکی دیکەش لە خەیاڵی خۆمدا کەوتمەوە ڕاوە ڕاو بە دوای مانای وشەی «ماتریال» و ئەمجارەیان «یست»یشی چووە پاڵ.. لەو خەیاڵانەدا بووم، کاتێ یەکێکیان هەستایە سەر پێ و چەکەکەی کردە شانیەوە.. بە ناو باخەکەدا گەڕا.. گەڕا.. لەپڕ دانەویەوە و بە دوو پەنجە ئەو ئینجانە ڕەشە بچکۆلەیەی هەڵگرت، کە گوڵێکی دڕکاویی شێوە تەشیلەیی زۆر ناشیرین و بۆنناخۆشی تیادا ڕوێنرا بوو.. دەمودەست گوڵەکەی لەناو هەڵکێشا.. گڵەکەی وەک بڵێی نەیەوێت لێی جیا بێتەوە، یان باوەڕی نەکردبێت لە شەوێکی ئاوادا لەناکاو هەڵکەوتنە سەریان و لە شیرینخەودا ڕایانپەڕێنن، توند توند خۆی بە ڕەگەکانیەوە

گـرتبـوو، وەكـو قـاڵب لەگـەڵیـدا هـاتە دەرەوە.. ئینجـانەكـەی بردە بەر بەلووعەكەوە.. بە ناو دوو جۆگەلە سوورەكەدا دەڕۆیشت و كلاشە سپیەكانی و دامـێنی شـەرواڵە ڕەشـەكـەی سـوورهەڵگەڕان، كـەچی هـەر هەسـتـیشـی پێی نەدەكـرد.. ئینجـانەكـەی شت و هێنـایەوە.. دایە دەست دایكم و ئەویش هەر خێـرا مـەمكەكانی دەرهـێنان.. دەریهـێنـان و شـیری تێكردن.. ئـەوە بە لامـەوە سەیر نەبوو، كە دایكم ئەو هـەموو شیرەی لە مەمكەكانیدا بوو، بەقەدەر ئەوەی دەمویست بزانم ئەو پیاوە چی لێ دەكات.... شیشێكی باریكی درێژی لە خوار قـۆنداخی تفـەنگەكەی جیـا كردەوە و چەند جارێ كـردی بەناو لوولەكـەیدا.. تۆزێكی ڕەشی لێ دەهاتە دەرەوە و دەرژایە سـەر شـیـری ناو ئینجـانەكـەوە.. هەر بە شـیشـەكـەش جوان جـوان تێكی دا.. ئینجـا هەر هەمـوویان بـە جارێ دەستیـان بۆ بەنەخوێنـەكانیـان برد و لە ناو شەرواڵەكانیـاندا هێنایانە دەرێ.. ئەو سرنجـە ڕەش و سپیانەی بە سـەرەكانیـانەوە بەستبوویان، لێیـانكردنەوە و دەرزیەكـانی سـەریان خـستنە ناو ئینجـانەكـەوە.. شـیر و تۆزە ڕەشـەكـەیان تێكردن، كە دوای ئەو هـەموو تێكدانەش هەر تێكەڵ بە یەكتر نەبووبوون، ڕەش بە تەنیـا و سپی بە تـەنیـا، دوو هێڵی جیایان لەناو سرنجـەكەدا كێشـا بوو.. خـۆشـیـان لە شـێـوەی دوو ڕیزی بـەرامـبـەر بە یەكـتـر و لەنـاو چیـمـەنەكـەدا وەسـتـان.. شـەشـیـان لەمـلا و شـەشـەكەی تریان لەولا، دەرزیەكەیان دەكرد بە قۆڵی یەكتردا.. ئەوەندەی نەبرد هەر یەكەیان لـە شوێنی خـۆیەوە و لەسـەر دەم لێی پاڵكەوتن و خەویان لێ كەوت....

دایكم «ڕۆشنا»ی هـەسـتـاند، كە تا ئەو كـاتە بێـئـاگا لەوەی چی لەم مـاڵەدا ڕوودەدات، بۆ خـۆی نووسـتـبـوو، دەسـتی گـرت و بـە چاوی خـەواڵـووەوە بردیە ژوورەوە.. سـەیری مـێـردەكـەی هـەر نەدەكـرد، كـە لەسـەر كـورسـیـەكـەی و بە دانیشتنەوە خەوی لێ كەوتبـوو.. هات ئەمانی هەر دوو دوو بە لێفەیەكی ڕەشـی سـادە داپۆشـی.. لوولەی چەكـەكانیـشـیانی، لەمـلا و لەولای سـەر و قـاچیـانەوە چەقاند و چەرچەفی سپیی پێ دادان.. ئیتر بوون بە شەش گۆڕی وەكو یەك و ناو ئەو چیـمـەنەم لێ بـوو بە گـۆڕسـتـان.. گـۆڕی ڕەش و كـێلی سـپی، ئـای كـە ترسنـاك بوو..!! مـووچڕكـەم پیـادا دەهات و خـەریک بـوو زیرە بكەم.. بـەیانی

کاتێ چاوم کردەوە، کەسیان لەوێ نەمابوون، بەڵام ناو باخەکە تەواو گۆڕا بوو.. لەمەلا لەتە ئینجانەی شکاو.. لەولا هەنجیری سەوزی گازلێگیراو و توێکڵی پرتەقاڵ و بەڕوو.. لەولاتر بوتڵی ئارەق و قاپی لەسەردەمکەوتووی «یوسف».. هەندێ لەولاتریش سەتڵی تێکقووپاوی منداڵیی من و تەرمۆزی شکاو، لەتە سینیی پلاسکۆ، پیاڵە و ژێرپیاڵەی وردوخاشبوو.. مێروولەکانیش، نیوەیان ڕەش و نیوەکەی تریان سپی، سەرسام و ئەبڵەق، بێسەروشوێن بەناویاندا دەهاتن و دەچوون...

بە منداڵیی هەرکە باسی مردن بکرایە، من خێرا شەکردانە ڕەشەکەی ماڵی نەنکمم بیردەکەوتەوە.. تا ئەم دواییەش مردنم لە شێوەی شەکردان دەهاتە بەرچاو.. زۆر جار لە خۆمم دەپرسی: بۆچی مردن لە شەکردانە ڕەشەکەی نەنکم دەچێت..؟! هەر جارێ لێیم دەپرسی:

ــ ئەوە نەنە بۆچی ئەو شەکردانەی تۆ لە مردن دەچێت..؟

ئەم تاکە نەعلەکەی تێ دەگرتم و دەیوت:

ــ خۆزگە دەمزانی تۆ ئەو پرسیارە بێسەروبەرانە لە کوێ دەهێنیت.. ئاخر مەیموونی چەپەڵ ئەم شەکردانە کوێی لە مردن دەچێت..!! دوایی سەربەگۆبەند مردن دەبینرێت، تا بزانیت لە شەکردان دەچێت..؟!

ــ دەتۆ چاوت خێل بکە و لێی بڕوانە، ئینجا بڵێ وانییە.

ــ بەسە بیبڕەرەوە و واز بێنە.. من حەوسەڵەی تۆم نەماوە.

دەمبڕییەوە، بەڵام وازم نەدەهێنا.. هەرچەند دەچوومە مووبەقەکەوە و بە تەنیشت قۆریە سپیەکەوە دەمبینی، سەرنجم لێ دەدا و لێی وردەبوومەوە.. شووشەیەکی لاکێشەیی.. ڕەش ڕەش و لووس و ساف.. لە دوورەوە دەبریقایەوە.. کاتێ سەیری خۆمم تیادا دەکرد، دەیکردم بە دووان.. دووانی زۆر ناشیرین و ڕەزاگران.. دوو سەری لاکێشەیی وەکو دوو تەڵەی مشک.. ئەوسا قسەکەی ئەو جارەی نەنکمم بیر دەکەوتەوە: «زیندوو یەکێکە و مردوو دووان».. ئەمە ئەو جارە وای پێ وتم، کە لە سەربانی ئەوانەوە وەستا بووم، سەتڵە ڕەشە بچکۆلەکەی خۆمم پڕ کردبوو لە کەفاو و بە پارچە سۆندەیەکی سووری بچکۆلەش مژم لێی دەدا.. مژم لێی دەدا و فووم تێ دەکرد.. هەر

جارێ دوو بڵقی سپی سپیی بە قەدەر یەکی لێ دەردەچوو.. سووک سووک و زۆر زۆر بەئەسپایی، پەڕی قاز و کۆترئاسا بەرەو خوارەوە، ڕێک بۆ ناو حەوشەکە شۆڕدەبوونەوە.. بە نەرم و شلیی دەکەوتنە سەر کاشیە ڕەشەکان و لەوێ (پففف) دەتەقینەوە:

ــ زیندوو یەکێکە و مردوو دووان.

پێم وت:

ــ تێناگەم دەڵێی چی.

ــ کچی خۆم.. ئێمە هەموومان بە زیندوویی یەکێکین، بەڵام کاتێ دەمرین، دەبین بە دووان.

ــ بۆچی دەبین بە دووان..؟

ــ نابێت بڵێیت بۆچی دەبین بە دووان، بەڵکو دەبێت بڵێی دەبین بە دووانی چۆن..؟

ــ دەبین بە دووانی چۆن..؟

ــ دەبین بە دووانی وەکو یەک.

ــ دووانی وەکو یەک..؟!

ــ ئا، دووانی وەکو یەک.

ــ ئەی چۆن لەیەکتر جیا دەکرێینەوە..؟

ــ خوای گەورە جیامان دەکاتەوە.

ــ چۆن جیامان دەکاتەوە..؟

ــ نابێت بڵێیت چۆن جیامان دەکاتەوە، بەڵکو دەبێت بڵێیت بۆچی جیامان دەکاتەوە..؟

ــ بۆچی جیامان دەکاتەوە..؟

ــ بۆ ئەوەی خراپ و چاک لە یەکتر دوورکەونەوە.

لەمەوە هەر دوو شتی وەکو یەکم دەبینی، وام دەزانی مردوون.. هەمیشە لە دڵی خۆمدا و زۆر زۆر بە ترسەوە دەموت: «تاک زیندووە و جووتی لەیەکچوو مردوون».. خوویێکی زۆر سەیرم گرت و نەمدەتوانی وازی لێ بهێنم.. تا گەورەش بووم، هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵمدا ڕێی دەکرد.. هەر شتێکم دەبینی،

بیرم لە هاوەڵەکەی دەکردەوە.. ئەگەر هەیبووایەوە بە مردوو و نەیبووایە، بە زیندووم دادەنا.. لە جەستەی خۆمەوە دەستم پێ دەکرد، تا بزانم چەند ئەندامی تاک و چەندی جووتم هەیە.. دەست و قاچەکانم، هەردوو چاوم، هەردوو گوێچکەم، گورچیلەکانم، سییەکانم، دواتر هەردوو مەمکیشم مردوون.. کەللەی سەرم، قژە زەردەکەم، پشتم، سنگم، دڵم، هەندێ ئەندامەکانی ترم زیندوون.. من تاکەکانم خۆشدەویست و بەزەییم بە جووتەکاندا دەهاتەوە.. هەر ئەو بەزەییەش وای لێ دەکردم بترسم.. ترسێک، کە لە هیچ حاڵەتێکی تردا هەستم پێی نەدەکرد.. تەنگوچەڵەمەی من هەر ئەوە نەبوو بە دوای هاوەڵی شتەکاندا دەگەڕام، بەڵکو کاتێ دەمدۆزینەوە، ئینجا سەری گرفتەکە دەستی پێ دەکرد.. دەبووایە چاک و خراپیشیان لە یەکتر جوودا کەمەوە.. ئەمەیان بۆ من زەحمەت بوو، چونکە نەمدەتوانی حوکمی ڕاست و درووستیان لەسەر بدەم.. دواتر بۆم دەرکەوت چ پەیوەندی و نزیکیەکی سەیر و سەمەرە لە نێوان تاک و جووت و مردوو و زیندوودا هەیە.. وەکو پەیوەندیە بەتینەکەی نێوان قاوغی هەڵمات و کاکڵەکەی و نزیکیە سەیرەکەی نێوان ترس و خۆشەویستی.. ئینجا زانیم من دەستم داوەتە کارێکی قورسی واوە، کە زۆر زۆر لە توانای من و هەموو بەندەیەکی دیکەی ئەم سەر زەمینە بەدەرە.. من بەبێ ئەوەی بەخۆم بزانم دەستم خستبووە کاری غەیبەوە.. وەی..!! ئەو جارە چەند ترسام، کاتێ بۆم دەرکەوت من کوفرم کردووە..!! ئەوسا خەتاکەیم خستە ئەستۆی نەنکمەوە.. جا هەر بەڕاستییش خەتای ئەو بوو.. خەتای ئەو شەکردانە بوو، کە نازانم لە کوێی هێنابووە ئەو ماڵە و ئاوا وەکو بتی قورەیشی و ڕۆمانی منی پێ تووشی کوفر و گوناه کرد.. بەڵام خەتای خۆشمی تێدا بوو، نەدەبووایە ئەوەندە بیری لێ بکەمەوە و بیکەم بە خولیای شەو و ڕۆژم.. باش بوو شکاندم، بەڵام من نەمشکاند.. دایکم شکاندی و نەیهێشت لەگەڵیدا پیادا بچم و بزانم دەگەمە کوێ.. ئەوەشیان خەتای خۆم بوو.. خەتای ئەو بزێوی و چاوقایمیەم بوو.. پێڵاوە سپیەکیانیم بە سیکۆتین بەملا و بەولای شەکردانە ڕەشەکەوە چەسپ کردن.. ئیتر ڕێک لە دوو کێلی سپی سپی دەچوون و سیمای گۆڕیان بە شەکردانەکە

دا.. کاتێ بە لەرزە لەرزە سەری شەکردانەکەم هەڵدەدایەوە، هەر بەڕاستیی وامدەزانی سەری گۆڕ هەڵدەدەمەوە و لە مردوو دەڕوانم.. هەرکە دایکم هاتە مووبەقەکەوە و بینی، ڕاچڵەکی و یەک بە دەنگی خۆی قیژاندی:

ــ وای..!! وای..!! وای دایکە وای..!!

کەچی نەبووراییەوە و نەکەوت.. بەرزی کردەوە و کێشای بە سەرمدا و شەکردانەکەشی بە کاشییەکاندا...... ئانوسات خوێن بە هەر چوار دەوری سەرمدا هاتە خوارەوە و بە سەر شەکرە ڕژاوەکەی سەر کاشیە ڕەشەکانی مووبەقەکەدا دەتکا و دەیتواندەوە.. دەتکا و دەیتواندەوە.. لە هەر پارچەیەک لە چوار پارچە شکاو و ناڕێکەکانی شەکردانەکەشدا خۆم و خوێنم جووت جووت و زۆر بە ناشیرینی دەردەکەوتین.. ئینجا زانییم خوێنم بە شەکردانەکەی نەنکم ژەهراویی بووە.. بەڵام نازانم بۆچی نەمدەویست کەس بەو نهێنییە بزانێت.. وابزانم لەبەرئەوە بوو، بە قسەیەکی زۆر بێسەروبەر و بێمانام دەزانی.. بە لامەوە شەرم بوو بڵێم: «شەکردانەکەی نەنکم خوێنی ژەهراویی کردووم».. کاتێ لە دڵی خۆشمدا دەمووتەوە، قێزم دەکردەوە.... «پوورە شەرمن»م بە دەرمانە سوورەکە بۆی برژاندمەوە و بە لەفافێکی وەکو سەرتوێژی گامێش و لە شێوەی هێلکەشەیتانۆکە پێچای.. ژانی دەکرد و خەوم لێ نەدەکەوت.. ڕۆژی تەرزەبارانەکە هەر من و پوورم لە ماڵ بووین.. من بە سەری شکاوەوە لەسەر دۆشەکە ڕەشەکە پاڵکەوتبووم و سەرنجم لە پەنجەرەکە دەدا.. لەو هێڵە ئاویە باریک و لەیەکچووانە ورد دەبوومەوە، کە دەنکە تەرزەکان، لاسارانە، وێنەی پۆلە ڕیشۆڵەی سەرگەردان و چەواشە، خۆیان پیادا دەکێشا و بە توانەوەیان پێکیان دەهێنان.. دواییش لەسەر تاقە سپییەکەوە تێکەڵ بە یەکتر دەبوون و.... ئیتر وردە وردە چاوم ماندوو و پێڵووم قورس بوو.. قورستر بوو.... لەگەڵ دەنگی «دڵدار» بە ئاگاهاتمەوە و خێرا چاوم کردەوە.. ئەوە بەڕاستیی ئەو بوو..؟! بەڵێ، ئەو بوو.. بەڵام ئەم ئەوسا هاوڕێی خاڵم بوو، تەنها ئەو کاتانە دەهات، کە ئەو لە ماڵ بووایە، ئەی ئەوە بۆچی.......؟! بڵێم چی.. ئێستاش لە بیرمە ئەم جلێکی ڕەشی سادە و پوورم بلووز و پانتۆڵێکی قەدیفەی سپیی لە بەردا بوو.. هەردووکیان لە بەرامبەر

یەکتردا وەستابوون و پوورم بە دەرزی و دەزووێکی سپی قۆپچە سپییەکەی بە یەخەی ئەم دادەگرتەوە.. کە زانیم منیان نەدیوە، خۆم کردەوە بە نووستوو، دوو درزی بچکۆلەم کردە ئەم چاو و ئەو چاومەوە و لێم دەڕوانین.. ئیتر لەو دوو درزە بچکۆلە و ئاسۆییەوە، هەردووکیانم بە گەورەیی و بە ستوونییەوە دەبینی.. سووک و ئاسانیش دەمتوانی لە هەموو شتێک بگەم و جوان جوان لێکیان بدەمەوە.. پوورم کە هەرچوار کونی قۆپچەکەی بە دەزوو تەنی.. ئینجا بە مەکرێکەوە لە چاوەکانی ئەمی ڕوانی و پەرچەمە ڕەشەکەی، کە بە شانە تایبەتیەکەی خۆی تاڵ تاڵی کردبوو، بە سووکی و ئێجگار بەناز، لەسەر چاوەکانی، کە تا ئەو کاتە نەمدەزانی ئەوەندە جوانن، لادا.. کەمێ خۆی بەرزکردەوە و زۆر عەیارانە، لەسەر نووکی پێی وەستا.. بە سووکی، مەگەر هەر خۆی بزانێت بۆچی ئاوا بە سووکی، سەری خستە سەر سنگی و بە دان، بەبێ ئەوەی چاوی لە چاوی بتررووکێنێت، دەزووەکەی لە بنڕا قرتاند.. قرتاندی، بەڵام سەری لەسەر سنگی هەڵنەگرت.. نەخێر، ئینجا دەستەکانی، کە مووچڕک و تەزووی ئاڵۆشی لاسار و سەرشێت تەواو قورسی کردبوون، بە خاوخلیچکی، وەکو مەست، هەڵبڕی و کردنیە ملیەوە.. قژە خاو و پڕەکەی، کە تا ئەو کاتە لەژێر چەناگەی «دڵدار»دا، وەکو چەوە ورد ورد و ڕەشەکەی لە بنکی حەوزی ماسییەکانی خۆیدا ڕۆکرابوون و هەمیشە لەژێر تیشکی نە زۆر کز و نە زۆر بەتینی گڵۆپە شیریەکەدا دەدرەوشانەوە، لەنگەری گرتبوو؛ بە جووڵەیەکی دڵبزوێنی سەری، کە هیچ کەسێکی دی بێجگە لەو نەیدەزانی ئاوا بکات، کردنی بە دوو بەشی وەکوو یەک و بەملا و بەولای دەستەکانی «دڵدار»ەوە، کە بە توندی هەردوو شانی ئەمیان دەگوشی، شۆڕکردەوە.. بە جووڵەیەکی دیکە، سەری هەڵبڕی و دەمی، کە بێجگە لە بستەی سوور لە هیچی تر نەدەچوو، لە دەمی ئەم نزیککردەوە و لێوەکانی زۆر بە پەرۆشەوە بە لێوەکانیدا دەهێنا.... ئەنجام بۆی شل بوو.. هەر کاتێکم زانی لەولای منەوە پاڵکەوتن و دیمەنەکە لە بەر چاومدا لە ستوونییەوە بوو بە ئاسۆیی.. ئینجا زانیم کچ چۆن شەرمی لە کوڕ دەشکێت.. پێشتر هەمیشە خەمی ئەوەم بوو، کاتێ گەورەبووم چۆن لە ڕووم دێت بە کوڕ بڵێم: خۆشمدەوێیت.. ئەمەشیان بە

هەرحاڵ، چۆن دەتوانم پەنجەکانی بگرم و چاوەکانیشم، بەبێ شەرم ببڕمە چاوەکانیەوە.. ئینجا لەپڕ هەردوو دەستم لەملا و لەولاوە، لە پێشدا زۆر بە شلی و دواییش توند توند لە کەمەری بئاڵێنم، دەمم لە دەمی نزیک بکەمەوە و بە ماچە یەک لەسەر یەکەکانم مرِی بکەم..؟! لەمەوە زانیم بە دزیی چاوە هەمیشە زیت و بەئاگاکانەوە، ئەو چاوانەی لە یەک کاتدا بە ستوونی و ئاسۆیی شتەکان دەبینن، جەستە جیاوازەکان، بەبێ دەنگ و بەبێ چرپە، چەندیش بلێی بە حەز و ئارەزووەوە بە یەک دەگەن.. ئەوسا دەشێت دەنکە قۆپچەیەک، هەر تەنها دەنکە قۆپچەیەکی وردی چوارکونی و هیچی دی، تەواوی کارەکە مەیسەر بکات.. دەسا وابوو، بە هەڵەدا نەچوو بووم.... من ئەوسا لە هەموو کاتێکی دیکە زیاتر بیرم لەوە دەکردەوە، کە «شەرمن»ی پوورم خوشکی ڕاستەقینەی دایکم نییە و بە منداڵیی هەڵیانگرتۆتەوە.. خۆشم نەمدەزانی بۆچی بووبووە خولیای شەو و ڕۆژم و دەمویست بگەمە بنجوبنەوانی.. نەدەبووایە ئەو جارەی «باجی نازێ»ی ژنی «مام نیزام»ی مفەوەزپۆلیسی ترافیک بۆی باسکردم، ئاوا شپرزە و سەغڵەت بوومایە، بە ڕادەیەک ماوەیەکی زۆر بێ هۆش ببم و دواییش حەیران و سەراسیمە، بەبێ ئەوەی بتوانم دەمهەڵێنمەوە و تاقە وشەیەک بڵێم، لە چاوەکانی ڕامێنم.. وا نەبووایە ورد و باریکتر بۆی باس دەکردم و لە کرۆکی مەسەلەکەی دەگەیاندم.. ئەم کاتێ زانی من بەرگەی هەواڵی ئاوا ناگرم و ڕەنگە هەر ئێستا نا ساتێکی دی گیانم دەربچێت، پێی وتم:

ــ من گاڵتەم لەگەڵدا کردیت ئاشنا.. تۆ چەند زوو باوەڕت کرد..!!

دواییش وتی:

ــ خۆ من وامدەزانی تۆ گەورە بوویت.. نەمدەزانی هەر منداڵە ساویلکە و خۆشباوەڕەکەی جارانیت..!!

بەڵام گاڵتەی نەدەکرد و زۆر بەڕاستییشی بوو.. ئینجا بیرم لە قسەکانی ئەو جارەی کردەوە و چاک لێیان تێگەیشتم، کاتێ بە نەنک و پوورمی دەوت.. ئەمە ئەو جارە بوو، کە من و «ڕۆشنا» هەتاوی ئێجگار گەرمی تەمووز پێستی سووتاندبووین و دەبووایە هەموو ڕۆژێ دوو جار بە دەرمانە سپیەکە خۆمان

بشـۆین.. چ بۆنێکی ناخـۆشی هەبوو ئەو دەرمـانەش، چاوی دەکـزاندمـەوە و ڕەنگوڕووی شـتـەکـانم تەواو لێ دەگـۆڕان، کـەچی «ڕۆشنا» وانەبوو.. دایکم هەردووکمـانی بە یەکەوە دەشت و دواییش لەژێر سێبەری دارهەنجیرەکەدا نەنکم و پوورە «شـەرمن»یش بە کرێمە سپییەکە چەوریان دەکردین.. ئینجا ئەمیان جلی لە بەر من و ئەویان لە بەر «ڕۆشنا»ی دەکرد.. جارێکیان «هەڵۆ»ی کوڕی «مام نیزام»، لەسەر دیوارەوە، لەو شوێنەی هەموو جارێ پشیلە سپیەکە لێیەوە هەڵدەترووشکا، ملی هەڵکێشابوو، زەق زەق لێمان ڕادەما.. ورد ورد سەرنجی دەداین و بزە دەیگرت.. نەنکم سەری هەڵبڕی و بینی.. تفێکی بۆ هەڵدا و خاولیە ڕەشەکانی لێ کردینە پەنا:

ـ سەیری چی دەکەیت چاوحیز..؟! کوڕی نیزامە کەچەڵ.

کـەچی ئەم گـوێی بە قـسـەی نەنکم نەدەدا.. نەنکم دوای ئەوەی تۆپەڵێ جنێوی دیکەی بە خۆی و دایک و باوکی دا و ئەم هەر لامسەرلایی لێ کرد، تاکێ پێڵاوی دایکمی لەسەر کاشیە ڕەشەکان هەڵگرت و پەلاماری دا.. بە توندی و تا هێز و توانای تێدا بوو کێشای بە سەریدا و بە پشتدا کەوتە حەوشەکەی خۆیانەوە.. دەگریا و هاواری دەکرد.. ئەوەندەمان نەزانی «باجی نازێ»ی دایکی بە شاتە شات لە دەرگاوە پەیدا بوو.. ناوچەوانی بە پەڕۆیەکی سپی بەستبوو و قامچیەکی ڕەشیشی گرتبوو بە دەستیەوە.. ئەوسا پوورم چووبوو بۆ حەمامەکە، بۆ ئەوەی پشتی دایکم بشوات.. بەجووتە گۆرانییان دەوت و لەبەر دەنگی خۆیان گوێیان لە هاوار هاواری «باجی نازێ» و زریک و هووڕی نەنکم نەبوو.. من و «ڕۆشنا»ش ئەبڵەق و سەراسیمە سەیری یەکترمان دەکرد و دەگریاین.. دەگریاین و نەماندەتوانی بچین بانگیان بکەین.. کاتێ پوورم هاتە دەرەوە، «باجی نازێ» کاری خۆی کردبوو.. هەرکە بینی دڵڕەقانە بە قامچیە ڕەشەکە لە نەنکمی دەدا، شێت و هار بوو.. چاوەکانی خوێنیان تیا زا و دەمارەکانی ملی کرتەکرتیان پێ کەوت.. هەر خێرا خۆی گەیاندە سەر سەری و هەردوو قاچی هەڵبڕی.. لەولاتر خستیە سەر کاشیەکانەوە و بە دەمدا کەوت.. بە لەقە لە سەری دەدا و ئەم تا تینی تیا بوو دەیقیژاند.. دایکم ڕۆبەکەی لەبەرکردبوو و بە پرتاو هاتە دەرێ.. هات و توند

توند دەستەکانی پوورمی گرت.. پاڵێکی بەهێزی پێوە نا و دووری خستەوە.. «باجی نازێ» خوێن لە دەم و لووتییەوە دەهاتە خوارێ و وردە وردە یەخەی کراسەکەی سوور هەڵدەگەڕا.. ڕووی کردە پوورمەوە و بە شێوەیەکی زۆر سەیر پێی وت:

ــ خۆزگە هەموو زۆڵێ ئاوا وەکو تۆ بەوەفا بوونایە دەرهەق بەوانەی گەورەیان کردوون.

دایکم و نەنکم بە حەپەساویەوە لە یەکتریان ڕوانی و سەریان لەبەر نا، کەچی ئەم نەیبڕیەوە.. بە پەنجەکانی خوێنی دەم و لووتی دەسڕی و جنێوی دەدا:

ــ قەحپەی کچی قەحپە وات لێ هات لەمن بدەیت..؟!

ــ لەناو ماڵی خۆمان لە دایکم بدەیت و بێ دەنگ بم..؟! ئاوا هەردوو چاوت دەردەکەم.

ئەم ڕووی کردە ئەولاوە و بە گاڵتەپێکردنێکی زۆر سەیرەوە وتی:

ــ ئای لەوە..!! خۆ دەڵێ دایکمە..!!

ئینجا لە نەنکمی ڕوانی و هەر بە تەوسەوە پێی وت:

ــ چەند بەزەییم بەوانەدا دێتەوە، کە نازانن کێ دایک و باوکیانە..!! ئەو بێچووەقازانە چەند داماون، کە لە هێلکەی ژێر مریشکی کڕدا سەریان دەجووقێت..!!

نەنکم ئەوەندەی دی شڵەژا و ڕەنگی هەڵبزڕکا.. هێندەی دیکە زمانی لە گۆکەوت و ئارەقی کردەوە.. ئەمیش بەبێ وەستان جنێوی خۆی بە یەکە بە یەکەمان دەدا و هاوکات بە جووڵەی دەست و دەموچاوی تەمسیلی جنێوەکانی دەکرد.. تەنانەت تا ئەو کاتەی گۆرانیی «پەلکەزێڕینەی سوور»ی «نیشتیمان»ی پوورزای دایکیشم لە ڕادیۆی یەکێ لە ماڵەکانی گەڕەکدا بەرزبووەوە، ئەم هەر نەیبڕیبووەوە:

ــ ئێوە گەورە و بچووکتان قەحپەن.. قۆندەرەن.. هیچوپووچن.. ناکەسبەچەن.. کەس نەماوە لەم شارە ئێوەی....... دادە ڕازیە ئەوە نیشتیمان کەی ئەم گۆرانییەی وتووە..؟!

ــ ئەوەندە نییە.
ــ ئەی چۆن من نەمزانیوە..؟!
دایکم بە خۆبادانێکەوە پێی وت:
ــ شیعری شەرمنە.
ئەم یەکسەر ڕووی بەلای پوورمدا وەرگێرا و بە حەپەساویەوە لێی پرسی:
ــ وایە شەرمن..؟!
ــ بۆچی نەتدەزانی..؟!
ــ لە کوێ بیزانم، ئەگەر تۆ پێم نەڵێیت..!!
ئینجا بە گلەییەوە پێی وت:
ــ خۆ ئێوە هیچ شتێ بە من ناڵێن..!!
ــ وانییە نازێ گیان، بەڵام من وامدەزانی تۆ زانیوتە.
ئەم لە هەموو کەسێ زیاتر شێت و شەیدای گۆرانیەکانی «نیشتیمان» بوو.. هەر جارێ ئەم لە «سلێمانی»ـەوە دەهات بۆ سەردانی ماڵی نەنکم، ئەو لە بەرامبەری دادەنیشت و داوای لێ دەکرد گۆرانیی بۆ بڵێت.. هەر ئەوەندە ئەم دەنگی لێ هەڵدەبڕی، ئیتر ئەو دەستی دەکرد بە گریان.. دڵۆپێ فرمێسکی چاوەکانی ئەمیش بەس بوو بۆ نەنکم تا لەو بەکوڵتر بگری و دایکم و پووریشم لەگەڵ خۆیدا بێنێتە گریان.. ئەو جارەش چی کرد بە گریان..!! فرمێسکەکانی ورد ورد دەهاتنە خوارێ و تێکەڵ بە خوێنی دەم و لووتی دەبوون.. نەنکم پێی وت:
ــ دە بەسە نازێ گیان.. تۆ بۆچی ئاوا لە خۆت دەکەیت بە قوربانی چاوەکانت بم.
دایکم دەستی کردە ملیەوە و تێر تێر بۆی گریا:
ــ تۆ نابێت ئەوەندە هەست و دڵت ناسک بێت.. وا بڕوات بەرگەی چەند ساڵێکی تر ناگریت بە ساقەت بم.
ئەو گۆرانیە نەبووایە ئەو ڕۆژە «باجی نازێ» هەموو شتێکی دەوت.. من ئەوسا منداڵ بووم و لە توانامدا نەبوو بە ئاسانی لە لوغزەکان بگەم، ئەگینا ئەوەندەی وتیشی کەم نەبوو.. دواتر زانیم، کە پوورم خۆی زۆر چاک ئەمە

دەزانێت، بەڵام گـوێی ناداتـێ.. ئاخـر ئـەم حـیـسـابی بۆ هیچ شـتـێ نەدەکـرد.. دوای ئەوەی لە «دڵدار»یش جیابووەوە، وەکو سۆزانی ئیشی دەکرد و ناوبانگی بە هەموو شاردا بڵاوبووەوە.. من دوای مردنی دایکم لەگەڵیدا دەژیام و ڕۆژانە هەر پێم دەکرا دەرگا لەم و لەو بکەمەوە.. دەبووایە شەوان درەنگ درەنگ بە کرێم ناوگەڵی چەور بکەم و پەنجەکانم تا ناوەوەی بەرم.. لە بەرچاومدا وەکو تەڵەمشکی خوێناویی دەردەکەوت و قێزم دەهاتەوە.. هێڵنجم دەدا و زۆر جار دەرشامەوە.. لەمەوە بێزم لە پیاویش دەهاتەوە و هەرگیز باوەڕم نەدەکرد ڕۆژێ لەگەڵ هیچ کامێکیاندا بژیم.. کەچی ئەم هەر خێرا خەوی لێ دەکەوت و ئاگای لە دنیا نەدەما.. من جاران چەند بە هەڵە لە سۆزانییەکان گەیشتبووم.. وامدەزانی ئەوەندە بیر لە ڕابردووی خۆیان دەکەنەوە، ئارامیان نییە، بەڵام وا نەبوو.. من بەخیلیی بە سۆزانی دەبەم، کە ڕابردووی نییە.. ئەگەر هەشیبێت پیاوی تێدا نییە.. پیاو دەتوانێ بە ئاسانی دەست بەسەر جەستەی هەر سۆزانیەکدا بگرێت و بۆ ماوەیەک بیکات بە هی خۆی، بەڵام هەرگیز ناتوانێ دوو پێی بخاتە ناو یادوەریەکەی.. لە زاکیرەی سۆزانییدا هەموو نێرینەیەک مردووە.. ئەوێ تاقە شوێنێکە خاڵی بێت لە دەستەڵاتی پیاو.. من ئەو قێزکردنەوە و دڵتێکهەڵاتنەم نەیانهێشت ببم بە سۆزانی، ئەگینا چاکترین پیشە بوو بۆ من.. وەکو شاگرد لای پوورم بمابوومایەتەوە باشتر بوو لەو شووەی کردم.. ئەوەتا ئێستاش قێزکردنەوە و ڕشانەوە بەسەر دنیاوەیان نەهێشتووم و لە هەموو کاتێکی دی زیاتر گومان لە ڕابردووی خۆم دەکەم.. ئەوەندەی دیکە ژیانم تێکەڵ بە ئەفسانەکان بوو و تازە زەحمەتە بەم خەیاڵانەوە لەم دنیایە جێگام ببێتەوە.. ئەوەتا جارێکی دیکەش ئەو پرسیارە شوومە بڕستی لێ بڕیوم و بە تەواوی لە دەوروبەرەکەمی دابڕیوم.. هاکە کارەساتێکی گەورە ڕووی دا..!! ئاگاداربن ئێستا نا ساتێکی دی دەنگی گوللەیەکی وێڵتان گوێ لێ دەبێت..!!

* ئەم چیرۆکە ساڵی ١٩٨٦ لە مووسڵ نووسراوە و ساڵی ١٩٩٧ لە دانمارک

دەسکاریی کـراوە.. لێی لابراوە.. بۆی زیاد کـراوە.. ڕێنووســەکـەی هاتیـتــە گۆڕان، بەڵام بیرۆکە سـەرەکیەکانی هـەر وەکو خۆیان ماونەتەوە.

* ئەم چیرۆکە دایکی ڕۆمانی «ئای لەڤیلیا لەڤیلیا..!!»یە، کە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە سلێمانی بڵاوی کردۆتەوە.

## کارگەی بووکەشووشە

پێشکەشە بە بیلیندا، ئەو ژنە دانیمارکیەی گۆڕی منداڵییم پێدەزانێت

«شــاخــەوان جــەنگۆ»ی بەندیەوانی شــۆڕشی نوێی رزگــاری پێش ئەوەی خەنجەرەکە بکات بە ورگی خۆیدا و بێبەزەییانە هەڵیدڕێت، هەموو کارەکانی بە رێکی ئەنجــام دابوو و هیچ باکی بە مــردن نەبوو.. ئەم بە ئاســانی ئەو قەناعەتەی لا نەخولقابوو، بەڵکو دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر و گینگلدانی بەردەوامی شــەوان لەناو جێگادا بۆی دەرکەوت، کە هیچ رێگایەکی لە بەردەم نەمــاوە و دەبێت بمرێت.. ئەم لەو ڕۆژەوە شاری بەجێهێشتبوو و چەکی کردبووە شان، دەیان جار بیری کردبووەوە و لە خۆی پرسی بوو: «ئایا ژیانی من لێرەوە تەواو دەبێت، کاتێ گوللەیەک شوێنێکی ئەم جەستەیەم دەبڕێت و رۆحم لە جــووڵە دەخــات..؟!» لە شــەڕێکدا چاوی چەپی لە دەست دا و دوای چاکبوونەوەی زۆر لە جاران گەرمتر تێهەڵچووەوە، بەڵام کاتێ چاوی راستی کەوتە ئێش و رۆژ بە رۆژ کزتر دەبوو، ئیتر توانای ئەوەی نەما لە نەبەردەکاندا بەشــدار بێت و لەگــەڵ «ســمکۆ قــەڵغــان»ی پاڵەوانی شــەڕەکــانی «لاوێن» و «بارزین»، کە قاچەکانی لە کەلک کەوتبوون و توانای رۆیشتنی ناو شاخ و داخە سەختەکانی نەما بوو، کردیان بە لێپرسراوی ئەم بەندیخانەیە و کۆمەڵێ ئەرکیان خستە سەر شانی.. ئەگەرچی ئەمە سەرەتا بۆ ئەوێک، کە هەمیشە لەگەڵ هەڤاڵەکانیدا لە پێشبڕکێدا بوو و دەیویست بەهەر شێوەیەک بێت بۆڕیان بداتەوە، تێکشکانێک بوو و زۆر جــار پێــوەی دەتلایەوە، بەڵام ئارامی دەگــرت و دڵی خــۆی بەوە دەدایەوە، کــە ئەمــەش ئیــشــێکە و دەتوانێت لەو

ڕێگەیەوە پارێزگاری لە ناوبانگەکەی بکات.. دوایی بۆچوونەکانی تەواو گۆڕان و هەستی کرد ئەمە دیارییەکی خواوەندییە و ڕۆحێکی پاکیزە پێی بەخشیوە.. ئەم شوێنی بەندیخانەکەیشی چەند بڵێی بەلاوە خۆش بوو و زۆر دڵی پێی دەکرایەوە.. ئەگەر لە چیرۆکێکدا وەسفێکی ئاوای بخوێندایەتەوە، سەری لە کاری ئەو چیرۆکنووسە سوڕ دەما، کە توانیویەتی بە وشە ساختمانێکی ئاوا بخوڵقێنێت، بەڵام ئەمە نە چیرۆکە و نە هەقایەت، بەڵکو ڕاستییە و تێیدا دەژی.. لە یەکەمین نامەی دوای چاکبوونەوەیدا، کە بە نهێنیی بۆ «سامال»ی دایکی نارد، نووسی: «لە شوێنێکدام مەحاڵە من بتوانم وەسفی بکەم و تۆش بە ئاسانی هەست بە سیحری جوانییەکەی بکەیت، بەڵام بۆئەوەی کارەکە کەمێ ئاسان بکەم، ئەوا تۆ خانوویێک بێنە بەرچاوی خۆت، کە لە خشتی وەکو پەشمەک درووستکراوە و لە ئاسمانەوە، ڕێک لەو شوێنەی تەمومژە ئێجگار چڕەکان ڕەنگی ڕاستەقینەی هەموو شتەکان کاڵدەکەنەوە و بەتەواوی سیمایان دەگۆڕن، هەڵیدەدەنە خوارەوە و چوار شاخی بەرز لە شێوەی بازنەیەک دەستەکانیان بۆی ڕادەگرن.. ناهێڵن بکەوێتە سەر زەوی و تا دنیا دنیایە داینانێن».. ئەم لە هەر نامەیەکدا بە شێوەیەک باسی جوانی و نهێنییەکانی ئەوێی دەکرد و دڵخۆشیی خۆی لە کارەکەی دەردەبڕی.

دایکی هیچ خۆشیی لەو قسانە نەدەهات و تا بڵێی رقی لە سەرەڕۆیی کوڕەکەی بوو.. ئەو لە بنەماڵەیەکی خانەدانی شار بوو و حەزی دەکرد هەموو کارێ بە هێمنیی مەیسەر بێت.. دەیویست نۆبەرە بێباوکەکەی بە ڕێگەیەکی شارستانیانە گەورە بکات و نەهێڵێت تێکەڵ بە منداڵە چوختیەکان ببێت، بەڵام ئەم هەر لەو ڕۆژەوە پێی گرت و چووە کۆڵان، لێی یاخی بوو و هیچ شتێکی لە منداڵانی گەڕەکی «ڕووناکی» نەدەچوو.. کەللەڕەقی وەکو خۆی نەبوو و ئەو دایکەی تەواو هەراسان کردبوو.. «حەیات خان»ی نەنکی هەموو جارێ سەری لێ بادەدا و پێی دەوت:

ــ تۆ لەو منداڵە دەچیت، کە حەفتەیەک بۆ گوێز وڕک دەگرێت، کاتێ باوکی لە تینیدا نامێنێت و هەموو ددانەکانی بە گاز دەردەهێنێت، ئیتر مانگێکیش بۆ شەربەتی گوێز لە سەرانیان دەگرێت.

نەنکی ڕۆژانە بە دوایەوە بوو و هەر جارێ لە گەڕەکێ دەیهێنایەوە.. جارێ لە «سەیداوە» و جارێ لە «تەعجیل» لای منداڵە هاروهاجەکانی تری ئەوێ.. ئەنجام لەسەر شەقامی شەستی، لە نێوان «سەیداوە» و «ئیسکان» ئیڤایەکی سەربازی گیانی شێلا و بۆ هەتا هەتایە لە جووڵەی خست.. ئەمە لە ڕۆژێکی باراناویی سەرەتای پایزدا ڕوویدا و ئەم بە چاوی خۆی لاشەکەی بینی.. ئەم خۆیشی نەیدەزانی بۆچی ئەوەندە دڵی لەو گەڕەکە هەژارنشینانە دەکرایەوە و ئەوەندە بە هەڵسوکەوتی ئەو منداڵانەی ئەوێ سەرسام بوو.. فێری هەموو جنێوە سەیرەکانیان بووبوو و لاسایی جلوبەرگە تەسک و پەڕپووتەکانیانی دەکردەوە.. کەس نەیدەزانی کوڕی بێوەژنێکی زۆر دەوڵەمەندی شارە و کۆمەڵێ خانووی گەورەی شوێنە ستراتیژیەکان و ریزێ دووکانی ناو بازاڕ هی ئەمانە.. ڕقی دنیای لەو ناوە ناسکەی خۆی بوو و دەیان جار جنێوی بۆ باوکە گۆڕبەگۆڕەکەی ناردبوو، کە ناوی ناوە «هاوژین» و لە ناوی هەموویان جیاوازە.. لە شاخ خۆی کرد بە «شاخەوان» و لەبەر بەشداربوونی زۆری لە شەڕە خوێناوییەکاندا، نازناوی «جەنگۆ»یان پێ بەخشی و بە قەدەر هەموو دنیا شانازیی پێوە دەکرد.. کەچی دایکی هەر لە سەرەتاوە حەزی لەو ناوانە نەبوو و هەمیشە نامە نهێنیەکانی بە ناوی راستەقینەی خۆیەوە بۆ دەنووسی.. لە هەمووشیاندا داوای لێ دەکرد بێتەوە شار و خوێندنەکەی تەواو بکات.. دواییش هەوڵی دەدا بیهێنێتەوە و لە پرۆژە تازەکانی یارمەتیی بدات.. «ئەوەتا ئەو لەو گەڕەکە تازەیەدا ژیانێکی دیکەی دەستپێکردووە و لەگەڵ مێردی دووەمی و ئەو دوو منداڵەیدا ژیانێکی جیاواز لەوەی پێشووی بەسەر دەبات، کە هەردووکیانی بە سکێ بووە».. ئەو لە شۆڕشی رزگاریی پێشوودا مێردی یەکەمی لە دەست دابوو و نەیدەویست مەرگی تاقە کوڕە هەرزەکارەکەیشی ببینێت.. مێردەکەی، کە بەڕێوەبەری بەناوبانگترین بانک بوو، لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕش هەموو قاسەکانی بەتاڵکردبوو و چووبووە شاخ، کەچی دوای چەند مانگێ دەرکەوت ناپاکە و خرایە زیندانەوە.. بەرگەی ئەشکەنجەی سەختی ئەوێی نەگرت و هەر ئەو ڕۆژە گیانی دەرچوو.. ئەوسا «هاوژین» تەمەنی دوو ساڵ بوو و ئێستا خۆشبەختانە

ئەمەی بیر نایەت.. هەر جارێکیش بیەوێت بیر لە منداڵیی خۆی بکاتەوە، یەکسەر ئەو ژنانەی بیردەکەوێتەوە و لە شێوەی تارماییی دەکەونە بەر دیدەی، کە قژی زۆر درێژ و ئێجگار رەشیان کردبووەوە و بە چڕنووک کۆمەڵێ هێڵی سووریان لەسەر دەموچاوی خۆیان کێشابوو؛ لە باخەکەی ئەماندا بە دەم گریانەوە گوڵی رەنگاورەنگیان دەڕواند و زرووکوهووڕیان دەگەیشتنە گوێچکەی ئەم، کە بە تراکسودێکی مشەماوە لە بەرامبەر پەنجەرەی ژووری میوانی نهۆمی دووەمی ماڵەکەیان وەستابوو و سەیری دەکردن.. ئەوسا ئەو جووتە حاجی لەقلەقەی هێلانەی قووچەکییان لەسەر ترۆپکی منارەی مزگەوتەکەی ناو بازاڕدا کردبوو و زۆر جار بۆق و پووشکەبەقنگەیان لەو گۆمەی ئەوبەری ماڵی ئەمان راودەکرد، ئەوەی دوایی پڕیانکردەوە و کردیان بە «مونەزەمەی یەرمووک»؛ لەسەر دیواری کەمێ بەرزی حەوشە وەستابوون و سەیریان دەکردن.. ڕۆژی دامێنی ئاسمانە بێگەردەکەش وەکو قازێکی خەڵتانی خوێن سست سست باڵەکانی رادەوەشاند و لەناو تاریکاییەکی کەمێ تۆخدا گەوزی دەدا.. ورده ورده رۆدەچوو و لە چاوی ئەم وندەبوو.. ئەوسا گلۆپە پەمەییە ستوونیەکانی قەدی هەر چوار بۆریی کەپری مێوەکە بەشێوەیەکی زۆر جیاواز ژنەکان و حاجی لەقلەقەکانیان دەردەخست و هەر جارێ وەکو شتێ دەکەوتنە بەر بینایی.. ئەم زۆر حەزی دەکرد سەیری قژی درێژی دایکی بکات و بە وردی سەرنجی لێ بدات، کاتێ بە تۆقەیەکی لەقلەقی سپیی کەمێ پان لە ئاستی ملیدا دەیبەست و لە شێوەی گەڵای دارخورما بەسەر بلووزە سپیەکەیدا شۆڕدەکردەوە.. جا ئەگەر ئەو ئەژنۆکانی بخستایەتە سەر زەوی و بە حاڵ سمتی لەسەر قولاپەپێکانی دابنایە، وەکو هی کاتی نوێژکردن لە حاڵەتی خوێندنی تەحیاتدا، ئەوا سەری تاڵەکانی قژی زۆریان نەدەما بنی پێکانی داپۆشن، کە جووتیکردبوون و بە ستوونیی لەسەر کاشیە خاڵدارەکانی ژووری نووستندا داینابوون.. جارێکیان لە خەونیدا بینی هەر ئاوا رووی کردبووە ئاوێنە باڵانوماکە و دانیشتبوو.. سەرۆکی مونەزەمەکە، کە چوارشانەیەکی چاوڕەش بوو و بە جلە خاکیەکانیەوە رێک لە وێنەی سەر پارەی وڵاتێکی بیانی دەچوو؛ دەستی بە قژیدا دەهێنا و بە زمان بنی پێکانی

بۆ دەلستـەوە.. ئەم لە پەنجەرەکەوە سەیری دەکردن و موچورکەی پیادا دەهات.. بەیانی، کاتێ خەبەری بووەوە، لەبەر ئازاری قورگی نەیتوانی لەناو پێخەفەکەی بێتە دەرەوە و ئەو ڕۆژە نەچوو بۆ قوتابخانەش.. نەنکی سووک سووک ناوچەوانی بۆ دەشێلا و جار جار کەمێ شیری گەرمی دەدایە.. هەستی دەکرد چاوەکانیشی ئازاریان هەیە و شتەکانی ژوورەکەی وەکو تارمایی دەبینی.. دایکی جووتێ گوارەی سپیی وەکو پارەی سەردەمە زووەکانی کردبووە گوێچکەیەوە و پاڵتۆیەکی خوریی رەشی درێژی پۆشیبوو، پێش ئەوەی پێڵاوە کەمێ بەرزەکانی لەپێ بکات و وەکو هەموو بەیانیەکی دی بچێت بۆ دەوام، هات بۆی دانەویەوە و روومەتە گەرمەکانی ماچکرد.. ئەم وەکو ئەو فەردە پڕ لە خۆڵانەی سەربان و بەردەمی مونەزەمەکە دەهاتە بەرچاوی و دڵی دەکەوتە ختووره، کە لەسەر یەکتر هەڵچنرابوون و بە رەنگی رەش بۆیەیان کردبوون.. هەرچەند لە تاو ئازار پێڵووەکانی قورس دەبوون و بەسەر گلێنەکانیدا دەکەوتن، خەونی بە مونەزەمەکەوە دەبینی و سەرنجی لە دایکی دەدا، کە بە توێی کراسێکی توولی سپیی تەنکی بە پووشکەبەقنگەی رەنگاوڕەنگ نەخشاو و بە دەم گۆرانیی «دلعنی یا گمیل فی فرح بلدی»یەوە لەسەر فەردە خۆڵەکان سەمای دەکرد و دەستەیەک پاسەوان دەفیان بۆ لێدەدا.. بۆقەکان، کە هەر یەکەیان بە قەدەر تەختەسڕی پۆلەکەیان دەبوون و نەیدەزانی چی گەیاندبوونیە ئەوێ، لەژێر قاچەکانیدا دەفلیقانەوە و دەنگێکی سەیریان لێ بەرزدەبووەوە.. تێکەڵ بە دەنگی دەفەکان دەبوون و ئاوازێکی ترسناکیان دەخولقاند.. خۆیشی نەیدەزانی ئەم بوو بە ناخی زەوییدا ڕۆدەچوو، یان فەردە خۆڵەکان بوون بەرز دەبوونەوە و لە شێوەی شاخێکی سەخت دەردەکەوتن، بەڵام ئەوەندەی دەزانی ئەم هەستی بە ورووژانێکی سەیر دەکرد، کە تێکەڵ بوو لە رقی ئەستوور و لەزەتی قووڵ.. دواتریش هەر جارێ نەخۆش بکەوتایە و تای گەرم لە جێگادا بیخستایە، ئەو دیمەنەی بیردەکەوتەوە و بۆ ماوەیەک قینی لە خۆی و لە دایکی و لە هەموو شتێ هەڵدەستا.. کەچی دوای ئەوەی چاکدەبووەوە و پێیدا دەچووەوە، لەزەتی لێ دەبینی و خەیاڵەکانی وەکو تیری تیرهاوێژە شارەزاکانی دوتوێی کتێبە مێژووە

کۆنەکان هەموو ئەو دیوارانەیان دەبڕی، کە لە حاڵەتی ئاساییدا بۆیان نەدەکرا و ئاوا پەیان بە شوێنە سەخت و دوورەدەستەکانی ئەودیوی بیرکردنەوە نەدەبرد.. لەوێدا بە دوای حاڵەتێکدا دەگەڕا هەم لە ڕۆچوون بچێت و هەم لە هەڵکشان.. ئازاری جەستە دەیتوانی چاکتر خەیاڵەکانی بە قووڵاییی ناخیدا بەرێت و بە هەورازەکاندا سەریانخات، بەڵام ئەمە ئەو هەستە بوو، کە ئەم لێی بێ بەش بوو، یاخود نەیدەتوانی بە ئاسانی لە ماڵ و لە کۆڵان و لە گەڕەکەکەیدا بەدەستی بهێنێت.. منداڵ نەمابوو لەو قوتابخانەیەی «رساله» شوێنی چڕنووکەکانی ئەمی بەسەر ڕوومەت و چەناگەیەوە دیار نەبێت، یان دەم و لووتی پڕنەکردبێت لە خوێن.. کەچی مامۆستاکانی لێیان نەدەدا و تەنها پێیان دەوت:

ــ حەیف و مەخابن تۆ کوڕی ئەو دایک و باوکەیت..!!

ئەو جارەی «فیراس»ی کوڕی سەرۆکی «مونەزەمەی یەرمووک»ی بردە ژووری کتێبە کۆنەکانی حەوشەی ئەودیوی قوتابخانە و خشتی سووری بە قاڵبی خشتەکەی بڕی، پۆلی شەشی سەرەتایی بوو و چەند ڕۆژێکی مابوو بۆ تاقیکردنەوەی کۆتاییی ساڵ.. مامۆستای چاودێر گرتی و دایە دەست بەڕێوەبەر.. ئەو ڕۆژە بەڕێوەبەر و مامۆستا و قوتابییەکان لە ترسا هەڵدەلەرزین و ئەم بە تەنیا بە خەیاڵیدا نەدەهات.. ئێوارەش دایکی دەستی چەپی لەسەر شانی ڕاستی و هی ڕاستی لەسەر شانی چەپی دانابوو و بەدرێژاییی ژووری میوان پیاسەی دەکرد.. هەموو گیانی هەڵدەلەرزی و ناو بە ناو هەر بەو ترسەوە لەمی دەڕوانی.. هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و دەیوت:

ــ هەر ئەم جارە بە ساغی بۆم دەرچێت.....

تەواوی نەدەکرد و بە زرووکەی گریانێکی کپ کۆتاییی پێ دەهێنا.. دەستەکانی دەگرت بەملا و بەولای ڕوومەتەکانیەوە و لە دەرگاکەی دەڕوانی.. چاوەڕێ بوو لەناکاو هەڵکوتنە سەر ماڵەکەیان و بیانخەنە ئۆتۆمۆبیلە جامتەڵخەکانەوە.. بۆ سەردابە تاریکەکانیان بەرن و تا ماون لەوێیان بهێڵنەوە.. «هیام حەمدان»ی دراوسێیان، کە هەموو ساڵێ دووانەیەکی لەبار

دەچوو و ناوی هەمووویانی بە سووری تۆخ لە سەر دیوارەکانی ژووری نووستنەکەیان نووسیبوو، سەری ئەمی دەنووساند بە سنگە نەرمەکەیەوە و بە زمانەکەی خۆی و بە دەنگێکی پڕ لە ترسەوە پێی دەوت:

ــ نەدەبووایە ئاوا بکەیت رۆحەکەم، نەدەبووایە..!!

«هیام» بۆ دڵنەوایی لایان مایەوە و شەو لەپاڵ خۆیدا نواندی.. ئەم هەستی دەکرد گەورە بووەوە و ناتوانێت ئاقڵ و سەنگین لە باوەشی ژنێکی جواندا بنوێت، کە رۆژانە بە چاوی خۆی دەبینێت هەرزەکار و گەنجەکانی ئەم گەڕەک و ئەو گەڕەک شەڕی پێ دەفرۆشن و ماتۆڕ و ئۆتۆمۆبیلەکان هەمیشە لە ئاست ماڵەکەیاندا هێواشدەکەنەوە.. ئەگەر لەسەر قولەپێکانی دابنیشێت و کەمێ خۆی بە لای پشتدا لار بکاتەوە، ئەوا گومانی تێدا نییە ئەو قژە درێژەی، کە هەر جارێ بە رەنگێ بۆیەی دەکات و لە بەرتیشکی هەتاو و گڵۆپەکاندا بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەبریسکێتەوە؛ دەتوانێت بنی پێکانی دابپۆشێت و ئەوسا ئەم هەموو گیانی بەژێر لەزەتدا دەکەوێت.. بیری لەو جارە دەکردەوە و دەمارەکانی بەشێوەیەکی سەیر دەکەوتنە کرتەکرت، کاتێ بە کراسێکی تووڵی تەنکەوە لەو ژوورەی نووستن بەرامبەر ئاوێنە بالانۆماکە ئەم دەست و ئەو دەستی ئەمی گرتبوو و بەدەم گۆرانیی «صباح الخير يا لوله»وە سەمای دەکرد، کە لە ریکۆردەری سەر مێزە فۆرمیکاکەی سووچی ئەوسەرەوە بەرزدەبووەوە و لە ژوورەکەدا دەنگی دەدایەوە.. خەیاڵەکانی کەوتبوونە باڵەفڕەیەکی بێمانا و لە هیچ شوێنێکدا نەدەسرەوتن.. دوای ئەوەی تەواو ماندووبوون و ئارەقیان کردەوە، «هیام» دەستی گرت و بردی بۆ حەمامە کەمێ تاریکەکە، ئەوەی لە ژێرزەمینێکدا بوو و بە برینی چوار پێنج پلەی قادرمەی کەمێ بەرز دەگەیشتنە بەر دەرگاکەی.. لەوێ چەند مشتێ ئاوی ساردی کرد بە دەموچاوی ئەمدا و قاچە رووتەکانی خۆی خستە ژێر ئاوی بەلووعە بەرزەکەوە.. ئەم سەرنجی لێ دەدا و بیری لە «خاڵە سالار»ی دەکردەوە، کە ساڵێ پێش لەدایکبوونی ئەم بە رووتیی لەگەڵ کچێکی گەڕەکی ئەفسەرەکان لە حەمامی ماڵەکەیاندا کوژرابوو و نەنکی پێی وتبوو نابێت بە هیچ شێوەیەک لای منداڵانی تری گەڕەک لە زمانی دەربچێت.. ئەم دەیزانی نابێت باسی

ئەوەش بکات، کە لەگەڵ «هیـام» چووە بۆ حـەمـام و لە بەرچاوی ئەمدا خـۆی گۆڕیوە.. مەمکەکانی بینیوە و جـوان جـوان لێیـان وردبۆتەوە.. سـەرگۆکانی وەکو هێلکەشـەیتـانۆکەی زل زل هاتوونەتە بەرچاوی و ئارەزووی کـردووە مـژی قـووڵ قـووڵیان لێ بدات.. بەڵام پێی خۆش بـوو بۆ یەکێ لە هاوڕێکانی گەڕەکی «سەیداوە»ی باس بکات، کە «هیام» بە پەنجەی ئەسپێکوژە و دۆشـاومژەی ئەم دەست و ئەو دەستی سەر کوڵمەکانی ئەمی بەسووکی گرتووە و بە شێوەیەکی زۆر جوان پێی وتوە:

ــ وەی قوربانت بم تۆ لە تاریکییدا چەندێ جوانی..!!

بەڵام ئەو چونکە حـەمـامی ئاوای نـەبینیـوە، هـەرگیـز هەست نـاکات، ئەمـە قسـەیـەکی بەتامـە و زۆر خـۆشـە شـەوان پێش خـەوتن لەسـەر جێگا بیـری لێ بکاتـەوە.. هـەر ئەو کــوڕە، کــە بـاوکــە ســیس و لاوازەکــەی لە بـەردەم چێشـتخانەیەکی گەورەی گەراجدا لە بەیانییەوە تا ئێوارە بە دەنگە تەڵخـەکەی فـەرمـوو فـەرمـووی لە خـەڵک دەکـرد و ڕێک لە وێنەی سـەر مـارکـەی پشـتـملی فانیلەی عەللاگە دەچوو؛ نیوەڕۆیەکی تەمووز کاتێ لە پەنا دیواری حەمامی ئیسکان بە تەنیشت یەکترەوە میزیان دەکرد و دیوارە داخبووەکە چززەیەکی وەکو ڕۆنی هەڵقرچاوی ناو تاوەی سەر پرێمزی حانووتی قوتابخانەکەیانی لێ هەڵدەستا، پێی وت:

ــ ئەگەر خـوێنی پەڕەسێلکە بەسـەر سـەرینەکەتدا بـڕێژیت و شـەوان کـاتێ سەر دەکەیتە سەری، بیر لە هەر کچێ بکەیتەوە، خەونی پێوە دەبینیت.

ئەم خـوێنی پەڕەسێلکەی لەسـەر سـەرینەکەی نەڕشـتبـوو، بەڵام بەڕاسـتیی بیـری لە «هیـام» کـردبووەوە و لەنـاو خـەیاڵەکـانیـدا گـەوزی پێ دابـوو.. ئەم دەبووایە بەقەدەر پلەی قادرمەکانی ژێرزەمینیماڵەکەیان خەیاڵ ببڕێت تا پێی دەگات و رایدەمووسێت.. پلەی یەکەم دەبووایە خۆی گەورە بکات و بەلایەنی کـەم ئەوەنـدەی کـوڕێکی شـانزدە سـاڵانی لێـبـێت.. پلەی دووەم دەبـووایە مێردەکەی بکوژێت، کە ئەفسـەرێکی گەورەی ئاسـایش بوو و زۆر لە وێنەکانی باوکی خۆی دەچوو.. لە پلەی سێیەمدا هەڵیدەگرت و دەیبردە ناو ئەشکەوتی شاخێکی بەرز.. ئیتر بەم شێوەیە پلە لە دوای پلەی دەبڕی و پێی دەگەیشت..

له دوا پلەدا رووتی دەکـردەوە و ئاوێزانی دەبوو.. ئـەمـە هونەری تێکەڵکردنی رۆچوون و هەڵکشـانەکان بوو و تێیدا قاڵبووبووەوە.. وا نـەبووایە مەحاڵ بوو لەزەتی لێ ببینێت و هەست بکات ئەم جـەسـتـەیەکی سوودبەخـشـی هەیە.. هـەیەتی و رۆحی دەخـاتە جـووڵە.. کـەچی ئەو شـەوەی چاوەڕێی هـاتنی ئۆتۆمـۆبیلە جـامـتـەڵخـەکـان بوون، «هیـام» هـەر خـۆی لەو سـەربانە ئێـجگار بەرزەی خـۆیان هاتە باوەشـیەوە و بواری نەدا ئەم خـەیاڵەکانی بخاتە کـار.. دایکی بە دەستێ جلی سپـیـەوە لەسـەر کورسـیـەکی پلاسـتیکی رەشی ژێر کەپری مێوەکـە و لە نێـوان گڵۆپە پەمـەییـەکانی چوار سـتوونەکـەی، روو لە دەرگای حەوشە دانیشتبوو.. چاوەڕێ بوو پیاوە خاکیپۆشەکان بە لەقە بیخەنە سـەر پشت و بیـانپـێـچنەوە.. ئەم دەنگی لێـزمـەبارانێکی ناکـاو دەهـاتە گوێچکەیەوە و تەزووی بە گیانیدا دەهێنا، کە هـەر دەتوت لە هـەورە زۆر رەش و ئێجگار چڕەکانی ناو هەقایەتە خورافیەکانەوە دێتە خوارێ و بۆ ساتێ بیری دەچووەوە دنیا بەرەو هـاوین دەچێت.. ئەوەتا قـەرەوێڵـەکانی سـەربانەکە لەژێر تیـشکی خـۆری ناوەڕاسـتی حـوزەیراندا گـەرمـداهاتووە و ئەمـان بە ئاو شـتـوویانە.. دۆشـەگـیـان لەسـەر داخـسـتـووە و چـەرچەفی تەنکیـان داوە بە خـۆیاندا.. «هیـام» توند سـەری ئەمی دەنووسـاند بە سنگی خـۆیەوە و توندتر دەیگوشـی، بۆئەوەی ترسی گـیـانی دەربچـێت و بەدڵنیـایی بنوێت.. جار جـار ماچی دەکرد و بەچپە، بەڵام بەچ شێوەیەکی سەیر پێی دەوت:

ـ تۆ گەورەبوویت قوربانت بم، ئیتر دەبێت ئاقڵ بیت..!!

ئەم خـۆی بۆ دابین نەکرا و مـاچێکی خـێرای سـەر روومـەتی کرد.. مـاچێکی تر و دوان و سـێـانی دیکەی سـنگە رووتەکـەی و لەسـەری پـاڵکەوت.. ئەو پێدەکەنی و بە دەنگێ، کە دیاربوو بەر شـالاوی ئاڵۆشـێکی هـاروهـاج کەوتووە و لەگەڵ لەرەیەکی کوڕکوژانە دەردەچوو، دەیوت:

ـ چیـیت دەوێ..؟! چی..؟! دەتەوێت چی بکـەیت شـەیتـان..؟! وی چـەندێ هـاری تۆ..!!

ئاوای دەوت و لەگـەڵیدا باری پاڵکەوتنەکـەی دەگـۆڕی.. وردە وردە لـەگـەڵ جەستەی خۆیدا جووتی دەکرد و لەنێوان قۆڵە رووتەکانیدا دەیگوشی.. ئەنجام

مەمکەکانی خستە ناو دەستیەوە و پێی وت:

ــ بیانمژە..!! بیانمژە..!! دەسا لە پیاوێکی زۆر شارەزا چاکتری لێ دەزانی..!!

ئەم لەمەوپێش هەر لەژێر ئەو چەرچەفە و لە دوا پلەی خەیاڵەکانیدا هەموو ئەو شتانە و ئەوانەی دواتریشی لەگەڵدا کردبوو و بەلایەوە تازە نەبوو.. کاتێکیش گیانی تەواو خاوبووەوە، هەستی بە ترسێکی بێئەندازە کرد، بەڵام ئەمە نەیدەتوانی ئەو هەموو لەزەتەی لە بیر بەرێتەوە، کە تا ناخی ناخی رۆچووبوون و لەوێ وەکو لمی ورد وردی بنکی حەوزی ماسیەکانی خۆیان نیشتبوون.. حەزی دەکرد بەیانی لە ژووری نووستنەکەی ئەواندا بەدەم گوێگرتن لە گۆرانیی «صباح الخیر یا لولە»وە سەمای لەگەڵدا بکات و ناوی ئەو هەموو منداڵە لەبارچووەی سەر دیوارەکان بخوێنێتەوە، کە ئەو بە سوورێکی تۆخ تۆخ نووسیونیەتی و بە رەشی تۆختر بازنەی بە دەوردا کێشاون.. ئینجا لە دواوە دەستەکانی لە کەمەری بئاڵێنێت و هەر ئاوا بە قادرمەکەدا بچنە خوارێ.. کەچی کاتێ تیشکی هەتاوی کەمێ گەرمی بەیانی خۆی لە پەنجەی قاچەکانی هەڵسووی و بێداری کردەوە، ئەوی لە تەنیشت نەمابوو و دڵی کەوتە ختوورە.. خێرا هەستا و بە پڕتاو پلە لە دوای پلەی قادرمەکانی هەردوو سەربانی بڕی.. گەیشتە بەردەمی دایکی و هەڵوێستەیەکی کرد، کە لە ڕاڕەوەکە پشتی بە دیواری مووبەق دابوو و چاوەکانی لەبەر گریان و نەخەوتن سوور هەڵگەڕابوون.. سەری ئەمی نووساند بە سنگی خۆیەوە و بە دەنگێکی کز پێی وت:

ــ بۆچی ئاوا زوو هەستایت رۆحەکەی دایە، خۆ ناچیت بۆ قوتابخانە..!!

ئەم خۆی لێ جیاکردەوە و بەرەو ژووری میوان چوو.. «عیماد جەلال»ی بەڕێوەبەری مۆزەخانەی قەڵات بە دەستێ بیجامەوە لەسەر تاکێکی سووچی ئەوسەری سۆفاکە دانیشتبوو و چەناگەی خستبووە سەر هەردوو ناولەپی جووتکراوی.. بەرەو دواوە گەڕایەوە و خۆی کرد بە ژوورەکەی تردا.. ئەم هیچ چارەی ئەو پیاوەی نەدەویست و زۆریش پێی ناخۆش بوو هامشۆی دەکردن.. هاوڕێیەکی زۆر نزیکی باوکی بوو و ئەلبوومە کۆنەکانیان پڕن لە وێنەکانی

ئەو.. دایکی هیچ شـــتێ بەبێ پرسی ئەو ناکـــات و هەرچەند تووشی تەنگوچەڵەمــەیەک دەبن، خێــرا تەلەفـۆنی بۆ دەکـات و دوای چاوترووکـانێک ئامادە دەبێت.. پەنجەکانی رەق ڕەقن و رێک لە کلکی بڕبەندی ناو چەکمەجەی کاوەنتـەرە گەورەکەی مـووبەقی خۆیان دەچن.. ئەو شـەوە هەسـتی پێکردن و رقی لێیان هەستا، کە لە تاوی قورگیەشە لە جێگادا کەوتبوو و ئەو خستنیە ســەر روومــەتە گـەرمـەکـانی.. هەرچەند ئەو پیــایدا دەهێنـان و بۆ ناو قـژی دەبردن، کە بە ئارەقە تەڕبووبوو و تاڵەکانی بەیەکترەوە نووسـابوون؛ ئەم قێزی دەکردەوە و زۆری نەدەما بڕشێتەوە.. کەچی «عیماد» ئێوارەی رۆژی دوای ئەوە خستیە ناو ئۆتۆمـۆبیلەکەی و لەگەڵ دایکی بردیان بۆ لای ئەو دکتۆرەی، کە عیـادەکەی لە ژێرزەمـینێکی قـووڵدا بـوو و بنیـادەم بە بڕینی پێنج شـەش پلەی قـادرمـەیەک پێی دەگەیشت.. ئێوارەی پایزێکی چەند سـاڵ لەمـەوبەر، هەر لەو ژێرزەمـینـە و لە بەرامـبەر دووکانێکی کەمالیـاتدا کوڕێکی گەنج پەنجـەکانی دەسـتی بۆ سـمـتی دایکی برد و ئەم چاوی لێبــوو، کـە لە قـەوانی گـوللەی کلاشینکۆف دەچوون و نینۆکەکانیان وەکو هی کچ درێژبوون.. دایکی خێرا لای کـردەوە و قـایم بۆیەی نینـۆکەکەی دەسـتی تێگرت.. ئەو خـۆی لادا و بەر دیواری عـیـادەی دکتۆرەکـە کـەوت.. شـووشـە شکا و دەرمـانە سـوورەکـە لە شێوەی گـوڵی سـەر پەردەی ژووری نووسـتنەکەی خۆی بە قـەدی دیوارەکەدا هاتـە خـوارێ.. لەمــەوە هەر جـارێ دەرگــای ئەو ژووری نـووســتنەی دایکی دەکـــردەوە و ســـەرنجی لـە پەردەکـــە دەدا، دیمەنـی ئەو رۆژەی وەکـــو خـــۆی بیـردەکەوتەوە و تـەزوو بە سـەرتاپای گیـانیدا دەهات.. نەخشی قـەدی قـوتووە گەورەکانی سەر شـانی کچە تازەباڵقـەکانی گەڕەکی سەیداوەش، ئەگەر کەمێ چاوی خـێـڵـبکردایە و لێی بڕوانینایە، رێک لە بۆیەی سـەر دیوارەکـە و گـوڵی ســـەر پەردەی ژووری نـووســـتنەکـــەی دایکی دەچوو؛ کـــاتێ بـەپێی پەتی لە بەلووعەکانی ژێر تانکیە ئێجگار گەورە و زۆر بەرزەکەوە ئاویان پێ دەهێنان و لەگەڵ لەرینەوەدا بەسەر جلە پەڕپووت و رەنگبواردووەکانیـاندا دەپڕژا.. ئەوسا کراسیان بە پێسـتیانەوە دەنووسان و ئەم حەزی دەکرد سەرنجیان لێ بدات.. جارێ یەکێ لەو کچانە شووشـەیەک چوو بە بنی پێیدا و خوێنی لێ هات.. لە

تاوا بۆ ساتێکی کورت چاوە سەوزەکانی داخستن و لێوی خوارەوەی بە توندی خستە ژێر ددانەکانی سەرەوەی.. داماوە خێرا قوتووەکەی دانا و بە هەردوو دەست قاچی گرت.. کەمێ هەڵیبڕی و لە چاوی خۆی نزیککردەوە.. ئەم لێی دەڕوانی و هەوەسی دەبزوا.. خۆی بۆ نەگیرا و بێشەرمانە پێی وت:

ــ کچەکە دەڵێی چی بە زمان بۆتی بلێسمەوە..؟!

ئەو سەری هەڵبڕی و تفێکی لێ کرد.. چەمۆڵەیەکی لێ ناو پێی وت:

ــ بۆ دایکتی بلێسەرەوە، هەی کوڕی نازانم کێ.

هاوکات بە دەستە خوێناویەکەی بەردێکی بەقەدەر بۆقی قەراغ گۆمەکەی جارانی گەرەکی ئەمانی لە تەنیشت خۆیەوە هەڵگرت و تێیگرت.. ئەم پڕ بە دڵ حەزی دەکرد بەری بکەوتایە و ئازاری پێ بگەیاندایە.. لێی نزیککەوتەوە و پێی وت:

ــ وەی بەقوربانت بم، تۆ بە خوێنەوە چەندێ جوانیت..!!

ــ بێ دەنگ بە خوێڕی، ئەگینا بە برام دەڵێم وەکو سەگ بتتۆپێنێت.

ــ بە قژت بیسڕە کچەکە، بە قژت بیسڕە.

ــ من بزانم تۆ دایکت تەواو نییە و خوا بزانێت ئێستا بە چییەوە خەریکە، بۆیە تۆی رەوانەی دەرەوە کردووە و.......

کاتێکی زانی کوڕێکی هاوتەمەنی خۆی لە لای دووکانی «کەریم سیدەکانی»یەوە بە راکردن دەهات و بە غەزەبەوە لێی دەڕوانی.. ناسیەوە و بۆی دەرکەوت برایەتی.. لەمەوپێش چەند جارێ تێیهەڵدابوو و زیرەی لێ هەڵساندبوو.. گومانی نەبوو دەرەقەتی دێت و داخی دڵی خۆی پێ دەرێژێت:

ــ چاکی تێهەڵدە ئەیاد، لەوساوە جنێوم پێ دەدا.

ئەم خۆی تەواو بۆ ئامادە کردبوو و دەیزانی چۆن بەرەنگاری دەبێت.. هەر خێرا ئەم دەست و ئەو دەستی گرت و کێشای بە دڕکەزیەکانی پەرژینی باخچە درێژ و باریکەکەی نێوان هەردوو سایدی شەقامەکە و دەموچاوی خوێنی لێ هاتە خوارێ.. رایکێشایەوە و پێیدا کێشایەوە.. توندتر رایکێشایەوە و قایمتر پێیدا کێشاوە.. تا کەوتە ژێر قاچەکانی و بە لەقە تێیکەوت.. بەڵام کاتێ لەسەر قەرەوێڵەی یەکێ لە قاوشەکانی خەستەخانە

چاوی کردەوە و دایکی و «عیماد»ی لەملا و لەولای خۆیەوە بینی، بەحاڵ ئەوەی بیـــردەکــەوتەوە، کــە لـەپڕ نـاو ســەری بـرووسکـەیەکی تێکەوت و وردە وردە بەرچاوەکـانی لێڵـدەبوون.. دوایـی زانی کـچـەکـە بەردی پێـدا کـێـشـاوە و دەلاقـەیەکی کردۆتە پشـتی سەریـەوە.. دایکی وەکو زۆری دیکەی لەمـەوبەری بە پارە چارەسـەری بۆ دۆزیەوە و کوڕەکەی لەو چورتـوومە دەرباز کـرد.. «عیمـاد» هەمیشە سەری لێ بادەدا و پێی دەوت:

ـ تۆ بەڵای بەڵا.. لەسـەر ئەم خوێڕیەتیە بەردەوام بیت، دایکت دەبێت هەموو موڵک و ماڵەکەیت بۆ بفرۆشێت.

ئەو راسـتـی دەکـرد و بـە هـەڵەدا نـەچووبوو.. دوو دووکـانـی دایـە ســەرۆکی مونەزەمـەکە و لەسـەری تاپۆ کردن، بۆئەوەی رازیی بێت و وازیان لێ بهێنێت.. ناوی کرێچـیی خـانوو و دووکـانـەکـانیـان جـار لە دوای جـار لەسـەر لیسـتـەکە کەمدەبوونەوە و هێڵی سووریان بەسەرداهات.. ئەمیـان بۆ باوکی ئەو کچەی «تەیراوە»، کە لەگەڵیدا نووستبوو و سکی پڕکردبوو.. ئەویان بۆ ئەو کوڕەی بە چەقـۆ لێی دابوو و دەسـتـی راسـتـی ئیـفلیـج بووبوو.. ئەویتـریـان بۆ بەرێوەبەری پەروەردە، تـا لە قــوتـابخــانە وەریـگرێتــەوە، کــە دوای ئەوەی بە کــەللە لـووتی مامـۆسـتـای فیـزیای شکاندبوو و دەریانکردبوو.. ئەوە بێجگە لەوەی رۆژانە بەم دەست و بەو دەسـت دەیبـرد و بە بای هـەرچوار لایدا دەدا.. دایکی لـەم دواییـە بە هـەردوو دەست ئـەو قــژە درێژەی دەرنـیــەوە و چـەپک چـەپک لـە بێــخـــەوە دەریدەهێنا.. بە چڕنووک کۆمـەڵێ هێڵـی سووری لەسـەر روومـەت و نـاوچـەوانی خۆی دەکێشا و پێی دەوت:

ـ با بەس بێت.. کورە با بەس بێت.. هەر رۆژێکە لە داخی تۆ خۆم دەکوژم.

ئینجا دەپاڕایەوە و بە دەنگێکی کز پێی دەوت:

ـ بە قـوربانت بم، هـەر ئەم خـانـووەمـان مـاوە و بـا تێـیدا دانیـشـن.. دەسـتم دامـێنت واز لەم سـەرەڕۆییـەت بێنە و با ئەمـەشمـان لە دەست نەبێتەوە.. ئاخـر دەبێت بچینە خانووی کرێ و ریسوا دەبین.

لەپڕ گۆڕا و بوو بە کـەسێکی دیکە.. ئەمجا خـووی دایە خوێندنەوە و باوەش باوەش کتێبی دەهێنایەوە.. ئەوسـا پۆلی سێیـەمی ناوەندی بوو و باڵای لە هـی

هەموو مامۆستاکانی بەرزتر بوو.. دایکی هەمیشە بە گومانەوە لێی دەڕوانی و نەشــیــدەزانی چی پێ بڵــێت.. ئەوەندە هەبوو بە وریاییــەوە ســەرنجی لە هەڵسوکەوتەکانی دەدا و چاوی لێ غافڵ نەدەکرد.. شـەوێکیان لەگەڵ دوو هەرزەکاری دیکە بە سوورێکی تۆخی وەکو ئەو بۆیەی نینۆکە دیوارە سپییەکەی «ناوەندیی قەندیل»یان دەنووسی، کە دایکی جارێکیان لە بازاڕی ژێرزەمینەکە گرتیە کوڕە چوختیەکە و لە قەدی دیواری عیادەی دکتۆرەکە گوڵێکی وەکو هی سـەر پەردەی ژووری نووستنەکەی نەخشـاند.. لەپڕ ئابلۆقەیان دان و میلی تفەنگەکانیان لێ هێنانەوە.. قۆڵبەستیان کردن و فڕەیاندانە زیندانەوە.. دایکی ئەمجارەیان پەنای بۆ مێردەکەی «هیام» برد و دوا خانوو و ئۆتۆمۆبیلەکەی ژێر خۆیشی خستە سەر ناوی ئەو.. بەریاندا و لە سەیداوە بوون بە کرێچی.. ماڵی «هیام» ئەو خانووەیان بەجێهێشت، کە حەمامەکەی لە ژێرزەمینێکدابوو و هاتنە خانووەکەی ئەمانەوە.. بۆ ئەم هیچ شتێ لە مەسەلەکە نەگۆڕابوو و زۆربەی شـەوەکـانی لەوێدا بەسـەر دەبرد.. لە ژووری نـووسـتنەکـەی جـارانی دایکیدا تێیدەئالا و بێجگە لە جەستەی، هەموو خەیاڵەکانی سەردەمی منداڵی و هەرزەکــارییــشی دەخــســتــە کــار.. بە توانایەکی زیاترەوە هەڵکشــان و رۆچوونەکـانی تێکەڵ بەیەکتـر دەکرد و هونەرمەندانە ئەم جـەمـسـەر و ئەو جـەمـسـەری کـاتەکـانی دەگەیاندەوە یەک.. رێگایەکی تایبەت بوو بە خـۆی و نەیدەتوانی دەستبەرداری بێت.. لەزەتی لە لەزەتی ئەودا دەبینی و هەموو چرپە و هەناسە و ناڵە و جووڵەیەکی ئەو، شوێنە سارنج و بەستەڵەکەکانی ناو دڵی ئەمیان گەرمدەکردەوە، بەڵام هیچی وەکو ئەوە نەبوو، کاتێ لە ژێرەوە بۆ دوا جـار لەنێـوان قـۆڵە گـۆشـتنەکـانیـدا دەیگوشی و بە دەنگێ، کـە هـەناسـە ماندووەکانی نەیاندەهێشت بە روونی دەربچێت و لەرەیەکی ئێجگار سەیری تێکەوتبوو، پێی دەوت:

ــ وای چەندێ ئاسـوودەم، کە نازانم ئەوە تۆی هاتووی بۆ لای من، یان منم هاتووم بۆ لای تۆ..!!

ئیـتـر ئەم بەژێر لەزەتدا دەکـەوت.. هەسـتی دەکـرد قـسـەیەکی ئاوا ئەوە دەهێنێت گـیـانی خـۆی بۆ بخـاتە مـەترسـیـەوە و درووشـمـە تووڕەکـان بە

سـووریێکی تۆخ تۆخ لەسـەر دیوارە بەرچاوەکـانی ترسناکـترین شـوێندا بنووسێت.. لەسـەری بگیرێت و ئەشکەنجەی بدەن.. ئەنجام هەمـوو ماڵەکەی بۆ بفـرۆشـێت و نـەک لە خـانووی کـرێ دابنیـشـێت، بەڵکو بداتە کـێـوە زۆر سەختەکانیش.. ئا ئەمەش سیحر و نهێنیی شوێن..!! ئەو هەموو کاتە خانوو خـانووی خـۆی بوو و بە ئاشکرا تێیـدا دەژیا، کـەچی نەیدەتوانی بەم رادەیە هەست بە جـوانـی و لەزەتەکـانی بکات.. هەرگـیـز ئەوەندە لـەو ژوورەدا ئازاد نەبووە و ئاوا تێیـدا دڵی پڕی نەبووە لە ئاسـوودەیی.. تەنانەت گـەڕەکەکـەیش لەوەی جاران خۆشـترە و هەمـیشـە بە خـۆی دەڵێت: «شـتـەکانمان لە دوورەوە چەندێ نزیک دیارن..!! چەندێ سـەرنجـڕاکـێـشن..!! چۆن نهـێنیـەکـانیـان دەردەکـەون و سـەرسـاممان دەکـەن..!!».. حـەزی دەکـرد زۆربەی ژیانی خـۆی لەوێدا بەسـەر بەرێت و هـاوڕێیـەتیی ئەو کوڕانە بکات، کە پێشـتـر حـەزی لە چارەیان نەبوو و رووی نەدەدانێ، بەڵام ئەمە بێجگە لەوەی پارەی زۆری گەرەگ بوو و بەم پـەیدا نەدەکـرا، ئـەو رابردووەیشـی گـرفـتی بۆ درووسـتـدەکـرد، کـە بەتەواوی لـە هـی ئەوان جـیـابوو و هەمـیـشـە پێـوەی دەتلایەوە.. ئەو قـسـە زل زلانەی لە بڵاوکراوە نهـێنیـەکان و کتێبە رەنگپـەڕیوەکانیش فێریان بووبوو، بەکەڵکی نەدەهاتن و نەیاندەتوانی پاساو بۆ کردەوەکانی پێشووی بهێننەوە.. بۆیە هەمـیشـە بە تەنیـا بوو و کـەس رووی نەدەدایە.. رۆژانە وەکو مـشکی ناو مەتاهەی تاقیگاگان ئەمسـەر و ئەوسەری تێدا دەکرد و وێنەی منداڵێکی بەناز دڵی لە خۆی دادەما.. بە نهێنی دەگریا و بەدزییـەوە فرمێسکی دەڕشت.. جار جار دەچووە لای «ئارام»ی هاوڕێی و باسی موعاناتەکانی خۆی بۆ دەکرد، کە دوای ئەوەی پشتی کردبووە دایک و باوکی لە بەغدا و هاتبوو لە هەولێر لەناو شوقـە تەواونەکراوەکانی ئیسکان دەژیا.. ئەمانە ئەوەندەی دیکە ئەو خـانووەی جـارانی خـۆیان و ژووری نووسـتنـەکـەیان لا خـۆشـەویست کـردبوو و باوەڕی وابوو ئەوێ تاقـە شـوێنێکە ئەم تێیـدا حـیسـابی بۆ بکرێت.. تاقـە شـوێنێکە لە ناویدا توانا نووستووەکانی بەئاگابێن و بە چالاکی ئیش بکەن.. گەشە بکەن و خۆیان تازەبکەنەوە.. بەڵام ئەم هەرچەند وابزانێت ئەمە هەستێکی جیاوازە لەو هەستەی، کە بە منداڵیی هەیبوو و هەمیشـە دڵی لە گەڕەکە هەژارنشـینەکاندا

دەکرایەوە، ئەوا بە هەڵەدا چووە.. دایکیشی لەو نهێنیە تێناگات و زۆر جار سەرزەنشتی دەکات.. قایم قایم بە روومەتەکانی خۆیدا دەکێشێت و پێی دەڵێت:

ـ خۆزگە دەمزانی تۆ بۆچی لەوەتەی هەیت، رقت لە منە و هەر خۆتم لێ دووردەخەیتەوە..!! خۆزگە دەمزانی تۆ بۆ هیچ شتێکت لە هی خەڵک ناچێت..!!

ئەویش هەمیشە تەنیا بوو و لەگەڵ هیچ یەکێکی ئەو گەڕەکە پەیوەندیی نەبوو.. تەنانەت چاکوچۆنیی لەگەڵ دراوسێ هەرە نزیکەکانیشی نەدەکرد و نەیدەویست بیانناسێت.. نەوەکا لێی نزیک ببنەوە و بە پرسیارە زۆرەکانیان هەراسانی بکەن.. ئەنجام بە نهێنیەکانی بزانن و دۆخی ژیانە تایبەتیەکەی لێ بشێوێنن.. ئەو نەداری و زەبوونیەش نەیانتوانیبوو شتێ لەو لووتبەرزیەی کەم بکەنەوە و خۆی بە هاوشانی کەسیان نەدەزانی.. کوڕە گەورەکەی ئەو ماڵەی تەنیشتیان، کە دوو چاوی زۆر جوانی هەیە و تووکە رەشەکانی سەر دەستە گەنمیەکەی و سنگە پانەکەی هی ئەوەن بە سەری پەنجەکانی ختووکەیان بدات و بە زمان و لیکی ناو دەمی تەڕیان بکات؛ ماوەیەک بوو زۆڵانە سەیری دەکرد و سەرنجە زۆر تیژەکانی خاکی هەمیشە شێداری دڵیان دەکێڵا، بە تەواوی وروژا بوو و خەریک بوو خۆی بەدەستیەوە بدات.. بەڵام وای نەکرد و بە ڕێگا تایبەتیەکەی خۆی لەزەتی لێ دەبینی، کە بریتی بوو لە خرۆشاندنی بەردەوامی و ڕاکێشانی سەرنجی.. هاوکات خۆگرانکردن و خێسەکردنی ناوبەناو لەپاڵ بزەی کورت کورتی پەنهان.. جلی تەسکی دەپۆشی و وەکو کچی هەرزەکار بە لەنجەی کوڕکوژانە بە بەردەمیدا دەڕۆیشت.. لە حەوشە بە نیمچەڕووتیی خۆی پیشاندەدا و یاریی بە قژە درێژەکەی دەکرد.. هاوکات بە تیلەی چاو لێی دەڕوانی و هونەرمەندانە سەرنجی لە سیمای دەدا، بۆئەوەی بزانێت تا چ رادەیەک کاری تێکردووە و چەند لەزەتی لێ بینیوە، هەتا ئەمیش بە هەمان ئەندازە و بگرە زۆر زیاتریش لەزەت وەربگرێت و هەست بکات رۆژگاری جوانیە خورافیەکەی بەسەرنەچووە.. بەردەوامە و درێژەی هەیە.. درێژەی هەیە و کۆتایی نایەت.. وزەی پێ دەبەخشێت و لە دڵیدا دەچەسپێنێت، کە توانای

گەڕاندنەوەی خەونە بەسەرچووەکانی هەیە و ناهێڵێت لە دەستی بچن.. پێش و پاش لە ساڵەکان دەگرێتەوە و شێوەی تەمەن لە ستوونیەوە دەگۆڕێت بۆ بازنەیی.. ئەم لەوەتەی چل ساڵی تەواو کردووە و سنووری گەنجێتیی بڕیوە، باوەڕی بەوە هێناوە، کە جەستەی کوڕێکی گەنجی قۆزی ئاوا دەتوانێت جەستەی ئەم لە پیریی بپارێزێت و بەردەوام ڕۆحی ئاو بدات.. هەر بۆیەش سووک سووک خۆی لە «عیماد»ی بەڕێوەبەری مۆزەخانەی قەڵات دووردەخستەوە و لەگەڵ هاتنیشی بۆ ئەم خانووە بەجارێ وازی لێ هێنا.. ئەو چەند جارەیش هاتە دائیرەکەی و ویستی ئاشتی بکاتەوە، ئەم ئەوەندەی دیکە دەیبوغزاند و بە قسە رەقەکانی تەواو سەرودڵی دەگرت.. دواجار لە رارەوەکەدا پاڵێکی قایمی پێوەنا و بە تووڕەیی پێی وت:

ـ وەلبە لە بەرچاوم و گۆڕت گومکە، ئەگینا هەر خۆم دەزانم بە چ دەردێکت دەبەم..!!

ئیتر لەمەوە چاوی پێی نەکەوتەوە و هەر نەیزانی چیشی بەسەرهات.. «عیماد» پانزدە ساڵ خۆشیویست و وەکو منداڵێکی زۆر بەناز نازی دەکێشا.. کەچی ئەم رازیی نەبوو شووی پێ بکات و هەر جارێ بیانوویێکی بۆ دەهێنایەوە.. لەم دواییە هەمیشە بەوە دەمکوتی دەکرد، گوایە کوڕەکەی گەورەبووە و ناکرێت بەئاشکرا وەکو ژن و مێرد بژین.. ئەگەرچی لەوە تەواو دڵنیابوو، کە ئەو هیچ کاتێ ڕێگر نییە لە بەردەمیدا و زۆر چاک ناخی خوێندۆتەوە.. دەیزانی ئەو هەر لە منداڵییەوە هەستی بە زۆربەی سەرکێشیەکانی ئەم کردووە، بەڵام بەشێوەیەکی چەند بلێی زیرەکانە خۆیان لێ گێلدەکات.. لە هەڵسوکەوتەکانیدا کۆمەڵێ نهێنیی ناو دڵی دەخوێنێتەوە و هەندێ جار ترسێکی سەیریش دایدەگرێت.. وای بۆ دەچوو ئەو هەستی بەوەش کردبێت، کە «فەوزی زێدان»ی سەرۆکی مونەزەمەکە هامشۆی دەکات.. جارێکیان بەدەم خەوەوە هەستابووەوە و رووی لە ژووری نووستنەکەی ئەو کردبوو.. ئەوە لە کاتێکدا ئەمان خۆیان رووتکردبووەوە و لە گەرمەی بەزمدا بوون.. ئەوسا زۆر لێزانانە چارەسەری مەسەلەکەی کرد و بەئەسپایی بردیەوە سەر جێگاکەی خۆی.. بۆ بەیانیە زووەکەشی «حەیات خان»ی دایکی، کاتێ لە

«بەغدا» گەڕایەوە و لە سیمای وردبووەوە، هەستی بە پەشۆکاویەکەی کرد و لێی پرسی:

ـ چییتە ئەمڕۆ..؟! تەواونییت..!!

کاتێ ئەم وەکو زۆر جاری دی خێسەیەکی لێ کرد و وەڵامی نەدایەوە، دایکی سەرێکی بادا و بەدەم ئاخێکەوە وتی:

ـ شتێ لەم ماڵە روویداوە و من لێی بێئاگام..!!

«حەیات خان» ئەو کاتەی بە دیار کچەزاکەشیەوە دانیشتبوو و سووک سووک ناوچەوانی بۆ دەشێلا، کە قوڕگی هاتبووەوە یەک و تایەکی گەرمی لێهاتبوو، ئاخێکی قووڵتری هەڵکێشا و بە دەنگێکی کز وتی:

ـ ئەم ماڵە زۆری نەماوە بەتەواوی کاول بێت و شوێنەواری بەسەر دنیاوە نەمینێت.

«سامال» گوێی نەدایە و چوو بۆ دەوام.. ئەم دایکی خۆی چاک دەناسی و دەیزانی چ شارەزاییەکی سەیری لە خوێندنەوەی دەموچاوی بنیادەمدا هەیە.. سەرنجەکانی وەکو هی کونەپەپوو تیژن و بە قووڵاییەکانی ناخی ناخدا رۆدەچن.. نهێنیە پەنهانەکانی پەنا و پەسارەکان دەدۆزنەوە و دەیانخەنە بەرچاو.. بۆیە لەو کاتانەدا ددانی بەخۆیدا دەگرت و هیچی لەگەڵدا نەدەوت.. ئەم زۆر بە پارێزەوە خەریکی تێرکردنی ئارەزووە سەرکێشەکانی بوو و ئێجگار بە لێزانییش لە خەڵکی دەشاردنەوە.. دەیان جار چووبوو بۆ لای «فەوزی زێدان» و هیچ کەسێکیش هەستی پێنەکردبوو، کە لە ژێرزەمینەکەدا ژوورێکی تایبەتیی هەبوو و دەبووایە چوار پێنج پلەی قادرمەکە ببڕێت و بگاتە بەر دەرگاکەی.. دەشیزانی لە چ کاتێکی گونجاودا «عیماد» بانگ بکات، یاخود بچێت بۆ لای.. هەر ئەمەش هەستێکی سەیری لە ئاستی هەموو ژنێکی دیکەدا لا خوڵقاندبوو و وایدەزانی هەر یەکێ لەوان لەپاڵ مێردەکەیدا دۆستێ دووانی هەیە.. تەنانەت گومانی لە «هیام»ی دەستەخوشکیشی کردبوو و وا لە دڵیدا چەسپیبوو، ئەگەرچی مێردەکەی بەقەدەر هەموو دنیا خۆشدەوێت و لەو زیاتر کەسی دی بە نێر نازانێت؛ بەڵام رەنگە بێدڵیی خۆی نەکات و بە لایەنی کەم دۆستێکی هەبێت.. «سامال» ئەو موڵک و ماڵەی هەشیبوو یارمەتی چاکیان

دەدا لەوەی هەمیشە بە ئاسانی نهێنییەکانی بپارێزێت و لەم و لەویان بشارێتەوە.. تەنها بۆ دەربازبوونی لە زنجیری پەیوەندیی «فەوزی» دوو دووکانی لە دەست دا و کاتێکی گونجاویشی بۆ دۆزیەوە.. لەگەڵ هاتنی بۆ ئەم خانووە تەکنیکەکانی تەواو گۆڕی و بە هەموو شێوەیەک ددانی بە خۆیدا دەگرت.. بە ڕێگا تایبەتیەکەی لەزەتی دەبینی و هەموو خەیاڵەکانی منداڵی و هەرزەکاریی و گەنجێتیی و قەیرەیی بەجارێ دەخستە کار.. ئەو کوڕە قۆزەی دراوسێشیان نەیتوانی لە خشتەی بەرێت، کە شتێ لە سەرووی تەمەنی کوڕەکەیەتی و بە لایەنی کەم پانزدە ساڵ لە خۆی منداڵترە.. لە ئاستی ئەو نامانەشیدا نەڕووخا و شتێکی لەو سیما دەسکردەی نەگۆڕی، کە ڕۆژانە هەڵیدەدانە حەوشەوە و هێڵکاریی سەیر سەیری بۆ وشە و مانا ئاڵۆشاویەکانی دەکرد.. ئەوەی بۆ ئەم مەبەست بوو ئەوەبوو چەند کاری کردۆتە سەری و تا چ ئەندازەیەک لەزەتی پێ بەخشیوە.. نیوەشەوێکیان لەگەڵ غەڵبەغەڵب بێداربووەوە و دڵی کەوتە ختووره.. کەمێ بیریکردەوە و زانی ئەوە هاتووە، چونکە لە دوا نامەیدا شتێکی ئاوای بۆ نووسیبوو، بەڵام کاتێ دەرگای ژوورەکەی تەقەیەکی کەمێ بەرزی لێوەهات و دەنگێ بە سووکی بانگی کرد، بۆی دەرکەوت کەسێکی ترە و ئەوەندەی دیکە ترسا.. هەرچۆنێ بوو هەندێ خۆی هێمنکردەوە و پرسی:

ـ تۆ کێیت و چییت دەوێ بەم نیوەشەوە..؟!

ـ فەرهادی قالە پاقلاوەم.. لای شاخەوان جەنگۆی کوڕتەوە هاتووم.. بیکەرەوە، چونکە شتێک هەیە دەبێ خێرا پێتی بڵێم.

ناسیەوە و لێی کردەوە.. هەواڵی بریندار بوونی تاقانەکەی بۆ هێنابوو و دەبووایە لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ ئەو لادێیەی، کە بە قەدی شاخێکەوەیە و وا کوڕەکەی لەناو یەکێ لە خانووە پەرپووتەکانیدا بە زامداری لێی کەوتووە.. ئەم پێشتر ئەو شوێنەی لە دوورەوە بینیبوو و بە لایەوە تازە نەبوو.. لە سەرژمێرییەکەی ئەو ساڵە بۆ ناونووسکردنی خەڵکی ناوچە شاخاویەکان ئەمیان کردبووە سەرۆکی لیژنەیەک و دەیویست بە هەموو کون و کەلەبەرەکانیدا بگەڕێت، بەڵام تووشی نەخۆشیی بوو و نەیتوانی.. لە

زەردەپەڕێکی پایزی سەرەتای سەردەمی شۆڕشی رزگاریی پێشووشدا خۆی و «فەرەیدوون»ی مێردی بە لایدا تێپەڕیبوون و خانووەکان لە بەربینایییدا وەکو چەند کەرکەدەنێکی نووستوو دەردەکەوتن.. حەزی دەکرد لابدەن و ئەو شەوە لەوێ بەسەربەرن، بەڵام ئەو ڕازیی نەبوو و دەیویست چی زووترە بگەنە شوێنی مەبەست.. بە ئوتۆمۆبیلەکەی خۆیان هەوراز و نشێوەکانیان دەبڕی و گۆرانییەکی خەمناکی «نەوال جابر»ی گۆرانیبێژیش لە ریکۆردەرەکە بەرزدەبووەوە.. بووک و زاوا پلاستیکەکەی بە وایەری باریک بە بنمیچەکەوە چەسپکرابوون و تا ناوەڕاستی جامی پێشەوە شۆڕکرابوونەوە، سەمایان دەکرد و جار جار بەبێ ویست یەکتریان لە باوەشدەگرت.. ئەم قژە درێژەکەی لە شێوەی هێلکەشەیتانۆکەیەکی زل کۆکردەوە و بە تۆقەیەکی لەقلەق لە ناوەڕاستی سەریدا بەستی.. ئەمە نیشانەی تۆرانی بوو و مێردەکەی زۆر چاک لێی تێدەگەیشت.. دەبووایە لە باوەشی بگرێت و بۆی بکاتەوە.. پەنجەکانی تێبخات و بۆنەکەی هەڵمژێت.. ئینجا ئاشتدەبووەوە و سیما گرژ و مۆنەکەی دەگۆڕا، بەڵام ئەوسا ئەویش لە حاڵەتێکی زۆر پەشێودا بوو و ئاوای بۆ نەدەکرا.. کوڕەکەیان لای «حەیات خان» بەجێهێشتبوو و نەیاندەزانی کەی جارێکی دیکە چاویان پێی دەکەوتەوە.. وەکو خۆی هەموو جارێ دەیوت لە سەردەمی شۆڕشەکاندا زەحمەتە مرۆڤ بتوانێت سەرەتا و کۆتاییی شتەکان دەستنیشان بکات و هەر چییان لە بارەیەوە بڵێت بێمانایە.. «ساماڵ» دەم و لچی دابوو بە یەکدا و سەری هەڵنەدەبڕی.. ئەم زۆر بەلایەوە ئاسایی بوو مانگێ ئاوا لەسەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بێت و شتێ لەو سیما مۆنەی نەگۆڕێت.. هەموو ئەوانەش لە بەندیخانەی «مووسڵ» فێربووبوو و نەیدەتوانی دەستبەرداریان ببێت.. ئاخر ئەم لەو رۆژەوە «پۆلیسی قەلاچۆکردنی تاوان» لەگەڵ کوڕێکی پۆلەکەیان لەو دارستانە چڕەدا گرتبوویان و خستبوویانەتە ئەو زیندانەی بەشی رۆژئاوای شار، خەمناک و پەشێو لەو سووچە دادەنیشت و پیشی دەخواردەوە.. سەری هەڵنەدەبڕی و سەیری هیچ کەسێکی نەدەکرد.. سەرەتا ئەو ژنانەی ماوەیەکی زۆربوو لەوێ بوون و خۆیان لەگەڵ بارودۆخەکەدا راهێنابوو، لێی هاتنە پێش و کەوتنە دڵنەواییکردنی، بەڵام کە

ئەم شتێکی لەو سیما گرژ و مۆنەی نەگۆڕی و بە گەرمی لەگەڵیان نەدوا، ئەوانیش وردە وردە خۆیان لێی دوورخستەوە و بە تەنیا مایەوە.. ئەو چەند جارەیش بردیان بۆ ژووری لێکۆڵینەوە و دواییش بۆ لای دکتۆری پسپۆڕی ئافرەتان و شوێنی مەبەستی جەستەیان پشکنی، نەیدەتوانی بە چاکی وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە و دەنگەکان بە شێوەیەک لە دەم و قوڕگی دەردەچوون، کە خۆیشی بە لایەوە سەیر بوو و هەستی دەکرد هێشتا ترسی جووتبوونی دوو جەستەی جیاواز وێنەی بازوبەندی کچە قەرەجەکانی ناو رەشماڵی قەراغ شاری تەمومژاویی خەیاڵە سەرکێشەکانی جارانی منداڵیی لە گوێچکەیدا دەزرینگێتەوە، کە ئەوسا پێش دەرکەوتنی پۆلیسەکان وەکو تارمایی دەکەوتنە بەر دیدەی لێڵی و بە سواری فیلە زلەکانەوە بەسەر رێگایەکی کەمێ تەسکی پێچاوپێچی ناو ئەو دارستانەدا ڕێیان دەکرد.. خۆیشی نازانێت بۆچی هەموو دڵەکوتێ و راچەنینێک دیمەنێکی ئاوای بیردەخاتەوە و لەگەڵیدا خەیاڵە چرەکان وەکو دەزوولەی زۆر باریکی جاڵجاڵۆکەی قەد دیواری بەرزی قوتابخانە کۆنەکانی «بەغدا» تێوەی دەئاڵێن.. شەتەکی دەدەن و جووڵەی لێدەبرن.. دەیکەن بە قومات و لەسەر جۆلانەی داری ساجی منداڵیی حەوشەی تەسکی خانووە کۆنەکەی جارانی خۆیان پاڵیدەخەن، کە لە هەموو خانووەکانی دیکەی گەڕەکی «تەمووزی کۆن» جیاواز بوو و شەوان لە سەربانەکەیەوە پۆستەخانەکەی ئەوبەری ماڵیان جارێ وەکو رەوەیەک کەرکەدەنی ئێجگار زلی نووستووی دەشتێکی کشوماتی کاکی بە کاکی و جارێ وەکو کۆمەڵێ دارەمەیتی کەڵەکەکراوی ناو گۆڕستانێکی پانوپۆڕی دوور لە ئاوەدانی دەردەکەوت.. بەڕێوەبەری پۆستەخانەکە چاوەکانی تانەیان لەسەر بوو و هەمیشە واتدەزانی دەیەوێت بپژمێت.. ئەم هەموو جارێ ئەو چاویلکە باغە سوورەی دەکردە چاویەوە و لاسایی ئەوی دەکردەوە، کە «حەیات»ی دایکی لە ژن و پیاوە بیانیە دەستفرۆشەکانی بازاڕی هەمیشە قەرەباڵغی «حوزەیران»دا بۆی کڕیبوو و شتەکانی دەکرد بە دوانی سووری وەکو یەک.. دایکی و دراوسێکانیان قاقایان لێدەدا و دەستەکانیان دەگرت بە سکیانەوە.. بەیانیەکیان هەر ئەو چاویلکەیەی لە چاو بوو و خاو خاو و زۆر بێزار دەچوو

بۆ قـوتابخـانه، لەپڕ لاشـەیەکی خـوێناویی لە بەردەرگـا زەبەلاحـەکـەی پۆسـتـەخـانەدا بینی و زرووکـاندی.. ئەم دواتر زانی ئەوە «نەجـوا سـالم»ی دکـتـۆری هەرە بەناوبانگی منداڵان بوو و زۆر جـار لەگـەڵ دایکی چووبوون بۆ لای.. کاتێکیش ئەو شتانەی لە دوای بەجێمابوون و هەراجیان کردن، ئەمان کانتۆرێکی ساجیان بەرکەوت و لە ژووره شێدار و لاچەپەکەی نووستنیان دانا، کـە دەرگاکـەی لای راستی لـە ناوەوە ئاوێنەیەکی لاکـێشـەیی پێـوەبوو و دوای مـاوەیەکی کـەم رووەکـەی تـەڵخ بـوو.. ئەوسـا وێنـەی شـتـەکـانـی بە شێوەیەکی جیاواز دەردەخست و تێکەڵ بە هێڵکاریە سەیرەکانی دەکرد.. ئەو هێڵکاریانەی ئەم وایدەزانی بیچمی ئەو بنیادەمە ترسناکانەن و هەمیشە زۆر بە وردی و کەمێ ترسەوە سەرنجی لێدەدان، کە لە ئەشکەوتە هەتاونەدیوەکانی شـاخـە ئێـجگار بەرز و سـەخـتـەکـانەوە هاتوون و شـەوان لـەسـەر رووی ئەو ئاوێنەیە دەردەکەون.. بەیانیانیش پێش هەتاوکەوتن بە خشکەیی جێیدەهێڵن و لە پەناوپەساری سەربانەکەی ئەو پۆستەخانەیە خۆیان دەشارنەوە.. لای ئەم دنیـای سـەر رووی ئەو ئاوێنەیە رۆژ بە ڕۆژ روونتر سیماکانی دەردەکەوت و دەبوو بە راستی.. بەو چاوە سیحریانەی خۆی، کە پێی وابوو شەوی پایزێکی درەنگوەخت جـووتێ لەقلەق لـە قـەراغ گـۆمـێکی گـەورەی ولاتـی جنۆکـە هەتاونەدیوەکـانەوە بۆ ئەمـیـان هێناون و دوورنیـیـە رۆژێ لەناکـاو بێن بیانبەنەوە؛ دەیتوانی تانوپۆی ئەو دنیایە ببینێت و هەست بە جووڵە و سرتەی هەموو شتێکی بکات.. ئەسپێکی سوور سوور، کە هەر دەتوت لە بۆیەی نینۆک هەڵکێشراوە و هـەمیـشـە لـە بەر تیـشکی هەتاودا یاڵەکـانی دەبریسکانەوە، عەرەبانەیەکی لاکێشەیی رەشی کەمێ قووڵی پڕ لە کەللەسەری سپیی لەسەر رێگایەکی سـەهۆڵبـەنداندا رادەکـێـشـا و قـەلەرەش و داڵە زلەکـان پـۆل پۆل دوایدەکەوتن.. تیژ تیژ غاریدەدا و قرقەی ناڵی قاچە زلەکانی تەقتەتەق تەقتاق تەقتـەق تەقتـاق لە هەمـوو ماڵ و دووکان و قوتابخانە و حەمام و مزگەوت و کۆلان و گەڕەکێکدا دەنگی دەدایەوە.. داڵ و قەلەڕەشەکان سرەوتنیان نەبوو و غەتغەت غەتغات غەتغەت غەتغات بە دوایدا رێگایان دەبڕی.. رۆژێکیان لەپڕ بەبێ ئەوەی شتێ لەو خێراییەی بگۆڕێت، خۆی کرد بە کەنیسەیەکی گەورەی

شارۆچکەیەکی هێمنی قەراغ دەریادا و لە دەرگا ساجەکەی ئاودیو بوو، بەڵام عەرەبانەکەی پێوەنەچوو و عاسی ما.. ئەو لەودیو تەکانی دەدا و تایەکانی لە دەرەوە و لە هەوادا دەخولانەوە.. دەخولانەوە و بەشێوەیەکی چەند بلێی سەیر دەردەکەوتن.. داڵ و قەلەرەشەکان پەلاماری کەللەسەرەکانیان دا و بە دەنووکی تیژیان چاو و مێشکی یەکە بە یەکەیان دەرهێنان.. ئەسپەکە چەند شەو و چەند رۆژ تەکانی دا و ویستی ئەو عەرەبانەیە بەرێتە ژوورەوە، بەڵام نەیتوانی و وردە وردە هێزی لێ دەبڕا.. ئەنجام گیانی دەرچوو و لاشەکەی بۆگەنی کرد.. ئەو کەنیسەیە هەر لە زووەوە چۆڵکرابوو و خەڵکی شارەکەش بۆ شوێنێکی دوور دوور کۆچیان کردبوو.. تاقە قەشەیەکی ڕەشپۆش لەوێ مابووەوە و کز و خەمناک پشتی بە دیوارە سپییەکەی دابوو.. بە دەستی چەپی قیبلەنوومایەکی گەورەی شکاوی گرتبوو و دەستی راستی وەکو سواڵکەر پانکردبۆوە.. منداڵێکی حەوت هەشت ساڵان، کە قژی لە پەڕی قەلەڕەش دەچوو و چەرمی خۆشکراوی سمۆرەی کردبووە پێڵاو، هەموو ئێوارەیەک پێش خورائاوا بە راکردن دەهات و بەردێکی لووسی وەکو هێلکەشەیتانۆکەی دەخستە ناو ئەو دەستەی.. ئەو سەیرێکی دەکرد و بەشێوەیەکی زۆر سەیر سەری بادەدا، کەچی هیچی نەدەوت و باری وەستانەکەیشی نەدەگۆڕی.. بێزەوقانە بەردەکەی هەڵدەدا و تەقەیەکی زۆر سەیری لێ بەرزدەبۆوە.. جارێک بۆ لای چەپ و جارێک بۆ لای راست.. تا وای لێهات لەملا و لەولایەوە بوون بە دوو گردۆلکەی وەک هێلکەشەیتانۆکە و خۆی لە ناوەڕاستیان لە بتی سەردەمە زووەکان دەچوو.. دواتریش هەر لەوێدا، لە پەنا دیواری ئەو خانووەی لە خشتی وەکو پەشمەک درووستکرابوو و شەوانە پۆلێ ئەستێرەی پرشنگدار لەسەر چنار و سنەوبەرە ئێجگار بەرزەکانی باخەکەی هەڵدەنیشتن؛ چاوەکانی دەستەیەک نیگارکێشی گەڕیدەیان بە پەڕۆی وەکو توێژی مار بەستبوو و چوار پیاوی کەتەی دەمامکدراو دەسرێژیان لێکردبوون.. خوێنیان تێکەڵ بە بۆیە رەنگاوڕەنگەکانی ناو کۆڵەپشتیان بووبوو و بەسەر خاکی هەمیشە شێداری سەر رووی ئەو ئاوێنەیەدا رژابوون.. لەمەوە رەنگی هەموو شتەکان گۆڕابوون و هی دیکەیان بەخۆوە گرتبوو.. ئەم هەستی دەکرد جیهانێک، کە خۆی

خاوەنیەتی و لێی بەرپرسیارە، سەرتاپای گۆڕاوە و دەبێ بهێنێتەوە سەر باری جارانی.. سیمای ناشیرین و شێواوی شتەکان بگۆڕێت و جوانیی راستەقینەی خۆیانیان بۆ بگەڕێنێتەوە.. ئەوەتا ئەم هەرچەند چاو دەگێڕێت و نیگاکانی بۆ ئاسۆ دوور دوورەکان دەنێرێت، هیچ دیمەنێک سەرنجی راناکێشێت و هاوکات ترسێکی سەیر ئابلۆقەی دەدات.. ترسێک، کاتێ شالاوی بۆ دێنێت و بە ناخیدا رۆدەچێت؛ هەموو هەستەکانی دەشێوێنێت و دەیەوێت تا تینی تیایە بقیژێنێت.. بەڵام واش بکات هەر سوودی نییە و کەس گوێی لێ ناگرێت.. هەتا ئەگەر گوێشی لێبگرن، ئەم هەر ناتوانێت تێیانبگەیەنێت، کە لەودیوی ئاوێنەی ناوەوەی کانتۆرەکەیانەوە جیهانێک شێواوە و ئەم پێشبینیی کارەساتێکی گەورەی کردووە.. تەنانەت دایکیشی باوەڕی پێ ناکات و هەمیشە لێی تووڕەدەبێت.. کاتێکیش شووی بە «عادیل مەهدی»ی بەڕێوەبەری پۆستەخانەکە کرد و ژوورەکەی تریان بۆ خۆیان رازاندەوە، ئیتر ئەم شەوان وایدەزانی لەناو جەنگەڵستانێکی چڕی دوور لە ئاوەدانییدا بەجێماوە و دەوری بە دڕندەی سەیر سەیر گیراوە.. جار جار لە ترسا بەبێ ئەوەی ئاگای لێبێت و بە خۆی بزانێت، هەڵدەستایەوە و رایدەکرد.. دەستەکانی بە قەدی ئەم درەخت و ئەو درەختەوە دەگرت و دەیقیژاند.. کاتێکی دەزانی وا لەنێوان دایکی و باوەپیارەکەی و لەسەر تەختی نووستنەکەیاندا خۆی گرمۆڵە کردووە و وەکو مشکی زارەترەک هەڵدەلەرزێت.. شتەکانی ئەوێ لەژێر تیشکی کەمێ کزی گڵۆپە پەمەییەکەی بنمیچە سپیەکەدا بەشێوەیەکی زۆر جیاواز دەردەکەوتن و بۆ ساتێ هەستی دەکرد لەناو بەلەمێکی بچکۆلەدا لەسەر پشت پاڵکەوتەوە، کە تیژ تیژ بەلای درەختەکانی قەراغ دەریادا تێدەپەڕێت و شەپۆلە شیریەکان وەکو بێشکە رایدەهەژێنن.. لە پشتی ئەو کەنیسەیەی ئەسپە سوورەکەی تیادا تۆپی و بۆنبۆگەنەکەی دەگەیشتە ئەمسەر و ئەوسەری شار، بەردێکی گەورەی رەش رەش هەبوو و لە گۆڕی ئەسحابەکان دەچوو.. لووس لووس و چەند بڵێی جوان بوو.. لە بەر هەتاودا دەبریسکایەوە و زۆر جار وەکو پەڕی لووسی سەر و ملی مراویی نێر مەیلەو سەوز خۆی دەنواند.. دەنکە تەرزەکان بەسەریدا دەباریین و چزز دەتوانەوە.. باڵندە

سپییەکان لەسەری هەڵدەنیشتن و چزز دەتوانەوە.. ئاسکە کێوییە سوورەکان خۆیان هەڵدەدایە سەری و چزز دەتوانەوە.. کچە کۆچەرە رەشپۆشەکان لەسەری دادەنیشتن و چزز دەتوانەوە.. ئەم دەیان جار خۆی رووتدەکردەوە و بەراکردن بەرەو لای دەچوو.. حەزی لێبوو خۆی بدات بەسەریدا و هەر خێرا گیانی وەکو بەزی دووگی بەرخی قەڵەوی ناو تاوەی داخبووی سەر تەباخی زلی چێشتخانەکان چزززز بتوێتەوە، بەڵام نەدەگەیشت و ئەو رێگایە هەر نەدەبڕایەوە.. وردە وردە هێزی لەبەر دەبڕا و هەناسەی تەنگدەبوو.. دەکەوت و هەرچۆنی بوو هەڵدەستایەوە.. سستر رایدەکرد و تاوێکی تر دەکەوتەوە.. هەڵدەستایەوە و دەکەوتەوە.. دەکەوتەوە و هەمدیس هەڵدەستایەوە.. بە زەحمەت هەڵدەستایەوە و دەستبەجێ دەکەوتەوە.. دەکەوتەوە و هەڵنەدەستایەوە.. لەسەر تەختی نووستنەکەی خۆیدا چاوە خوێنتێزاوەکانی دەکردەوە و ناولەپ و سەرئەژنۆکانی لە تاوی ئازار دەیانتریواند.. بە قاچ چەرچەفەکەی لەسەر خۆی لادەبرد و بەردەوام دەیوت:

ــ ئاخ من کەی دەگەمە ئەو بەردە و لەسەری دەتوێمەوە..!!

دایکی سووک ناوچەوانی بۆ دەشێلا و بە دەنگێ، کە هەنسکی گریانی بەسۆز تەواو گۆڕیبووی و لەرەی زۆر ناسکی منداڵانەی تێکەوتبوو، پێی دەوت:

ــ هیچم لە دەست نایە بۆتی بکەم تاقە کچە رۆحەکەم.. هیچم لە دەست نایەت.

ئەموستیلەکەی پەنجەی براتووتەی دەستی چەپی، کە لە شێوەی دەنکێ تووی رەشی گەییو درووستکرابوو و سارد سارد هەمیشە دەتوت تازە لەناو جامێ بەفراو هاتۆتە دەرێ، تەزوویان بە سەرتاپای گیانیدا دەهێنا و خەیاڵە ئاڵۆز و پەشۆکاوەکانیان لەناو کاسەی سەریدا وەکو گۆمیلکەی ئاوی زستانانی بەردەم تانکیی حەوشەی قوتابخانەکەیان دەبەست.. مەراقی بوو لە نهێنیی ئەو ئەموستیلەیە تێبگات و بزانێت بۆچی لە چلەی هاوینیشدا هەر تەزیوە، بەڵام کاتێ ئەو سکی بە «سالار»ەوە هەبوو و رۆژ بە رۆژ گیانی دەئاوسا، لە گۆشتی پەنجەیدا خەتمبوو و دایکەند.. چەند جارێ ماچی کرد و

دایە ئەو ژنە سواڵکەرەی، کە شەوان لەسەر تەختێکی داری کەمێ بەرزی بە زنجیربەستراوی بەردەم سەروپێخانەی سووچی ئەوسەری قەیسەریە تاریکەکە لەناو پشیلە چڵێسەکاندا دەنووست و تا بەیانی لەژێر پەتووێکی تەنکی شڕی رەنگبواردوودا هەڵدەلەرزی.. بەرمیلەکانی بەرامبەری، کە پڕن لە کەللە و ریخۆڵەی مەڕ و مانگا و بە بەرزایی نیو مەتریش لەسەریان کەڵەکەکراون، ئەگەر چاوەکانی خێل بکات و لەو نیمچە تاریکییەدا لێیان بڕوانێت، ئەوا رێک وەکو دەستەیەک تیرهاوێژی سەردەمە زووەکان دەکەونە بەر بینایی و دیمەنێکی تابلێی سەیریان هەیە، بەڵام ئەو لە سەرما و لە برسا، لە هیلاکی و لە ترسا ناتوانێت تەماشایان بکات و لەگەڵیدا بچێتە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە.. دوای ئەوەی دایکی و باوەپیارەکەی قەیسەریەکەیان کڕی و خستیانە سەر ناوی خۆیانەوە، دووکانەکان چۆڵکران و دووکاندارەکان هەر یەکەیان بە لایەکدا پەرتەوازە بوون، لە تەماڵەوە هەڵیانتەکاندن و بەشێوەیەکی چاکتر بنیاتیاننانەوە، ئیتر چاوی بەو سواڵکەرە نەکەوتەوە و نەیدەزانی شەوان لە کوێ دەنوێت.. هەرگیز باوەڕی نەدەکرد ئەمان ئاوا لەپڕ دەوڵەمەندبن و ببنە خاوەنی ئەو هەموو سامانە.. دایکی فەرمانبەرێکی بچووکی سەرژمێری و باوەپیارەکەی بەڕێوەبەری پۆست، لەکوێیان بوو و چی گەیاندنیە ئەم پلە و پایەیە.. لەو خانووە تازەیەی لە گەڕەکی «ئابی تازە»دا کڕیبوویان و شەوان لە پەنجەرەی ژوورەکانی نهۆمی دووەمیەوە نافوورەی ناو گۆڕەپانەکەی ئەوبەریان لەژێر تیشکی بلاجکتۆرە پەمەییەکانی ئەملا و ئەولایەوە وەکو راهیبەیەکی باڵابەرزی ناو کەنیسەی شاری چۆڵکراوی ئەودیوی ئاوێنەکەی جارانی ماڵە کۆنەکەیان دەردەکەوت؛ رۆژانە سەرنجی لە شتەکانی ناو ماڵ دەدا و بیری لەو گۆڕانکاریە ناکاوە دەکردەوە.. لێوی خوارەوەی دەخستە ژێر ددانەکانی سەرەوەی و بە کون و کەلەبەری رووداوەکاندا دەچووەوە.. ئیتر ئەوەندەی تر ناو سەری ژاوەژاوی تێدەکەوت و ئاگای لە دەوروبەرەکەی دەبڕا.. بەرچاوی تاریکدەبوو و شتەکان وەکو تارماییی کاڵ دەکەوتنە بەر بینایی.. ئەو جارە جلە تەڕە هەڵخراوەکانی سەر تەنافەکە بووبوونە فیلێکی زل و کچێ بەڕووتیی سواری بووبوو.. بە دەستی چەپ تووتیەکی مردوو و بە هی راستی قەفەزێکی

قـامـیشـی پڕ لە پارەی کـاغـەزی بێگانانـی گرتبـوو و لێزمـە بارانێکی ناکـاو بەسـەریدا دەباری.. ئەم لـە دوو حـاڵەتدا هەسـتی بینینـی دەشـێـوا و دیمەنی شـتەکـانی لێ دەگۆڕا: لـە کاتی ترس و لـە کـاتی برسـێـتیـیدا.. سـەرنجی لە سـیـمـای گـۆڕاویان دەدا و لـەگـەڵیـدا قـسـەی هەلـەقـومـەلەقی دەکـرد.. لە راستییشدا بەلای ئەوانەوە هەلەقومەلەق بـوو و سەرودڵیان پێ دەگیرا، چونکە بە چاوی خـۆیـان دەیانـڕوانی و لێی تێنەدەگـەیشـتن، ئەگـینا ئەم وەسـفی درووسـتی هەموو ئەو شـتـانەی دەکرد و جـوان جـوان لێکیدەدانەوە، کە لە دنیا تایبـەتیـیـەکـەی خـۆیدا هـەبوون و چاوەکـانـی تر لە ئاسـتی بینینیـاندا دەستەوستان بوون.. بێشکەی براکەی، کە لە هەیوان لە لای سەرووی پەنجەرە لاکێشـەییەکەدا هەڵواسرابوو و کووکووختـیەکان ناوەکەیان کردبووە هێلانە، هەمـوو ئێوارەیەک پێش نانخـواردن لە بەرچاویدا دەبووە مـانگایەک و لەسـەر رەفـێک پاڵدەکـەوت.. توێکڵی شـووتیـی بۆ هـەڵدەدا و بـە دەمـە زلـەکـەی دەیقـۆزتەوە.. چۆڕاوگـەی لیکێکـی کـەمێ خـەست لە شـێـوەی هێـڵێکـی زیویی باریک بە لالغـاویدا دەهاتـە خوارێ و بۆ سـەر ئـەرزەکە رێچکەی دەبەست.. ئەم لەژێریدا دەوەسـتـا و بەسـەر دەمـوچاویدا دەچۆڕا.. بەرەو ناو سنگـی دەتکا و تەزووی بـە ناخـی ناخی دڵیـدا دەهێنا.. حـەزی دەکـرد هەمـوو گـیـانـی لە چاوتروکانێکدا بتوێتـەوە و ببێت بە شلەیەکی سپی.. چاوە رەشـەکانی وەکو دوو سـەرەمێکوتەی زل تیایدا مـەلە بکـەن و لەبەر تیشکی گڵـۆپە سوورەکەدا بدرەوشێنەوە.. دەستەکانی دەبردە ناو یەخەی کراسە تەنکەکەی و دەیوت:

ــ ئەی مـانگای سـەر رەفـەکە بە لیکەکانت بمـتوێنەرەوە و بمکە بە شلەیەکی بریسکەدار.

ئەمـە قـسـەیەکی زۆر ناشـیـرین بـوو و دایکی دڵی پێی دەگـوشـرا.. لێی توورەدەبوو و بـە تاکێ نەعل تێـیـدەکـەوت.. کـۆمـەڵێ هێـڵـی سـووری لـەسـەر رانەکانی دەکێشا و پێی دەوت:

ــ چونکە کـچی خـۆمی و لێت تێـدەگـەم، دەزانم دەڵێی چی، بۆیە نابێ لەسەرت بچێت.

جـارێکیش دایکی و مـێـردەکـەی بە پێـوە لەو ژوورەی خـۆیان دەسـتـیـان

خستبووه سەر شانی یەکتر و دەمی یەکتریان دەمژی.. ئەم وەکو جلگرەیەکی زل هاتنە بەر چاوی و رووی کرد بەولادا.. چوو هەرچی جلگرەی سەر تەنافەکە هەبوون، هێنایی و دانە دانە خستینیە سەر پارچە ئاسنێکی مووبەقەکە.. بە چەکوش تێیانکەوت و لەتوکوتی کردن.. دایکی لەسەر ئەمەش چینێکی باشی تێهەڵدا و ئەو قژەی چەپک چەپک لە بێخەوە بۆ دەرهێنا.. ئەم دەیقیژاند و دەیوت:

ـ ئێوە لە جلگرە دەچن و رقم لێتانە.. ئێوە ئەملا و ئەولای جلگرەیەکن و لە بنیادەم ناچن.

هەموو جارێکیش باوەپیارەکەی لەژێر دەستیدا دەریدەهێنا و دەیبردە ژوورەوە.. سەری دەنووساند بە سنگی خۆیەوە و پێی دەوت:

ـ نابێ ئاوا بکەیت، چونکە بۆ چاوەکانت باش نییە.

ئەو بە هەق و ناهەق ئەمەی دەوت و لەگەڵیدا هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا.. زۆر جاریش ژنەکەی لێی تووڕە دەبوو و پێی دەوت:

ـ تووخوا چ دڵێکم بە مێردی وەکو تۆ خۆشبێت، لە قسەی قۆڕ بەولاوە هیچی دیکە نازانیت..!!

بەڵام ئەو وازی نەدەهێنا و زیاتر دەیوتەوە.. ئەو جارەش کە عەمەلیاتی چاوەکانیان بۆ کرد و لەسەر تەختی خەستەخانەکە کەوتبوو، «حەیات» پەنجەکانی ئەم دەست و ئەو دەستی خۆی لەیەکتر هەڵکێشابوون و بەردەوام پێی دەوت:

ـ چەند حەزدەکەم کوێربیت و چاکنەبیتەوە، چونکە زۆرم پێ وتی واز لەو قسە بێتامە بێنە و گوێت لێ نەگرتم.

ئەو لە حەژمەتا قژی خۆی رادەکێشا و بە تووڕەیی پێی دەوت:

ـ مەگەر هەڵنەستمەوە قەحپەی کچی نازانم کێ، بەس خۆم دەزانم بە چ دەردێکت دەبەم.. ئەگەر دایکم حیز نەبوویێت و باوکم گەواد، دەبێت بەسەر دنیاوەت نەهێڵم.

بەڵام چاکنەبووەوە و هەردوو چاوی لە دەست دا.. سـەرەتا لە ژوورە بچکۆلەکەی حەوشەی ئەودیو لەسەر کورسیەکی پلاستیک دادەنیشت و کز و

خـەمناک ئـەم دەست و ئەو دەسـتی دەخـسـتـە سـەر رانەکـانی.. دووربینێکی گەورەی سـەربازیی دەکردە ملیەوە و بۆ ناو کۆشی شـۆڕدەکردەوە.. جار جار بێزەوقانە هەڵیدەبڕی و بە چاوە فەوتاوەکانیەوە دەنا.. لەگەڵیدا قسەی سەیر و سەمـەرەی دەکرد و وردە وردە هـەنسکی گریان ئابلۆقـەی ژێکانی قوڕگی دەدا.. لەپڕ دەتەقیەوە و فرمێسکی هەڵدەڕشت.. زۆر کـەم لەو شـوێنەی خـۆی دەجووڵا و هـەمـیشـە وەکو پەیکـەرێکی برۆنزیی دەهاتـە بەر چاو.. لە سێ ژەم ژەمـێکی نـەدەخـــوارد و رۆژ بـە رۆژ ســـیس و لاواز دەبـوو.. ئێـــواران پێش رۆژئـاوا پشـیلەیەکی سـپـیی خـرپن لـەسـەر رانەکـانی هەڵدەتروشکا و سـەری بەشلی دەخستـە سـەر دووربینەکە.. چەند جارێ بـە زمـان ئەمـلا و ئەولای لچ و لێوی خـۆی دەلستـەوە و دوای تاوێ خـەوی لێدەکەوت.. شـەوان سێـبـەرەکەی لەژێر گڵـۆپـە سـووره کـەمێ کزەکەی سـەر سـەری، کە تۆزی هـاوین و پـایزی لەسـەر نیشـتـبـوو و رەنـگی کـاڵکردبۆوە، وەکـو جـاڵجـاڵۆکـەیەکی زل لەسـەر دیوارەکە دەردەکـەوت و «سـامـاڵ» قـێزی لێی دەکردەوە.. کـاتێکیش وەرز گـۆڕا و دنیـا بەرەو ساردیی چوو، پاڵتۆیەکی درێژی دەدا بەسەر شـانیدا و شـەپقەیەکی زلی دەکـردە سـەری.. ئـەوسـا ئەم جـوان لێی وردەبـووەوە و هەسـتی دەکـرد لە بەرچاویدا رێک لـەو تابلۆیەی «رێنیا مـارگرێت» دەچێت، کە بە قـەدی یەکێ لە دیوارەکانی ژوورە شـێدارەکەی نیگارکێشانی قـوتابخـانەکـەیان هەڵواسرابوو و چوارچێوە زەردەکەی کـاڵبـووبووەوە.. دراوسـێ کـۆنەکانیـان زۆر جـار لەنێـوان خـۆیاندا باسـیـان کـردبوو و ئەمـیش بـیسـتـبـووی، گـوایە «حـەمـە خـۆشـەوی»ی باوکی، کە دوای هەرەسی یەکێ لە شـۆڕشـەکـانی رزگاریی نیشـتـیمـانییدا بۆ «بەغدا» دوورخرابووەوە و لەژێر چاودێریی پـۆلیسـدا بووە، هـەرگیـز دوو پێی لە دەرگـــای حـــەوشـــە نـەبردۆتـە دەرێ و لەگـــەڵ هیچ کـــەسێ نـەدواوە.. بەردەوام لەمسەری ژوورەکەوە تا ئەوسەری پیاسـەی کـردووە و لە بەرخـۆیەوە بە هـەرسێ زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی وتوویەتی:

ــ تکایە با دایکم نەزانێت، کە من چەند تەنیام..!!

رۆژێکیـان لە هـەیوانەکە، رێک لەژێر ئەو قاپە چینییـە سپییـەی بە دیوارەوە هـەڵواسـرابـوو و بە خـــەتێکی رەشـی تۆخی جـوان ئـایەتی «ولقـد خـلقناکم ثم

صورناکم»ی لەسەری نووسرابوو؛ کەوتبوو بە دەمدا و گیانی دەرچووبوو.. «سامال» ئەمەی بەحاڵ بیردەکەوتەوە و وەکو تارمایی دەهاتە بەرچاوی.. هەر جارێکیش باوەپیارەکەی ئاوا کز و خەمناک لەسەر ئەو کورسیە دەبینی و سەرنجی دەکەوتە سەر لەشە داهێزراوەکەی، بۆ ساتێ داڵغەی لێدەدا و خێرا لە خەیاڵی خۆی دەریدەکرد.. لە ژێرزەمینەکەی خوار عیادەی «دکتۆر نەجوا» و ڕێک لە تەنیشت ژووری برینپێچەکەی جار جار دەرزیی لەم دەدا، کۆگایەکی گەورە هەبوو و ڕێویەکی مێ و چوار بێچووە مۆمیاکراوەکەی لەناو جامخانەکەی داندرابوون.. هەموو بینێنێکی ئەوانیش ڕۆژی مردنەکەی باوکی بیردەخستەوە و شەوان خەونی سەیر سەیری پێوە دەبینی، بەڵام هەرگیز لەوە تێنەدەگەیشت چ پەیوەندییەک لە نێوان ئەو دوو دیمەنەدا هەیە و مەحاڵ بوو بتوانێت ئەو مەتەڵە هەڵبێنێت.. «عادیل»ی باوەپیارەی لەو کۆگایە ماسکێکی بۆ کڕیبوو و بە دوو لاستیکی باریک دەیکردە دەموچاویەوە، کە لە شێوەی سەری ورچ درووستکرابوو و منداڵانانی گەڕەکی پێ دەترساند.. نیوەڕۆیەک خۆی کێشا بە پایسکیلی کوڕێکی هەرزەکاری کۆڵانی پشتەوەیان و کەوتە ژێریەوە.. نووکی پایدەرێکیان لە نەرمەی سکی چەقی و چووە شارای مەرگەوە.. لەودیوی ئەو ماسکەوە دەگریا و منداڵان گاڵتەیان پێ دەکرد، چونکە ورچەکە لە پێکەنینی خۆی نەدەکەوت و دیمەنێکی چەند بڵێی سەیری هەبوو.. دایکی کاتێ بەرەو ماڵەوەی دەبردەوە و دەیویست بە دەرمانە سوورەکە سەرئەژنۆ ڕووشاوەکانی بۆ تیمار بکات، بەسەر مێردەکەیدا دەیقیژاند و هەر زوو زوو پێی دەوت:

ــ هەی نامەرد..!! دیارە بەوە دڵت ئاوی نەخواردۆتەوە، کە ماسکێکی سیحراوییت کردە دەموچاوی و من و دنیات بە جۆرێکی تر پیشاندام.. ئەنجام ملت شکاندم و دەسخەڕۆت کردم، دەتەوێ تاقە کچەکەشم بدەی بە قەڵبەیەکدا..!!

ئەو لە هەیوانەکە وەستابوو و پەنجەی دۆشاومژەی ئەم دەست و ئەو دەستی ئاخنیبووە کونی گوێچکەکانیەوە.. وەکو مشکی زارەترەک هەڵدەلەرزی و پەنجەی قاچەکانیشی لە ئەرزەکە گیردەکرد، هەروەک بیەوێت کەروێشکئاسا

هەڵیکۆڵێت و لە شەرما بچێتە ناویەوە.. دوای کوێربوونیشی وازی لەو خووەی نەهێنابوو و هەمیشە سەری نینۆکەکانی لەسەر ئەو کاشیە لووسانە جیڕەجیڕیان بوو.. ئەم ددانی ئاڵدەبووەوە و سەغڵەت دەبوو.. بۆیە هەر زوو زوو نینۆککەرەکەی دەهێنا و تا سەر گۆشتەکە بۆی دەقرتاندن.. کەچی ئەو هیچی نەدەوت و باری دانیشتنەکەیشی نەدەگۆڕی.. ئەم دەبووایە ئاگای لێبێت و هەموو شتێکی بۆ بکات، چونکە دایکی سەرقاڵی ئیشەکانی خۆی بوو و زۆر بەکەمی دەکەوتەوە ماڵ.. بەیانییان زوو زوو دەچووە دەرێ و ئەو و «سالار»ی بەسەر ئەمدا بەجێدەهێشت.. هەر ئەمیش دەستی دەگرت و دەیبرد بۆ حەمامەکە.. رووتیدەکردەوە و بە ئاوێکی شلەتێن و بە شامپۆی سەوزی ناو قوتووە زەردەکە دەیشت.. ئەوسا ئەم پۆلی سێیەمی ناوەندی بوو و چاکترین قوتابییش بوو لە وەرزش.. لە یاریی بالە و تۆپی دەست و راکردندا کۆمەڵێ مەدالیای وەرگرتبوو و رۆژ بە رۆژ ناوبانگی زیاتر بە شاردا بڵاودەبووەوە.. بەڵام بۆ بەگبەتیی باوەپیارەکەی تووشی ئەو بەڵایە بوو و نەدەکرا ماڵ بەجێبهێڵێت.. نەیدەتوانی دوای دەوامی قوتابخانە لەو یاریگایەی ئەوبەری ماڵیان مەشق بکات و پەرە بە تواناکانی خۆی بدات.. ترسی هەبوو «ئەنغام مەروان» و «دلارام نەجم نووری»ی گەڕەکی خۆیان بۆڕی بدەنەوە و بەئێجگاریی بەلاوەی بنێن.. یەکەمیان برا گەورەکەی مەشقپێکەری تیپی هەڵبژێردراوی عێراقە و زۆر یارمەتیی دەدات.. دووەمیشیان باوکی فێرکەری تایبەتیی بۆ گرتووە و رۆژانە لە باخە گەورەکەی خۆیاندا مەشقی پێدەکات.. ئەو جارەش «ست غادە»ی وانەی وەرزش جووتێ کالەی تازەی دابوونێ و لە بەرچاوی یاریکەرەکانی دیکەی قوتابخانە پێی وتبوون:

ــ باوەڕم وایە ئێوە لە ساماڵ چاکتر بن، بە مەرجێ لەسەر ئەم شێوە مەشقکردنەی خۆتان بەردەوام بن.

ئەمە بۆ ئەم تێکشکانێک بوو و بەردەوام پێوەی دەتلایەوە.. ئەگەرچی بەهێزبوونی ئەوان، بەهێزبوونی تیپەکەیانە و سەرکەوتنی قوتابخانەکەیان مسۆگەر دەکات، بەڵام ئەو سەرکەوتنە بۆ ئەم هیچ مانایەکی نییە و دۆڕاندنەکەی زۆر بەلاوە چاکترە.. ئەو شەوە دەستەکانی گرتبوو بەملا و

بەولای ڕوومەتەکانیەوە و بە درێژاییی ژوورەکەی خۆی هاتوچۆی دەکرد.. جار جار تا هێزی تیابوو سەری بە یەکێ لە دیوارەکاندا دەکێشا و چوارچێوەی وێنە گەورەکەی «مارلین مۆنرۆ» لەگەڵیدا دەلەریەوە، کە لە دووکانێکی نزیک «سینەمای ئەتڵەس» کڕیبووی و لەو سووچەی هەڵواسیبوو.. گیانی دادەهێزرا و چاوەکانی پڕدەبوون لە ئاوێکی سەیر، کە نەیدەزانی فرمێسکە یان ژانی تواوەی ناو دەمارەکانی، ئاوا لە هەموو لایەکەوە هەڵدەقوڵێن و لەوێدا فوارە دەکەن.. چەند جارێ خۆی هەڵدایە سەر تەختی نووستنەکەی و لەسەر گازەرای پشت لێی ڕاکشا، بۆئەوەی هەر چۆنێ بێت چاوەکانی لێکبنێت و خۆی لەو حاڵەتە ناخۆشە بدزێتەوە، کە وەک ڕەوە داڵی برسیی وڵاتێکی وێرانەی دوای شەڕی درێژخایەن لەسەر لاشەی ساڵەکانی داهاتووی تەمەنی هەڵدەنیشێت و بەردەوام بە گوێچکەیدا دەچپێنێت:

ــ تۆ پیربوویت و ڕۆحت لە کەڵککەوتووە.. تۆ پیربوویت و تواناکانت لە ڕابردوودا بەجێماون.

بەڵام مەحاڵ بوو ئاوا بەئاسانی خەیاڵە جەنجاڵەکان وازی لێبهێنن و خەوی لێبکەوێت.. هەستی بە ئازارێکی سەیر دەکرد و تەواوی جەستەی دەیتریواند.. دەیزانی تووشی نەخۆشییەکی قورس بووە و دوورنییە چەند ڕۆژێ لەناو جێگادا بکەوێت.. ئەمەش زیاتر ڕقی هەڵدەستاند و حاڵەتێکی زۆر تایبەت بە خۆی لە دڵدا دەخولقاند.. ناچار بە دیوارەکەوە هەڵدەستایەوە و هەمدیس دەکەوتەوە هاتوچۆ بەناو ژوورەکەدا.. هەرچۆنێ دەیهێنا و دەیبرد، بەوە کۆتایی دەهات، کە هەر ئەمشەو باوەپیارەکەی بخنکێنێت و بەیانییش ژەهری مشک بۆ براکەی بخاتە خواردنەوە.. ئەوەی یەکەمیان زۆر ئاسانە و لە چاوتروکانێکدا ئەنجامدەدرێت.. بەئەسپایی دەچێتە ژوورە شێدارەکەی و ئازایانە خۆی هەڵدەداتە سەری.. دەستەکانی دەخاتە سەر دەم و لووتی و ناهێڵێت جووڵە بکات.. هەتا ئەگەر بەرگرییش لە خۆی بکات و بە هاوار هاوار دیوارەکان بلەرێنێتەوە، هەر کەس گوێی لێنابێت و بە هانایەوە نایەن.. دایکی ماوەیەکی زۆرە ژووری خۆی جیاکردۆتەوە و ئەو پێش کوێربوونیشی بۆی نەبوو دوو پێی تێبخات.. شەوێکیان «ساماڵ» لەگەڵ دەنگەدەنگی دایکی و

مێردەکەی بێداربووەوە و بە چاوی خەواڵووەوە بە قادرمەکەدا چووە خوارێ، تا بزانێت چی روویداوە و ئەو شەڕەیان لەسەر چییە.. دایکی بە قژی ژاکاو و کراسێکی تەنکەوە لە بەردەرگای ژووری نووستنەکەی خۆی وەستابوو و بەتوورەیی پێی دەوت:

ــ هەر ئەم بوختانە مابوو بۆمی بکەیت ناپیاو.. بۆچی من ئەگەر بمەوێت وا بکەم، لە تۆ دەترسم..!!

جار جاریش پەنجەی دۆشاومژەی دەستەکانی رادەشەقاند و دەیوت:

ــ بشمریت ناهێڵم لەم دەرگایە ئاودیو بیت.. رەنگبێت نەزانم بۆچی وا دەکەیت..!!

ئەم بەیانی راستیی شەڕەکەیانی بۆ دەرکەوت و زانی، کە «وشیارە درێژ»، ئەو کوڕەی لەگەڵ چوار قوتابیی دیکەی «زانکۆی بەغدا» خانووی سەر سووچی کۆڵانەکەیان بەکرێ گرتووە و هەمیشە تەزبێحێکی قەزوانی بە دەستەوەیە، لەو ژوورەی دایکی نووستووە و مێردەکەی پێی زانیوە.. خەڵکی گەڕەکیش لەنێوان خۆیاندا باسی ئەوەیان دەکرد، کە «وشیار» لەبری هەموو مانەوەیەکی لەو ژوورەدا پارەیەکی چاکی دەستدەکەوێت و رۆژانە بۆ کچەکانی زانکۆیان خەرجدەکات.. ئەم نەدەچووە ئەقڵیەوە و دەیان شەڕی لەگەڵ ئەم و ئەودا کردبوو، بەڵام بەیانییەکیان زوو زوو لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە بینی بەسووکی دەرگای حەوشەی کردەوە و بەئەسپایی چووە دەرەوە.. جارێکی تریش لەسەر یەکێ لە شەقامەکانی گەڕەکی «نیسانی کۆن»دا پیاسەیان دەکرد و قاقایان لێدەدا.. ئیتر تەواو راستیی قسەی ئەوانی بۆ دەرکەوت و چیتر نەیدەتوانی بەرپەرچیان بداتەوە.. ئێوارەیەک بەیەکەوە دەبن و «وشیار» کچێکی پۆلەکەیان دەبینێت.. بەیەکتریان دەناسێنێت و بەو دەڵێت:

ــ ئەمە خوشکە گەورەکەمە، حەیاتی ناوە.

«حەیات» پێیدا هەڵدەشاخێت و بە جنێو ریسوای دەکات.. ورد و درشتی مەسەلەکە لە کچەکە دەگەیەنێت و هیچی تێدا ناهێڵێتەوە.. تەمەز ئەو شەرمی پێیە حەزی لە ژنێکی بەتەمەن کردووە و زۆربەی شەوەکانی لەسەر تەختی نووستنی ژوورەکەیدا بەسەربردووە.. ئیتر لەمەوە جیادەبنەوە و زۆریشی نەبرد

تەرمەکەی «وشیار»یان لەسەر شەقامی «شوباتی تازە»دا دۆزیەوە، کە بە تەور کوشتبوویان و کەللەی سەریان وەکو هێلکەشەیتانۆکە هاڕیبوو، بەڵام ناوی و هەواڵەکانی لەسەر دیوارەکان هەر مابوونەوە و ئەم هەمیشە پێیان تەریقدەبووەوە، کە منداڵان بە تەباشیر و خەڵووز دەیاننووسین و هێڵکاریی سەیر سەیریان بۆ مانای قسەکانیان دەکردن.. «عادیل»ی باوەپیارەی هەمیشە سەرشۆڕانە و بەکزی لە دەرگای حەوشە ئاودیو دەبوو و لە رووی نەدەهات تەماشای کەس بکات.. نە گەورە و نە بچووک.. هەر زوو زووش توانجیان تێدەگرت و گوێی خۆی لێ کەڕدەکردن.. ئەگەرچی لە ناخەوە وەکو بتی ژێر کوتەکی بتشکێنە دڵڕەقەکان دادەڕووخا و ئەم زۆر چاک هەستی پێدەکرد.. ئەو جارە یەکێ لە نانەواکانی ئەو نانەواخانەیەی ئەوبەر سەرێکی لێ بادا و رێک و رەوان پێی وت:

ــ ئەوا توانیت گوێچکەشت کەڕکەیت، بەڵام چی لەو چاوە حیزانەت دەکەیت..؟! هەی ناپیاو..!!

هەر ئەویش دوایی وتبووی چاوەکانی بەلایان لێنییە و بەقەستیی خۆی کردووە بە کوێر، بۆئەوەی لە چاوی خەڵکیان بشارێتەوە و ئەوەندە هەست بە شەرمەزاریی نەکات.. «سامال» تا رادەیەک باوەڕی بەو قسەیە کردبوو و سەرەتا زۆر هەوڵی دا راستیەکەی بۆ دەرکەوێت، دوایی وازی هێنا و بە خۆی وت: «ئەو چاوەکانی ساغن یان نەخۆش، مردوون یان زیندوو، گرنگ ئەوەیە ناتوانێت بەکاریان بهێنێت.. هەر شتێکیش بەکارنەهێندرێت، بوونی خۆی لە دەست دەدات.. بەڵێ، ئێستا ئەو کوێرە و هیچ شتێ نابینێت».. ئینجا وای بۆ چوو ئەو پێش چاوەکانی، ئەندامی نێرینەیشی مردبێت و نەیتوانیبێت ئەرکی خۆی بەجێبهێنێت.. دایکیشی، کە تەنها چەند ساڵێکی لە چل تێپەڕاندووە و هێشتا لە زۆربەی کچانی شارەکە جوانترە، هەقی خۆیەتی سەرتاپای لەشی بەکاربهێنێت و نەهێڵێت هیچ یەکێ لە ئەندامەکانی جەستەی کوێربێتەوە.. بۆی هەیە بەردەوام لەزەت وەربگرێت و رۆحی خۆی پێ ئاوبدات.. لە راستییشدا «حەیات» رقی لە هەموو شتێکی مێردەکەی نەبوو و تەنها دژی ئەو ئەندامانەی لەشی بوو، کە لە کەڵککەوتبوون و نەیاندەتوانی لەزەتی پێ

ببەخشن.. بەڵگەش ئەوە بوو لە ماڵەکەی دەرنەدەکرد و نان و ئاویشی دەدایە.. بەڵام «ساماڵ» خۆی دژی هەموو بەشێکی جەستە و رۆحی ئەو و براکەی بوو بەبێ جیاوازی و دەبووایە لەناویان بەرێت، چونکە بەتەواوی رێگربوون لە بەردەم لەزەتەکانی و زۆربەی کات لەناو چوار دیواری ماڵدا بەندیانکردبوو.. نەیاندەهێشت بچێت بۆ ئەو یاریگایە و خەریکی مەشقەکانی بێت.. ئەوە لە کاتێکدا نەیارەکانی ناو تیپەکەی چاکترین دەرفەتیان بۆ هەڵکەوتووە تا بەئێجگاری بەلاوەی بنێن و لەبیر دۆستە هەرە نزیکەکانیشی بەرنەوە.. هەر ئەمەش وادەکات تووشی حاڵەتی پەشێویی دەروونیی ببێت و ئاگای لە دەوروبەرەکەی نەمێنێت.. گیانی وەکو کەلاوەی لێبێت و خەفەتەکان کونەپەپووئاسا هێلانەی لەناو دابنێن.... بەڵام ئەو شەوە بریاری دا سنوور بۆ ئەو هەموو نەهامەتیانە دابنێت و بگەرێتەوە سەر دۆخی جارانی.. دەرگای ژوورەکەی خۆی کردەوە و بەئەسپایی بەرەو ژووری باوەپیارەکەی چوو.. دەیویست بە هەموو هێزی خۆیەوە قورگی بگرێت و بیخنکێنێت.. دەشیزانی دەرگاکەی دانەخراوە و هەمیشە لەسەر گازەرای پشتە.. ئەو بە کوێرەییش وازی لەو خووەی نەهێناوە و هەرگیز حەز لە داخستنی دەرگای ژووری نووستن ناکات.. دەیان جار لەسەر ئەمە لەگەڵ ژنەکەی بووبوو بە شەڕی و قسەی ناشیرینی پێ وترابوو.. لەزەتێکی سەیری لەوە دەبینی وەکو منداڵ دەستەکانی بگرێت بە دەسکەکەیەوە و بەشلی سەری بخاتە سەری.. بەردەوام گۆرانیی زۆر زۆر بەسۆز بچرێت و لەسەر رێتمەکانیشیان لەشی خۆی ببزوێنێت.. ئەوسا «ساماڵ» هەموو گیانی بەژێر لەزەتدا دەکەوت و هەستی دەکرد هیچ کەسێکی دیکە وەکو ئەو ناتوانێت ئاوا ئاسوودەی بکات.. هەموو جارێکیش بەدەم گوێگرتنەوە سەری دەخستە سەر ئەژنۆکانی و دەچووە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە.. بیری لە «ئەهداف جەمال»ی کۆنە دراوسێیان دەکردەوە و رۆژانی پێش مردنەکەی دەهێنایەوە بەرچاوی.. کاتێکی دەزانی دنیا شەوە و ئەو وا بەرووتیی لە گۆرەکەی هاتۆتە دەرێ.. لەژێر تیشکی مانگی چواردەی سەر ئەو گۆرستانە کشومات و بەسامەی، کە هەردوو گەرەکی «ئەیلوولی کۆن» و «ئەیلوولی تازە»ی لەیەکتر جیادەکردەوە و گوڵاڵەسوورەی

سەر گۆڕەکانی هەمیشە دەمیان بۆ دڵۆپەباران کردبووەوە، بەپێوە وەستاوە و بالآی زۆر زۆر لە جاران بەرزتر خۆی دەنوێنێت.. شوێنەواری مەمکە بڕاوەکەی لای چەپی وەکو خۆڵەمێشی نێوان سێکوچکەی ژێر مەنجەڵی ژنە کۆچەریەکانی ئەودیوی ئاوێنەی ژووری نووستنی سەردەمی منداڵیی خانووە کۆنەکەیان دەردەکەوت و دەستی راستیشی توند توند گرتبوو بە مەمکە ساغەکەیەوە.. دەیگوشی و شیرێکی کەمێ خەستی لە کونی سەرگۆکەی دەهێنا.. دەیگوشی و بە دەنگێ، کە بە شەونمی زیویی سەرەتای پایزی سەر گەڵای زەردی وەریوی درەختە بەرز بەرزەکانی قەراغ شار شۆرابوو و کەناریە راوکراو و ڕاونەکراوەکان ئێرەییان پێدەبرد، دەیوت:

ــ رێککەوت نییە.. رێککەوت نییە، کە من بەئاگام و ئێوە نووستوون..!! ئاخر ئێوە نووستنی ناو ژیانتان هەڵبژاردووە و من بەئاگایی ناو مردن..!!

ئیتر ئەم تەزوو بە سەرتاپای گیانیدا دەهات و دڵی پڕدەبوو.. سەرەتا ددانی بەخۆیدا دەگرت و نەیدەویست بگری، بەڵام زۆری نەدەبرد دەتەقیەوە و فرمێسک لە چاوەکانیدا فوارەیان دەکرد.. ئینجا سەری هەڵدەبڕی و لە باوەپیارەکەی دەڕوانی، کە لەسەر باری وەستان و گۆرانیەکانی خۆی بەردەوام بوو و نەیدەزانی وا زڕکچەکەی هێناوەتە گریانی بەکوڵ.. ئەم لە دواوە سەری دەخستە سەر یەکێ لە شانەکانی و چەند جارێ بەسەریەکەوە پێی دەوت:

ــ قوربانت بم باوکە رۆحەکەم، کە دەتوانیت بەو دەنگە بەسۆزەت خۆشەویسترین مردووم بۆ زیندووکەیتەوە..!!

بەڵام ئەو هەستی پێنەدەکرد و سەری لەسەر دەستەکانی و دەستەکانی لەسەر دەسکی دەرگاکە هەڵنەدەگرت.. دایکیشی ئەم شتەی زۆر پێناخۆش بوو و هەمیشە تەریقیدەکردەوە:

ــ کچێ ئەم قسە قوڕانە چین، تۆ دەیانکەیت..؟! وی دایکە قێزم لێیان دێتەوە..!!

ئینجا سەرێکی بادەدا و دەیوت:

ــ بەخوا ئەم مێردەی من چاک خەڵەفاوە..!!

ئەو جارەش پاڵتۆیەکی رەشی کردبووە بەری و قژی لە دواوە بە تۆقەیەکی

لەقلەقی سپی بەستبوو.. لەپڕ لە دەرەوە هاتەوە و ئاوا مێردەکەی بینی.. پاڵێکی قایمی پێوەنا و بە پشتدا خستی.. دەستی کرد بە جنێوی ناشیرین و دەنگی دەگەیشتە گوێچکەی دراوسێکانی ئەملا و ئەولایانەوە.. «ساماڵ» ئەو جارەیش وەکو زۆربەی جارانی دیکە پشتی باوەپیارەکەی گرت و بەگژ دایکیدا چووەوە.. ئەو لە هەموو دنیادا هەر «ساماڵ»ی هەبوو بەرامبەر بەو ژنە زاڵمەی بەرگریی لێبکات و لە شالاوە بەردەوامەکانی بیپارێزێت.. پیاوێکی بێکەس بوو و بە هەتیویی گەورە بووبوو.. ژیانێکی پڕ لە مەینەتی بەسەربردبوو و هەمووی لە نووکەوە بۆ «ساماڵ» گێڕابووەوە.. بە شەو چووە بۆ قوتابخانە و بە ڕۆژ لە مەیدانی باڵندەکان کۆتری فرۆشتووە، بۆئەوەی خۆی و دایکە بێوەژنەکەی بژیەنێت و کرێی خانووەکەیان پەیدا بکات.. فێڵی عەنتیکە عەنتیکەی داهێناوە و بە نرخی زۆر کەم کۆترەکانی لە خاوەنەکانیان کڕیوە.. دەستەکانی لە جۆرە گیایەکی بۆندار دەخشاند و کۆتری فرۆشیارەکانی پێدەگرت.. ئەو بۆنە بۆ ماوەیەکی کەم کاری دەکردە سەر چاویان و نەیاندەتوانی هیچ شتێک ببینن.. بە دەوری خۆیاندا دەخولانەوە و خاوەنەکانیان وایان زانیوە دەمرن.. ئەوسا ئەو بە پارەیەکی کەم لێی کڕیون و دوایی بە نرخێکی گران فرۆشتوونی.. هەموو جارێ هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و بە «ساماڵ»ی دەوت:

ـ خەڵک دەتوانن کۆتری چاک و خراپ تەنها بەزیندوویی لە یەکتر جیابکەنەوە.. کاتێ سەریاندەبڕن و ئاوەڕووتیاندەکەنەوە، هەست بە جیاوازییان ناکەن.. بە زیندوویی شێوە و بە سەربڕاوییش ناوەرۆکی ئەوانیان بەلاوە گرنگە.

«عادیل» ئولفەتی بە کۆترەوە گرتووە و شارەزاییەکی سەیری لە ژیانە تایبەتەکەیان پەیداکردووە.. هەموو جۆرەکانی ناسیوە و توانیویەتی لاسایی دەنگی یەکە بە یەکەیان بکاتەوە.. بینینی پەڕێکی بچووک یان گەورەی هەر کۆترێک بۆ ئەو بەس بووە، تا جۆر و ڕەگەزەکەی بۆ دەرکەوێت و بزانێت مردووە یان ماوە.. سەرلووسە یان سەربەکڵاو.. قاچڕووتە یان پەڕلەپێ.. هاقووە یان دەنووککورت.. چەند بەچکەی کردووە و چەندی تر دەکات.. دەتوانێت تا چ ئاستێک لە ئاسمان بەرزبێتەوە و چەند تەقڵە بەسەر یەکەوە

لێبدات.. توانای دۆزینەوەی شوێنەکانی چەندە و خێرایی فڕینەکەی چۆنە.. کەی تووشی دەرد دەبێت و کەی دەمرێت.. ئەنجام کتێبێکی گەورە دەربارەی ژیانی کۆتر دەنووسێت و هەر خێرا ناوبانگی بە سەرتاپای وڵاتدا بڵاودەبێتەوە.. لە هەر چوار لایشەوە سنوورەکان دەبڕێت و بۆ چەند زمانێک وەریدەگێڕن.. دەوڵەت خەڵاتی دەکات و لە فەرمانبەرێکی بچووکەوە دەیکەن بە بەڕێوەبەری پۆست.. «لەیلا فارووق»ی مامۆستای زیندەوەرزانی زۆر پێی سەرسامدەبێت و شووی پێدەکات.. هەر ئەو ساڵە لە «نەخۆشخانەی قادسیە»دا بەسەر دووانەیەکەوە دەچێت و ئەو بەتەنیا بەخێوکردنی منداڵەکانی دەکەوێتە ئەستۆ.. بۆی ناکرێت و دەیەوێت بیانداتە هەتیوخانە.. بەڵام «فایزە»ی دراوسێیان، کە لە ساڵۆنی «غەرام» قژی ئافرەتانی دەبڕی و ساڵی پێشوو مێردە ئەفسەرەکەی لە بناری شاخێکدا کوژرابوو؛ دەیانگرێتە خۆی و بە یارمەتیی «دادە نایلە»ی دایکی لەگەڵ «سەرمەد»ی تاقە کوڕی بەخێویاندەکات.. کاتێکیش «عادیل» «حەیات»ی خواست و بوون بە ژن و مێرد، بەجووتە داوای منداڵەکانیان لە «فایزە» کردەوە و ئەو رازیی نەبوو بیانداتەوە.. پارێزەریان گرت و مەسەلەکەیان گەیاندە دادگاش، بەڵام هەر سوودی نەبوو و نائومێدانە لێی دەرچوون، چونکە دوو کچەکە ئەویان بە دایکی خۆیان دەزانی و بەهیچ شێوەیەک نەیاندەویست جێیبهێڵن.. هەرچۆنێ بوو لەسەر ئەوە رێککەوتن هەموو ناخۆشیەکان بەلاوەنێن و هامشۆی یەکدی بکەن.. سەرەتا ئەو پەیوەندیە زۆر بەچاکی دەچووە پێش و بە حەفتە لە ماڵی یەکتر دەمانەوە.. تەنانەت هەستیان دەکرد یەک خێزانن و خەڵکیش سەریان لەمە سوڕمابوو.. «سامال» حیسابی خوشک و برای راستەقینەی بۆ «ئالاء» «وەلاء» و «سەرمەد» دەکرد و هیچ نهێنییەکی خۆی لێ نەدەشاردنەوە.. لەگەڵیان دەچووە دەرەوە و لە بەرچاوی ئەم و ئەو خۆی پێوە بادەدان.. بەڵام کاتێ «حەیات» شووڵی لێ هەڵکێشا و هەواڵەکانی وەکو چۆلەکە لەسەر زمانێکەوە بۆ یەکێکی دیکە هەڵدەفڕین، «فایزە» پشتی تێکردن و نەیدەهێشت منداڵەکانیشی هامشۆیان بکەن.. «سامال» هەقی بەسەر ئەواندا نەبوو و پەیوەندیی خۆی لەگەڵ تێکنەدابوون.. هەروەکو جاران دەچووە لایان و زۆر شەویش لەوێ دەمایەوە..

ئەگــەرچی «فــایزە» رووی نـەدەدایە و بەچاکــیــش وەڵامـی پرســیــارەکــانی نەدەدایەوە.. دوا جاریش لە ماڵەکەی دەرکرد و ڕێک و ڕەوان پێی وت:

ــ حەزناکەم چیتر لێرەت ببینم.

ئەم بەرپەرچی دایەوە و پێی وت:

ــ تۆ بۆ خـۆت هـەر بڵـێ.. من دێم بۆ لای خوشک و برای خـۆم و نایەم بۆ لای تۆ.

ئەو قاقایەکی لێ دا و بەگاڵتەپێکردنەوە وتی:

ــ تۆ هـەقی خـۆتە نەک منداڵەکـانی مـن، بەڵکو هـەمـوو کـوڕ و کـچـێکی ئەم دنیـایە بە خوشک و برای خـۆت بزانییت، چونکە هـەموو ئەوانەی وەکو تۆ زۆڵن و نازانن کێ باوکیانە، دەبێت زوو زوو.....

تەواوی نەکرد و بەدەم قریشکەیەکەوە پێی وت:

ــ ئێـسـتـا بۆ وازمـان لێناهـێنیت و وام لێـدەکـەیت قـسـەی ناشـیـرینت پێ بڵێم..!! بڕۆ دەرەوە دەی..!!

بە دڵی شکاوەوە چووە دەرێ و پشـتی کـردە ئەو مـاڵەی، کـە لە خـانووی ناو یەکێ لە تابلۆ سورياليـەکانی «شاگاڵ»ی هونەرمەند دەچێت و چاکترین شوێنە بۆ چوونە ناو خەیاڵی قـووڵ قووڵەوە.. یەکەمجار بیـنی و سـەری بەناوداگرت، وا چووە ئەقڵـیـەوە سـەردەمێ کووخێک بووە لەناو دارسـتـانێکی چڕدا و شـەوان بۆتە شـوێنی کـۆڕگـەرمکردنی ئـەو دڵدارە دێوانە و دەنگخـۆشـانەی، کـە دوای نائومــێـدیی، ژیانی ئـاوەدانیــیــان بەجــێــهــێــشــتــووە و لەو دارســتــانەدا گــیـرســاونەتەوە.. کـاتێکیش راوی تاوس دەسـتی پێکردووە و ویسـتـوویـانە قڕیانکـەن، ئەوان پۆل پۆل هاتوون و بێـجگـە لە باڵیـان هـەمـوو پەڕەکـانی تریان لەوێدا بەجێهێشتووە، تا کێشیان سووک بێت و بتوانن بە چاکی ڕێگای هات و نەهات ببڕن.. کۆچیـان کردووە بۆ شـوێنێکی دوور دوور و چاوەڕێن هێمنی و ئاسایش بگەڕێتەوە.. ئەوسا دێنەوە و هـەر یەکەی پەڕی خۆی دەباتەوە.. حەزی دەکرد ئەو ڕۆژەی تاوسـەکان دێنەوە و هـەموویان بەجـارێ لە سـەر دیوار و ناو حـەوشـەکەدا هـەڵدەنیشن، ئـەم لەوێ بێت و بە چاوی خـۆی ئەو دیمـەنە ببینێت، کــە لە خــەونی بەرەبەیانی پایزێکی فـێنکی درەنگوەخـتی ســەربانی خــۆیان

دەچێت و دواتر بەدەم گریان و گۆرانیەوە نەبێت ناکرێت بۆ کەسی بگێڕێتەوە.. بەڵام ئاخ وا دەریانکرد و ئیتر ناتوانێت جارێکی تر بیبینێتەوە..!! سووک سووک هەنگاوی دەنا و خوڕ خوڕ فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتنە خوارێ.. ئێوارەیەکی درەنگ بوو و کزەبایەکی فێنک پەرچەمی خاوی سەر چاوەکانی وەکو لقی درەختی ماڵەکانی ئەمبەر و ئەوبەری دەلەراندەوە.. بەقەستی رێگاکەی گۆڕی و بە لای دەستە چەپدا پێچی کردەوە، تا بەلای «تۆمارگای فەریال»دا بڕوات و گوێ لە گۆرانیەکانی «نەوال جابر» بگرێت، کە «دارا بارام»ی خاوەنی هەموو ئێوارەیەک پێش داخستنی دەرابەی دووکانەکانی سەر «شەقامی دڵداران» دەنگی بەرزدەکاتەوە.. ئەوسا ئەم دەتوانێت ئاخ و ئۆفەکانی ناو دەنگە ئێجگار بەسۆزەکەی وەکو کلوەبەفر لە ئاسمانی ئەو ناوەدا ببینێت و لەگەڵیدا بچێتە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە.. ئەمەش بەسە بۆئەوەی دیمەنی هەموو شتەکان لە بەرچاویدا بگۆڕێن و هاوکات هەست بکات تەنیایی تا بینەقاقای هاتووە.. وەکو قوماشی ئاوریشم تێوەی ئالاوە و وێنەی منداڵی سەر بێشکە کردوویەتی بە قومات.. ئەم هەموو شانزدەی مارتێک، کە ئەو رۆژەیە «نەوال جابر»یان کوشت و کۆتاییان بە ژیانی هێنا، لە کاتژمێر دوانزدەی شەوەوە تا دوانزدەی شەوی دواتر خۆی دەخزێنێتە ژوورەوە و دەرگا و پەنجەرەی پشت پەردە ئەستوورەکان دادەخات.. دەم لە نان و ئاو نادات و لەناو ئەو تاریکاییەدا پیاسە دەکات.. ریکۆردەرەکە دەنووسێنێت بە سنگیەوە و بەدەم گوێگرتن لە گۆرانیەکانیەوە فرمێسک هەڵدەڕێژێت، کە لەنێوان هەموو ئاخ و ئۆفێکیدا منداڵیی خۆی دەبینێت.. دەیبینێت و رووت و پێخاوس لەسەر رێگایەکی چەوڕێژی نێوان قامیشە هەڵچووەکاندا بە دوایدا دەگەریت.. کاتێکیش دەرگا دەکاتەوە و دێتە دەرێ، رێک لە بنیادەمی سەردەمە زووەکانی ناو ئەشکەوتەکان دەچێت و وا هەست دەکات بەم ژیانە نامۆیە.. چاوەکانی لەژێر تیشکی ڕووناکیی گڵۆپە پەمەییەکانی رارەودا بەحاڵ دەکرێنەوە و دیمەنی شتەکان بەشێوەیەکی زۆر جیاواز دەبینێت.. بە هیوا بوو شوو بە کوڕێکی دەنگخۆش بکات و کچێکی جوانی ببێت.. ناوی بنێت «نەوال» و گۆرانیبێژێکیی لێهاتووی لێدەرچێت.. شووی کرد بە «فەرەیدوون» و

بەڕاستـیـیش دەنگێکی خـورافـیی هەبوو.. چـەند گـۆرانـیـیـەکی لە تەلەڤـزیۆن تۆمــارکــردبوو و ناوبـانگی بـە هەمــوو وڵاتدا بڵاوبووبـووەوە، بەڵام لەجـیــاتی کـچێکی هونـەرمەند، کوڕێکی لاساری بوو و رێک بەپێـچەوانەی خـواستەکانی ئەم دەرچوو.. سەرەڕۆ و جەربەزە.. کەللەڕەق و هەڵەشە.. تەنانەت دوای ئەوەی چاوی چەپی لە دەست دا و هـی ڕاستـی کەوتـە ئێش.. کەوتە ئێش و رۆژ بەڕۆژ کزتر دەبوو، هەر وازی نەدەهێنا و لەو بەندیخـانەیە بە چاکی کـارەکانی خـۆی ئەنجـام دەدا.. دوا کەس لەژێر دەسـتیدا رۆحی دەرچوو و لاشەکەی بە قامـچی شێـواند، «ئارام دارا بارام»ی هاوڕێی گیـانی بەگیانی خـۆی بوو و هیـچ بەزەیی پێدا نەهـاتەوە.. بە درێژاییـی ئەو هەموو ساڵە وێنەکەی منداڵیی لە قەدی یەکێ لە دیوارەکـانی ژووری نووسـتنـی «سـامـاڵ»ی دایکی درابوو و بزەی سـەر لێـوی ناسکـی لە ڕۆژگـارە هەرە دژوارەکـانیـشـدا نەدەکـوژایەوە.. گـوێی لەو هەمـوو پاڕانـەوەی «دلارام»ی دایکی نەگــرت، کــە لـە گــەڕەکی «ئـابی تازە»ی بـەغــدا دراوسـێی مـاڵی نەنکی بوو و زۆربەی ژیانـی خـۆی لەگـەڵ «سـامـاڵ»ی دایکی بەسەربردبوو.. لە قۆناغی سەرەتاییەوە تا رۆژگاری زانکۆ بەیەکەوەبوون و دوو ئەندامی زۆر چـالاکی تیپی وەرزش بوون.. ئەو جارەی ئەم بە قورسـی بریندار بوو و خــەریک بـوو بکەوێتــە دەست ســەربازەکــان، «ئارام» گــیــانی خــۆی بۆ خستبووە مەترسیـەوە و دەربازی کردبوو.. کردبوویە کۆڵیەوە و چەند فرسەخێ دووریخسـتبـووەوە.. دواتر خسـتبوویـە سەر پشتی ئەسپێک و گەیاندبوویە ئەو لادێیــەی، کـە بـە قـەدی شـاخـێکەوە بوو و لە دوورەوە خـانووەکـان لە بەرچاوی «سـامـاڵ»دا وەکـو رەوەیەک کـەرکـەدەنی نووســتـوو دەردەکـەوتن.. ئەم هەر لە زووەوە مــەراقی بـوو ئەو شــوێنە ببـینێت و بە کـامی دڵ لێـیــەوە بڕوانێـتــە خـوارەوە.. ئەوسـا رەنـگە چاکترین شت ئەوەبێت دەسـتەکانی بگرێت بەمـلا و بەولای رووبـەتەکانیـەوە و بڵێت: «سـەیری مـردن کـەن، تاکو کویێ هاتووە..!!».. جارێکیان لە سـەرەتای شـۆڕشـی رزگاریی پێشوو لەگەڵ «فـەرەیدوون»ی مێردی بە ئۆتـۆمـۆبیلەکـەی خـۆیان بـەلایدا تێـپـەڕیبـون و داوای لێکردبوو شـەو لەوێ بمێننەوە، بەڵام ئـەو ڕازیی نەبـوو و دەسـتـی نا بە ڕوویـەوە.. سـاڵێکیـشـیــان کـرابوو بە ســەرۆکی لیــژنەیەکی ســەرژمـێـری و دەبووایە کـون و کـەلـەبەری

بگەڕێت، بەڵام بەسەردا نەخۆشکەوتبوو و نەیتوانیبوو لەتاوی ئازار لە جێگادا بێتە دەرێ.. ئەگەر لە سەردەمی منداڵیی بیدیبا و سەرنجی بکەوتایەتە سەری، وا دەچووە ئەقڵـیـەوە شـەوانە ڕۆژ لـەوێدا دەنوێت و هـیـلاکـیی گـیـانی خـۆی دەردەکات.. ئەو شـەوە لـەگەڵ «فـەرهـادی قـالە پاقـلاوە» بە جـێبی شـوفـێرێکی سەر ماشـوبرنج تا بنار هاتن و لەوێ سەر و ئێستریان لەو پیاوە بەکرێ گرت، کـە هـەر لە ئاگـرپـەرسـتـەکانی سـەردەمی زوو دەچوو و پیشـەی ئەوە بوو وڵاغ رابێنێت باری قورس بەسەر ئـەو شاخەدا بخات.. ئەو پیشـەیەی پشتاوپشت لە باپیـرەگـەورەیـەوە بۆ مـابووەوە و بـە درێژاییی هـەمـوو ژیانی خـەریکـی بوو.. سـیـمـایەکی عـەنتیکەی هـەبوو و ریشـە درێژ و پڕەکەی لە هێللانەی پەڕەسێلکە دەچوو، کـە ئەم بە منداڵیی لە مـاڵێکی ناسـیـاویان بینیـبـووی و دایکە و باوکەیەک لە پووشێکی زەردهەڵگەڕاوی نەرم درووستیان کردبوو.. بە زمانێکی زۆر سـەیر دەدوا و ئەم هیـچی لێ حـاڵیی نەدەبوو.. بەڵام «فـەرهـاد» چاک لێی تێدەگـەیشت و ڕێکوپێک قسـەی لەگەڵدا دەکرد.. بۆ سـاتێ وا چووە ئەقڵـیـەوە لەناو ریزەکانی شۆڕشدا هەزارانی ئاوا هەن و شـۆڕشگێڕەکان لە قوتابخانەی تایبـەتیی فـێـری زمـانەکـەیان دەکـرێن.. کـاتێکیش گـەیشـتنە سـەرەوە و بۆی دەرکەوت ئەوێ نەخـۆشـخانەیە.. نەخۆشـخانەیە و دکتـۆر و برینپێچ و سیستەر و تەواوی کاربەدەستەکان هەمان سیمای ئەو پیاوەی خوارەوەیان هەیە و بەو زمـانەیـش دەدوێن، تەواو هـەسـتـی کـرد ئـەم لە بەردەم دیمـەنێکی ئێـجگار سەیردایە و ئـەوەندەی تر حەپەسا.. لێیان ڕادەما و بیری دەکردەوە، ئاخۆ ئەم لە رابردوودا دەژی و خـەیاڵەکانی سـەردەمـە یەک لە دوای یەکەکانیان بڕیوە، بڕیویانە و گەیشتوونەتە ئێرە.. یاخود لە چەرخێکی زۆر درەنگەوە گەڕاوەتەوە بۆ چەرخێکی زۆر زوو و بەم ژیانە سەیر و سەمەرەیە نامۆیە.. ئەوەی ڕاستیە و ناتوانێت نکووڵیی لێ بکات، ئەوەیە کـە دیمەنی ئاوا هەرگـیـز لە ئێـسـتـادا جێگای نابێتەوە و دەشێ ئەمە شوێنێک بێت لە وەهم.. وەهم بێت و بێجگە لەم هیچ کەسێکی تر نەتوانێت ببینێت.. تەنانەت کوڕەکەی، کە رووتکرابووەوە و بێـهۆش لەسـەر لبادێکی سپـیی ناوەڕاسـتی ژوورێکی چوارگـۆشـەییـدا درێژ کرابوو، ئەو لبـادەی هـەر دەتوت لە تەمـومـژی ئاسـۆ دوور دوورەکانی ئەودیوی

ئاوێنەی ماڵە کۆنەکەی سەردەمی منداڵیی خۆی درووستکراوە و بۆنی کفنی رزیوی لێدەهات؛ هەستی دەکرد هی ئەم نییە و ئەویش وەهمێکە وەکو هەموو وەهمەکانی تر.. بەڵام ئاخۆ لە هەرەسە ناکاوەکاندا، کە لە چاوترووکانێکدا هەموو شتێکی شاخەکان لە هەرە نزمەکەیانەوە تا هەرە بەرزەکەیان کۆتاییان پێدێت و شۆڕشگێڕان هێمن هێمن بەرەو قەتارەی زیلەکانی بنار شۆڕدەبنەوە؛ ئەو شوێنانە چییان بەسەر دێت و ئەو خەڵکە سەیرە روو لە کوێ دەکەن..؟! بۆیە ئەنجامی ئەو سەرژمێریانەی دوای هەموو هەرەسێک ئەنجام دەدرێن و لە ماوەی بیستوچوار سەعاتدا ناوی یەک بە یەکی دانیشتوانی بست بە بستی وڵات سەرلەنوێ لە فایلەکاندا تۆمار دەکرێن؛ جێگای گومانن و ژمارەکان لە شوێنێکی ئاوادا توانای خۆیان لە دەست دەدەن.. هەموو هێماکانی ماتماتیک لە لێکدان و دابەشکردن و کەم و کۆوە تا کەرت و ڕەگ و دووجا و سێجا و چەندجاکانی تر ماناکانیان وندەکەن و هی دیکە بەخۆیانەوە دەگرن.. ئەم ئەو ماوەیە تا کوڕەکەی چاکبووەوە و کەوتەوە سەر پێ، شەوان لەو ژوورە تەسکەی ئەودیو بەدەم بیرکردنەوە لە سیمای تێکشێواوی شتەکان خۆی دەخزاندە باوەشی «فەرهاد» و لە ترسا دەیگوشی بەخۆیەوە.. لە شوێنێکی ئاوادا، کە چەندین پلە لە سەرووی خەونەوەیە و ناخی مرۆڤ وەکو کاتژمێری قەد دیواری کەنیسە بەرز بەرزەکان دەردەکەوێت، هیچ بیانوویێک نامێنێتەوە بۆ بوونی سوپەر ئیگۆ و بڕیار و جووڵەکان بیرکردنەوە و دوودڵییان ناوێت.. لێرەدا شەرم پێویستییەک نییە و هونەری جوانکردنی کردارەکان و پەردەپۆشکردنیان شتێکە بێمانا.. وشەکان وەکو ئەوەی لە ناخدا هەن و سەرهەڵدەدەن، ئاوا دەردەبڕدرێن و میتافۆڕەکان فریای گۆڕینیان ناکەون.. ئەوەی دەمێنێتەوە هەر ترسە و حەپەسانی ئەبەدی.. ئەو حەپەسانەی تێکەڵ بە هەموو ساتەکانی دواتری تەمەنی بوو و سەرتاپای ژیانی گۆڕی.. ئەو حەپەسانەی خستیە سەر ئەو باوەڕەی ئەوێ شوێنێک بوو وەکو منداڵدان و تێیدا خوڵقا.. تێیدا گەورەبوو و تێیدا ژیا.. تێیدا پێگەیشت و تێیدا لە دایک بوو.. هەموو پرسیارێکیش لێیەوە وەکو پرسیاری لەدایکبوونی یەکەمیەوە زەحمەتە و جیاکردنەوەی خەون و واقیعی لێبوو بە تەلیسم.. زمانی لە بناغەوە

هەڵتەکا و ئەوەندەی دیکە قسەکانی لەگەڵ یاساکانی گراماتیک و لۆژیکەکانی زانستدا کەوتنە ناکۆکییەوە.. بیرکردنەوە و باسکردنی ئەوێ شێوەیەکی دیکەی زمانی گەرەک بوو و هەرگیز بەو زمانەی جاران نەدەکرا.. نەیدەزانی چەند لەوێ مابووەوە و چەند جار لەگەڵ «فەرهاد»دا نووستبوو، بەڵام دەیزانی سکی هەیە و رۆژ بە رۆژ زیاتر بەرزدەبووەوە.. «فەرهاد» لەگەڵیدا گەڕایەوە ناو شار و چەکەکەی شانی لە یەکەم کۆنترۆلی سەر رێگا دانا.. لە خانوویێکی دوونهۆمیی گەڕەکی «گوڵان»دا وەکو ژن و مێرد دەژیان و ئەو کارگانەی ناو شاریان بەڕێوە دەبرد، کە لە «قالە پاقلاوە»ی باوکیەوە بۆی مابووەوە و سەدان کرێکار ئیشیان تێدا دەکردن.. هەرگیز نەدەچووە ئەقڵیەوە رۆژێک لە رۆژان هاوڕێیەکی منداڵیی کوڕەکەی ئاوا ببێتە مێردی و لە شۆڕشگێڕێکی ئێجگار جەربەزەی شاخەوە بگۆڕێت بۆ سەرمایەدارێکی زۆر هێمنی ناو شار.. منداڵێکی دایکمردووی بێنازی گەڕەکی «سەیداوە» بوو و دەیان جار هاتبووە ماڵیان.. زۆر شەو لایان دەمایەوە و لە ژووری کوڕەکەی جێگای بۆ دادەخست.. بەیانیان پێش ئەوەی هەڵیانستێنێت و بەرچاییان بۆ ئامادە بکات، دەهات لە نێوانیاندا پاڵدەکەوت و قۆڵە رووتەکانی لەملا و لەولاوە دەخستە ژێر سەریانەوە.. هەر خۆی دەیبردە حەمامەکە و دەیشت.. جلەکانی لەبەر دەکرد و قژی بۆ دادەهێنا.. ئەو تاقە منداڵێکی ئەو گەڕەکە بوو، کە ئەم پێی ناخۆش نەبوو کوڕەکەی هاوڕێیەتیی بکات و بیهێنێتەوە ماڵ.. لەوەش سەیرتر باوکی تا هەڵگیرسانی شۆڕشی رزگاریی تازەش کەسێکی زۆر ئاسایی بوو و دووکانێکی بچکۆلەی شیرینیی لەسەر سووچی بازاڕی زەڕەنگرەکان کردبووەوە، کەچی ئەو هەموو سامانەی لە دوا بەجێما و پیاوی گەورە گەورەی شار لە پرسەکەی ئامادە بوون.. ئەوەندە هەبوو سیمای وڵات بەجارێ لە بەرچاوی ئەمدا گۆڕابوو و هیچ شتێ لەوەی جاران نەدەچوو.. خانووەکان، کۆڵانەکان، گەڕەکەکان، مزگەوتەکان، حەمامەکان، نەخۆشخانەکان، دووکانەکان، بازاڕەکان، قوتابخانەکان، کارگەکان، رێگای نێوان شارەکان، کەسەکان، هەر هەمووی بۆ ئەم تازە بوون و نەیدەتوانی وا بەئاسانی لەگەڵ سیمای تێکشێواویان رابێت.. زەحمەت بوو جیاوازی لەنێوان

خـەڵکی گـەڕەکـێک و یـەکـێکی تـر، شـارێک و ئەویتـردا بکات و هـاووڵاتی و گەشـتکەرەکانی بۆ لە یەکتر جیا نەدەکرایەوە.. سەرەتا وایدەزانی خەتای ئەو سکەیەتی و حاڵەتێکی کاتییە.. کاتییە و دواتر نامێنێت.. بەڵام هەر ما و ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوو.. کارگەی بووکەشووشـەش، کە خۆی بەڕێوەبەری بوو و ڕۆژانە هەشت سـەعاتی ڕەبەقی تێدا بەسـەر دەبرد، بۆ ئەم شـوێنێکی گونجاو نەبوو و هەمیشـە رابردووە پڕ لە گومان و وەهمـەکەی دەخستـەوە بەرچاوی.. دیمەنی شـتـەکانی ئەوێ دەیانتـوانـی چاکتـر خەیاڵەکانی بە قووڵاییی ناخیدا بەرن و بـە هـەورازەکـاندا ســەریانخــەن.. لـەوێ هەســتی دەکــرد دنیــا بـۆتە منداڵدانێک و ئەم تەنیا و رووتوقووت، حەیران و سەراسیمە تێیدا وەستاوە.. جـەســتـەی هـێلکەشــەیتــانۆکـەیەکی زلە و ناخـی پڕە لە خــورافـە.. لەنـاو ئەو کـارگـەیەدا ترسـێک لە شـێـوەی هێـلـکێکی گـەرمی داخـبـوو ناخی تـەزیوی لە ناوەڕاســتــەوە دەکـرد بـە دوو لەتی یـەکـســانەوە، کــە لەمــلا و لـەولایەوە دوو کـۆرپەلەی لەیـەکچـوو دەژیان و پێـی وابوو هـەرگـیـز لە دایک نابن، چونکە ئەم خۆیشـی لەناو منداڵدانێکدا گیری خواردووە و پزدانێکی ئەسـتوور لە شێوەی توێژی مار شەتەکی داوە.. ئێواران دەگەڕێتەوە و بەترسەوە سەرنج لە سیمای ئەو خەڵکە دەدا، کە مات و مەلوول، کز و بێدەنگ لە بەردەرگاکاندا دەوەستن و هەر دەڵێی چاوەڕێی هـاتنی لەشکرێکی دڕندەن.. هاکـە گـەیشت و گـەورە و بچووکی داپڵۆسـین.. هیچ یەکێ لەگەڵ ئەویتر نادوێت و ژیانێکی تا بڵێی سەیر دەگـوزەرێنن.. لە کـارەکتـەری نـاو تابلۆکـانـی «ئیـدوارد هۆپـەر» دەکـەن و ئەم زەندەقی لێیان دەچێت، کە دەیان جار لەگەڵ «سـەرمەد»ی برای لەسـەر تەختی نووسـتنەکەی ئەم پاڵکەوتبوون و لێیـان ڕامـابوون.. کوڕێکی تەنیـا، کچـێکی تەنیا، پیاوێکی تەنیـا، ژنێکی تەنیا، پیرەژنێکی تەنیا، پیرەمێردێکی تەنیا، هەر هەمــوویـان خــەمناک خــەمناک، لە بەردەرگــاکــان، یان لـەودیو پەنجــەرەکــان چاوەڕێن.. چاوەڕێی چین..؟! نازانێت..!! خۆشـیان نازانن.. ئەم نە هونەرمەند بوو و نە هونەردۆست، یان وەکو جارێکیـان کچێکی چەتوونی تیپـەکـەیان بە گاڵتە پێی وت لە چاکترین حاڵەتدا سۆزانییەکی دەستەپاچەیە، بەڵام لە ئاستی تابلۆکـانی «ئیـدوارد هۆپـەر»دا دەحـەپەسـا و نهـێنیی هەمـوو ژیانی لەوێدا

دەبینی.. «ئالاء» و «وەلاء» خــەمی ئەو کــرێکارانەیان بوو و ژیانی خــۆیان بۆ دەخــســتنە مــەترســیــەوە، کــە بە درێژاییی ڕۆژ بە کــرێیــەکی ئێــجگار کــەم دەیانڕەتێن و شــەوانەیش بستێ خاکیان نییە لەسەری پشــوو بدەن، بەڵام ئەم لە دنیای «هۆپەر»دا مرۆڤی دەبینی لە جوانترین خانوودا دەژیان و هەستیان پێ نەدەکرد.. ڕازاوەترین باخــیــان هەبوو و نەیاندەبینی.. ئای لە ڕەنگوڕووی بنیــادەمــی بەر ئەو دەرگــا و پەنجــەرانە چەند تۆقــێنەر بوون..!! خــەڵکی ئەم گەڕەکەش وان.. ئەوانەی گەڕەکی خاکەلێوە و بانەمەڕ و پووشپەڕ و خەرمانان و گــەلاوێژ و ڕەزبەر و گــەلاڕێزان و ســەرمــاوەرز و بەفــرانبــار و ڕێبــەندان و ڕەشەمەیش هەروان.. شەوانیش کاتێ سەری دەخاتە سەر رانی «فەرهاد» و لە بنمیــچــەکە رادەمــێنێت، ژوورەکەی لێ دەبێتە گۆڕێکی ناو گۆڕستانی قــەراغ شارێکی چۆڵکراو و وادەزانێت تەنها ئەمان بە زیندوویی ماون.. هەر بەجارێ زەندەقی دەچێت و ئەوەندەی نامــێنێت لە ترســا فــیــزاح بکات، بەڵام ددان بەخــۆیدا دەگــرێت و ناهــێڵــێت هیچ کــەسێ بە نهــێنیــەکــانی دڵی بزانێت.. مێردەکەی پەنجەکانی دەستی چەپی دەخاتە قژیەوە و جار جار ناوچەوان و ســەر کــوڵمــەکــانی بۆ دەشــێلێت.. بە پەنجــەکــانی دەســتی راســتی یاریی بە سەرگۆی مەمکەکانی دەکات و ئەم گوێی لە دەنگی هەناسەکانی دەبێت، کە نەغــمــەیەکی چەند بڵــێی ســەیری هەیە و لە ورشــەی ئەو کزەبایەی ئێــوارە درەنگەکانی مووسڵ دەچێت، کاتێ لەپڕ بەناو لقوپۆپی درەختە بەرزەکانی سەر ڕێگای یاریگاکــەدا تێــدەپەڕی و گــەڵاکــانی وەکــو گــوارەی گــوێچکەی ژنە قــەرەجــەکان لەژێر رۆشنایی گڵۆپە ســوورەکاندا دەلەراندەوە.. ئەوسا ئەم و «دلارام» لەسەر شۆستەی ئەو شەقامە کشوماتەدا سووک سووک هەنگاویان دەنا و بەرەو ژوورەکــەی خــۆیان دەگــەڕانەوە، کــە لە نهــۆمی دووەمی بەشی ناوخۆی ســەر ئەو گردە بەرزە بوو و شــەوان لە پەنجەرەکەیەوە بەردە سپی و ڕەشــەکانی خوارەوە وەکــو پەنگوین دەردەکەوتن.. بەڵام کــاتێ بەهار دەهات و گــیــای خــۆرسک بە باڵایاندا هەڵدەزنان، شــێــوەیان دەگــۆڕا و لە چەند ئینجــانەیەکی قــڵــپکراوەی ناو باخــە بێــخــاوەنەکــان دەچوون.. هــەر دەتوت لەشکری یەکێ لە سەرکردە کۆنەکانی مێژوو بەوێدا تێپەڕیوە و لەژێر قاچی

زۆر بەهێزی ولاّغەکاندا ئاوایان لێهاتووە.. دیقەتی لێ دەدان و لەگەڵیدا قسەی هەلەقومەلەقی دەکرد.. زۆر جار «دلارام» بێدار دەبووەوە و لێی توورە دەبوو.. تۆپەڵێ جنێوی پێدەدا و ریسوای دەکرد.. بەلاّم ئەم خۆی حەزی لەوە دەکرد و لەزەتێکی سەیری لێ دەبینی.. لەزەتێک، کە خاڵیی نەبوو لە رقێکی شاراوە و لە هەموو شتێ چاکتر دەیتوانی رابردووی بیربخاتەوە.. ئەو رۆژانەی ئەم تاقە پاڵەوانی ناو گۆرەپانەکە بوو و ئەو و «ئەنغام مەروان» دەیانویست بۆری بدەنەوە.. «ئەنغام» لەسەر شەقامی «تەمووزی تازە»دا گوللەی وێڵی بەرکەوت و گیانی دەرچوو.. بەلاّم «دلارام» مایەوە و رۆژ بە رۆژ زیاتر تەنگی پێ هەڵدەچنی.. لەپڕ هەستێکی سەیری لە دڵدا خوڵقا و سەری لێ دەرنەدەکرد.. پێی خۆش بوو بەردەوام خۆی بشکێنێت و هاوکات بە شان و باهووی ئەودا هەڵبدات.. دەستەخوشکەکانی تەریقیاندەکردەوە و قسەی ناشیرینیان پێ دەوت، لەبەرئەوەی هەمیشە مەرایی بۆ ئەو دەکرد و بە هەق و ناهەق بە شانوباهوویدا هەڵدەدا، بەلاّم وازی نەدەهێنا و زیاتر لەزەتی لە کەمبەهرەیی و تێکشکانی خۆی دەبینی.. رۆژ بە رۆژ زیاتر هۆگری دەبوو و حەزی لێدەکرد.. هەموو شتەکانی ئەوی بەلاوە جوان بوون و تا سەر ئێسقان سەرسامیان دەکرد.. قسەکانی، لەرەی دەنگی، هەنگاوەکانی، راکردنەکانی، قیژەکانی، تریقانەوەکانی، جنێوەکانی، جلەکانی، پێڵاوەکانی، گۆرەویەکانی، تۆقەکانی، ملوانکەکانی، گوارەکانی، هەر هەمووی لە هی کەسانی تر جیابوون و سەرەمێکوتەکانی ناخی ئەمیان دەورووژاند.. بەردەوام شتەکانی خۆی بۆ دەپێچایەوە و دەیکردن بە دیاریی.. دەچووە ژوورەکەی دایکی و لێزانانە پارەی ناو چەکمەجەکانی دەدزی.. لە بازارە گرانەکان بە دوای شتە دانسقە و دەگمەنەکاندا دەگەڕا و بۆی دەکڕی.. دواجار «دارا بارام»ی دەزگیرانی خۆی رازیی کرد واز لەم بهێنێت و لەگەڵ ئەودا پەیوەندیی ببەستێت، ئەگەرچی بەقەدەر هەموو دنیا یەکتریان خۆشدەویست و جوانترین یادگاریی هاوبەشیان هەبوو.. یەکێ بوو لە کورە هەرە قۆزەکانی ئەو شارە و رۆژگارێک بە دیار وێنەکەیەوە دیجلەیەک فرمێسکی رشتبوو.. پێشتریش بە پلانێکی نهێنیی سەیر لە «فەرەیدوون»ی دەزگیرانی جیای کردبووەوە و زەمینەی تەواوی بۆ ئەو

پەیوەندیە تازەیە خـۆشکردبوو.. بەجـارێ وازی لـە وەرزش هێنا و هـەمـیـشـە نکووڵـی لەوە دەکــرد، کــە ئـەم ڕۆژێ لە ڕۆژان یـاریکـەرێکـی زۆر چاک بـووە و سـەرنجی هەمـوو شـاری ڕاکـێشـاوە.. وەکـو هـەر بینـەرێکـی دیکـەی ئاسـایی لەودیو هێڵەکانەوە دەوەستا و چەپڵەی بۆ «دلارام» لێدەدا.. جار جار هـەلهەلەی بۆ دەکێشـا و بەسـاقـە و بە قـوربانـی دەبوو.. لە کـاتی پشـووەکـاندا بە خـاولی ئارەقی دەمـوچاو و لاملـی ئەوی دەسـڕی و بـە مـاچە یـەک لەسـەر یـەکـەکـانی تەڕیدەکـردنەوە.. کـالە و گـۆرەویەکـانی بۆ دادەکـەند و پاکـیـدەکردنـەوە.. بنی پێکانی دەخسـتە سەر ڕانەکانی خۆی و سووک سـووک قاچەکانی بۆ دەشـێلا.. دوای تەواوبوون جـانتـای جلەکانی بۆ هـەڵدەگرت و تا ناو مـاڵەوەی دەگـەیاند.. هـەمیـشـە ڕۆڵی کارەکـەری دەبینی و گوێی بە گاڵتـەپێکردنی هـاوڕێکانی نەدەدا، بگرە ئـەمـە هـەر خـۆی مـەبەسـتـێک بوو و دەبوایە زوو زوو پێی بگـات.. هـەسـتی دەکرد بەرادەیەک خـۆشـیـدەوێت و شـەیدای بووە، کـە بەبێ ئەو نائومـێدترە لەو تاقـە قـەشـە ڕەشـپـۆشـەی لە بەردەم کـەنیسـەی شـارە چۆڵکـراوەکـەی ئەودیوی ئاوێنـەی ژووری منداڵیی خـانـووە کـۆنەکـەیان وەسـتـابوو و قـیـبلەنـوومـایەکی گەورەی شکاوی بەدەستەوە گرتبوو.. تەنیاترە لەو ژنە سپـیپۆشە فەڵەستینیەی بە تەنەکـەی ژەنگاوی و پارچەی ئۆتۆمـۆبێلی سیکراب لەناو گـۆڕسـتـانی نێـوان هـەردوو گــەڕەکی «شـوبـاتی کـۆن» و «شــوبـاتی تـازە»دا کـووخــێکی پەڕپـووتی پێکـەوەنابوو و زۆربـەی کـات بە دەنگـی ئێـجگار خـۆشـی «نەوالیـانە»ی و بەدەم گـریانی زۆر بەکـوڵەوە گـۆرانیی دەچڕی.. بەبێ ئەو ئاسـمـان و زەوی جـووتێ کەوانەی زلن و ئەم لەنێـوانیـاندا وشـەیەکـی تاکی بێمـانایە.. بیـرکـردنەوە لەو پێـویسـتـیی بە شـوێنێکی لاچەپ و دوور لە خـەڵک هەبـوو و دەبووایە خـۆی لە چاوە زیتـەکـان بشـارێتـەوە، بۆیە زۆربـەی شـەوان لەو ژوورەی خـۆیدا پیاسـەی دەکـرد و بەدزییـەوە دەگـریا.. حـاڵەتێکی زۆر سـەیر بوو و نەدەکـرا لای کـەس باسـی بکات.. دایکی هـەر زوو زوو بەگیریدەهێنا و بە پرسـیارەکانی هـەراسانی دەکرد، بەڵام ددانـی بەخـۆیدا دەگرت و یەک وشـەی نەدەدرکاند.. هەڵواسـینی ئەو هـەموو وێنەیەی ئەو بە قـەدی کانتۆر و دیوارەکانەوە شتێکی ئاسایی نەبوو و شوێنەواری فرمێسکەکانیشـیان بەسـەرەوە دەبینرا.. لەوێ تەنـها بیـری لەوە

دەکردەوە بەیانی چۆن ببینێت و چی پێ بڵێت.. چی بۆ بکات و چۆن زیاتر لە خــۆی نزیک بکاتەوە.. وازی لە زۆربەی شــتــەکـانی هێنابوو و نەیدەپەرژا بەلایاندا بچێت.. ئەگەر جار جاریش کتێبەکانی دەگرت بە دەستەوە و بەزەحمەت چەند لاپەڕەیەکی لێ دەخوێندنەوە، ئەوە لەبەرئەوە بوو لەو دانەبڕێت و قۆناغ قۆناغ لەگەڵیدا بڕوات.. لەسەر کورسیەکەی تەنیشتی دابنیشێت و لێی دوورنەکەوێتەوە.. کاتێکیش ئەو لە «کۆلیژی پەروەردەی وەرزشی مووسڵ» وەرگیرا و ئەم لە هی «بەڕێوەبردن و ئابووریی بەغداد»، مانی گرت و نەیویست بچێت.. دایکی پارەیەکی زۆری دا و بۆی گــۆڕی.. لەوێش بە ملوانکەیەکی ئاڵتوون ژنی ئۆفیسی ماڵی قوتابیانی رازیی کرد و لەگەڵ کچێکی کۆیی ئاڵوگــۆڕی پێ کــردن.. ســاڵی چوارەم لەپڕ لێی هەڵگەڕایەوە و کــەوتەوە دژایەتیکردنی، بەڵام تواناکــانی لە دەست دابوو و بەربەرەکــانیی ئەوی پێ نەدەکرا.. ئەم جیاوازیەش هەستی بەزەیی بەرامبەر بە خۆی لە دڵدا دەخوڵقاند و دەیتوانی چاکتر لەزەت لە تێکشکانەکانی ببینێت.. ئەو ژوورەی بەجێهێشت و چوو بۆ لای «هیام حەمدان»ی «مێژوو»، کە بەتەنیا لە ژێرزەمینێکی «گەرەکی قادسیە»دا دەژیا و دیوارەکانی بە وێنەی منداڵی ساوا رازاندبووەوە.. پێشتر خــۆیشی نەیدەزانی بۆچی هەرچەند ســەردانی دەکــرد و قــاچی دەخــســتــە ئەمدیوی دەرگــاوە، کرمی کــۆمی بیــردەکــەوتەوە و ســەیری لێ دەهات، کــە بە منداڵیی پەرێشــانیــان کــردبوو و دایکی لەژێر رۆشنایی گڵــۆپە ســوورەکــەی هەیواندا بە پەڕۆیەکی نەرمی وەکــو ســەرتوێژی گــامــێش بۆی دەردەهێنان.. دەریدەهێنان و نارەزایی دەردەبڕی، چونکە قــێــزی لێ دەکــردنەوە و دڵی تێکهەڵدەهات.. بەڵام باوەپیارەکەی بەپێچەوانەوە هیچ پێی ناخــۆش نەبوو و شــەوان تا درەنگ بە دیاریەوە دادەنیــشت.. ئەم بە ســەعــات لە باوەشــیدا و لەســەر دەم مــتــەقی لە خــۆی دەبڕی و ئەویش ســووک ســووک بە پەنجەکانی خەریکی دەبوو.. ئەوسا دەیتوانی چاوەکانی بنووقێنێت و بیر لە جووتێ حاجی لەقلەقی سەر منارەی مــزگەوتێکی دوور دووری ناو تەمومــژە کەمێ چڕەکان بکاتەوە، کــە پووشی رەشی هێلانەکەیان لە شێوەی قــژی درێژ و پڕی دایکی دەردەکــەوتن و دەبریسکانەوە، کــاتێ لە حــەمــامــەکــە دەهاتە دەرێ و بە چەند

تۆقــەیەکی باریک لە ناوەڕاسـتی ســەریدا دەیبــەست.. ئای چەندێ تاڵ بوو دەرمانە رەشەکەی کرم و چۆن چاوەکانی لەگەڵیدا دەکەوتنە رەشکەوپێشکە، کـاتێ دایکی بە پەڕۆیەکی سـوور دەست و قـاچی دەبەست و بەزۆر دەیکرد بە دەمیەوە.. دیمەنی شتەکان لە بەربینایدا دەگۆڕان و بەشێوەی زۆر جیاواز دەردەکـەوتن.. مـافووری ژوورەکـە دەبوو بە دەشـتێکی پانوپۆڕ و نەخـشــە درشـتــەکـانی ســەری، کــە گـوێچکەمــاسـیی رەش بـوون و خـرابوونە ناو چوارچێوەی سوورەوە؛ وەکو بەردی زل زل خـۆیان دەنواند و موچورکیان بە ســەرتاپای گـیـانیـدا دەهێنا.. ئاسکە سـپیــە زارەترەکـەکـان لەســەریان هەڵتـرووشکابوون و بە زمـان گـیـانی لووسی یەکـتریان دەلستــەوە.. بەڵام کاتژمێرە لاکێشەییەکەی قەد دیواری رێک وەکو سەری خوێناویی «نەجوا سـالم»ی دکـتـۆری هەرە بەناوبانگی منداڵان دەبینی و لێی ورددەبووەوە، کـە بەیانییەکیان لەپڕ لاشەکەی لە بەردەرگا زەبەلاحەکەی پۆستەخانەدا کەوتبووە بەرچاو و بووڕابووەوە.. خــۆیشی نەیدەزانی بۆچی هەر کــاتێ دایکی بە شامپۆی سەوزی ناو قوتووە زەردەکە بیشتایە و بۆنە تیژەکەی بچووایە بە قووڵایی لووتیدا، «دکتۆر نەجوا»ی بیردەکەوتەوە و لەزەتێکی سەیری دەبینی، هەر بۆیە زوو زوو دەچووە ئەو حــەمــامــە و بووکـەشــووشـەکـانی خۆی بەو شـامـپۆیە دەشت.. دایکی بە سۆندە تێیدەکەوت و کۆمـەڵێ هێڵی سـوور و ســــوورتری لەســــەر پشت و ســـمت و رانەکــانی دەکــێــشــا و تا دوو رۆژ شوێنەواریان کاڵنەدەبووەوە، چونکە هەر پێی دەکرا شامپۆ بکڕێت و پارە و پوولی بە دەستەوە نەمابوو.. بەڵام ئەوەندەی دەزانی، کە ئەو هەر جارێ لەسەر تەختی لاکێشەییی ژووری عیادەکەی پاڵیدەخست و گیانی فـەحسدەکرد، سەری تاڵەکانی قژە زەردەکەی دەکەوتنە سەر دەموچاوی و ختووکەیان دەدا.. کاتێکیش تەنێکی درێژکۆڵەی دەکرد بە دەمیدا و بۆ ساتێ دەیخستە نێوان دوو ئاڵووەکـەی قـوڕگی، هەسـتی بە تاڵیــیـەکی ســەیر دەکــرد و ناخی لەگـەڵ دەهەژایەوە.. ئەمــەش بەس بوو تا چاوی بکەوێتــە رەشکەوپێـشکە و دیمەنی شتەکان تەواو لە بەربینایدا بگۆڕێن.. ئیتر هەر مێرووولەی سوور سووری باڵدار بوون هەڵدەفڕین و لەو ئاسمانە تێکدەقژقژان.. بەمەدا دەیزانی تاکەی

زۆر گـــەرمـــە و بەقـــەدەر ژمـــارەی پەنجـــەكـــانـی دەست و قـــاچـی دەرزیـی بۆ دەنووسـێت.. برینپێچـی ژێرزەمینەكە یەكەمـیانی لێدەدا و «سسـتەر فـەوزیە»ی دراوسـێشـیان ئەوانـی دیكە.. شـەوێكی تەرزەبـاران لەژێر لێفـە گولگولیەكەیەوە خـەونی بەو ژێرزەمـینەوە بینیبوو و دواتر هـەمیشـە حـەزی دەكرد بەبیر خـۆی بێنێتەوە، كە چۆن تاریكایی لە ژووری برینپێچەكەوە دەهاتە دەرێ و وردە وردە بەوێدا بلاودەبووەوە.. سـەرەتا كـال كـال لە شـێوەی جامـانـە و دوایی تۆخ تۆخ وەكو پەڕی مـراویە مردووەكانی قـەراغ گۆمی وشكبووی پشت كەنیسـەی شارە چۆلكراوەكە.. ئەم لەسـەر یەكێ لە پلەكانی قادرمـەكە دانیشـتبوو و حـەیران و سـەراسـیمـە لەو دوو گامـێشـە سپیـەی دەڕوانـی، كە بە شـاخـە رەقـەكـانیـان كـەوتبـوونـە وێزەی جامـخـانەی ئەو كـۆگـایـانەی بەرامـبـەری و دەنگی شكانی شـووشـەكـانی وەكـو هـی دەنكەتەرزە گـەورەكـانی سـەرەتای بـەهـاری رابردوو دەبیست، كـاتێ بەر جـەمـەلۆنی سـەر چێـورمـەی گۆڕی بـاوكی و ئەوانـی دیكەی ناو گـۆڕسـتـانی نێـوان «تەمـووزی كـۆن» و «تەمـووزی تازە»دا دەكـەوتن و ئەم لە ترسـا توند تـوند باوەشـی كـردبوو بە یەكێ لە كـێلە تەزیوەكـاندا.. شـووشــەی بـۆیەی نینـۆك و هـی گـــولاو دەشكان و پارچـە ورد وردەكـــانیـــان بەو نـاوەدا بلاودەبوونـەوە.. درەنگ درەنگ لە سـووچی ئەوسـەری ژێرزەمـینەكـەدا دایكی بینی و دلی داچلـەكی، كە بە جـووتێ گـوارەی وەكو گـولی نێرگزەوە لە باوەشی برینپێچـەكە دانیشـتبوو و قژە تەڕەكەی لـەملا و لەولاوە هێنابووە سـەر سنگی رووتی.. ئەو پەردەی ژووری نووسـتنی ئەمـانی كـردبووە بەروانكە و لەبەر خـۆی هـەلكێشـابوو، كە بە وێنەی حـاجی لەقلەقی زل زل رازابووەوە و مـاری سـووری درێژیان بە دەنـووك گـرتبـوو.. قـاچیـان تا قـولاپەپێ خـسـتبـووە جـۆگـەلەكـەی بەردەمـیـان و وەكـو منـدال دەیانكرد بە شـلـپـوهـوور، كـە ئـاوێكـی سـووری پیـادا دەڕۆیشت و سـەرەمـێكوتـە شـیـرییـەكـان تیـایدا مـەلەیـان دەكرد.. كـاتێكیش بێـداربووەوە و بـەحـال چـاوەكـانی لەناو ژووره كـەمێ تـاریكەكـەدا هـەلـهـێنا، هەستی بە قـورگیەشـەیەكی سـەیر كرد و تایەكی چەند بلێی گەرمی لێهاتبوو.. دەسـتی بۆ چمكی پەردەكە برد و خـستیـە نێوان ددانەكانی.. دەیویست ونجڕ ونجڕی بكات و كولی ئەو دلەی خـۆی پێ دامـركێنێتەوە.. دایكی لە تەنیشـتی

نووستبوو و هەناسە یەک لەسەر یەکەکانی وەکو دەنگی کردنەوە و داخستنی زنجیری جانتای کتێبەکانی خۆی دەبیست.. دەیبیست و ناو سەری ژاوەژاوی تێدەکەوت.. قژە ڕەشەکەی، کە لەسەر سەرینە سپیەکەدا بڵاوبووبووەوە و لەژێر تیشکی گڵۆپە سوورە کزەکەی سەر سەریاندا دەدرەوشایەوە، بۆنی گوڵاوی رژاوی سەر کاشیەکانی ژێرزەمینەکەی لێدەهات و ئەم قێزی لێی دەهاتەوە.. ئەو شەوە لە ئەنجامی بیرکردنەوەی زۆر و تلانەوەی لەرادەبەدەری ناو جێگادا، بۆی دەرکەوت لەناو هەر جەستەیەکدا دوو گیانی تەواو جیاواز هەن و هەرگیز بەیەکەوە هەڵناکەن.. ئەمیان ساغ و پڕ لە ئاسوودەیی.. ئەویان نەخۆش و پڕ لە ئازار.. کاتێ تەنها بیر لە خۆمان دەکەینەوە و ئەوانی تر بەلاوە دەنێین، گیانە ساغەکەمان دەردەکەوێت و دڵمان پڕدەبێت لە خۆشەویستیی، بەڵام کاتێ تەنها بیر لەوان دەکەینەوە و خۆمان بەلاوە دەنێین، گیانە نەخۆشەکەمان دەردەکەوێت و رق و کینە تەنگمان پێ هەڵدەچنن.. ئەمە لۆژیکێ بوو و تا ئاستی وردەچەوەکانی ناخی ناخی چووبووە خوارێ.. لێی جیانەدەبووەوە و هەنگاو هەنگاو لەگەڵیدا رێی دەکرد.. بە قووڵاییی ساڵەکانی تەمەنیدا رۆدەچوو و زوو زوو بەئاگای دەهێنایەوە.. بەڵام بیرکردنەوە لەوان و فەرامۆشکردنی خود، بێجگە لە نەخۆشیی و تلانەوە، دنیایەک توانای تازەشی پێ دەبەخشی و بەو شوێنە نەناسراوانەی ئەودیوی خەیاڵی دەگەیاند، کە مەحاڵ بوو لە کاتی ساغی و ئاسوودەییدا پێی بگەیشتایە و ئەو هەموو نهێنییەی بۆ بدۆزرایەتەوە.. هەر بۆیە دوای هەموو کەوتنێک بە کۆمەڵێ هەڵسوکەوتی نائاسایی تازەوە هەڵدەستایەوە و لەزەتەکانی دەیانتوانی لە رووبەرێکی فرەوانتردا چالاکیی بنوێنن.. جار لە دوای جاریش زیاتر باوەڕی دەهێنا و چاکتر لە دڵیدا دەچەسپی، کە گەیشتن بەوێ ــ بە گیانە نەخۆشەکە ــ کارێکی خۆکردە و گیانە ساغەکە بەتەنها بەشی بەڕێوەچوون ناکات.. لەوێدا دەیتوانی پلانی سەرچڵانە دابڕێژێت و بەچاکییش جێبەجێیان بکات.. لە کاتی گیانە ساغەکەیدا هەموو هەوڵێک، چ زەحمەت، چ ئاسان سەرکەوتوو نەدەبوون و بە ئەنجامێکی خراپ دەگەیشتن.. یان بە نیوەچڵیی تەواو دەبوون و داخ و حەسرەتیان لە دڵیدا بەجێدەهێشت.. تاقە کارێک لە کاتی گیانە

نەخـۆشـەکـەیدا کـردی و تیـایدا سـەرکـەوتوو نەبوو، کـوشـتنی «عـادیل»ی باوەپیارەی بوو و هەمیشە پێوەی دەتلایەوە.. هەر باشیش بوو براکەی لەژێر دەستیدا دەربازبوو و بە دەردی باوکی نەچوو، ئەگینا ئەم ئەوەندەی دی لەناو گێژەنی کاتەکاندا سەرگەردان دەبوو و بیرەوەرییەکان لەوە خراپتر تەنگیان پێی هەڵدەچنی.. راستە دەست و پێی کرایەوە و دەیتوانی وەکو جاران لە حەوشەی قوتابخانە و یاریگاکانی شاردا خەریکی مەشقەکانی بێت، بەڵام هەندێ هەستی تر وەکو سەوزەگیای بەهارانی سەر گۆڕەکان لە دڵیدا سەریان دەرهێنا و رۆژ بە رۆژیش لە نەشونوماکردندا بوون، کە لەمەوپێش هەرگیز بەخۆیەوەی نەدیبوون و تەواو پەرێشانیان کردبوو.. ئەوەندە هەبوو ئەو بۆنەیە بووە هۆی ئاشتبوونەوەیان لەگەڵ ماڵی «فایزە» و هامشۆی گەرم دەستی پێکردەوە.. چونکە خانووەکەی ئەمانیش گەورەتربوو و بەچاکی جێگای هەموویانی تیا دەبووەوە، زیاتر ئەوان دەهاتن و زۆر کەم بۆ ماڵی خۆیان دەچوونەوە.. ئەو قەرەباڵغییە تا رادەیەک بۆ ئەم باش بوو و کەمێ دۆخی پەرێشانی ناخی دەگۆڕی.. لە تەنهاییدا «ئێستا»ی لێ وندەبوو و لە «رابردوو» و «داهاتوو»دا بەترسەوە رۆژەکانی تەمەنی خۆی دەبژارد.. ئەوسا باوەڕی دەهێنا و تەواو لە دڵیدا دەچەسپی، کە بکوژ کەسێکە «ئێستا»ی خۆی لە دەست داوە و زەحمەتە بیدۆزێتەوە.. بەڵێ، ئەم بکوژێک بوو وەکو هەموو بکوژەکانی ناو میتۆلۆژیا و هەقایەتەکانی سەردەمی منداڵیی و لە روانینیدا مردن لە ناوێکەوە گۆڕا بوو بۆ هێمایەک.. بۆئەوەی «ئێستا»یەکی بخوڵقاندایە و تێیدا بژیایە، پێویستی بە کۆمەڵێ تەکنیک بوو و دەبووایە پەنایان بۆ بەرێت.. قێزکردنەوە هەستێک بوو لەو هەستانەی، کە هەر لە منداڵییەوە هەنگاو هەنگاو لەگەڵی هاتبوو و لێی جیانەدەبووەوە؛ دەیتوانی بۆ ساتێک لە «ئێستا»دا رایبگرێت و نەهێڵێت خەیاڵە جەنجاڵەکانی بەملا و بەولایدا بەرن.. ئیتر کەمێ هێمن دەبووەوە و هەندێ هێزی دەهاتەوە بەر.. شەوان وەکو منداڵ لە باوەشی «دادە نایلە»ی دایکی «فایزە»دا دەنووست و توند توند دەستی دەکردە ملیەوە، چونکە ئەو پێستی تووشی نەخۆشییەکی سەیر بووبوو و پەڵەی ناشیرین و پیس پیسی لەسەر دەرکەوتبوو.. رەقهەڵگەڕابوو و لە

بزنمژێکی هەڵپرووکاوی بەر تیشکی خۆری زۆر بەتینی تەمووزی بیابانەکان دەچوو.. یەکێ بوو لە کچە زۆر جوان و دڵتەڕەکانی سەردەمی خۆی و ئەمە لە وێنەکانیدا بەچاکی دیارە.. دەنگێکی خۆشی هەبوو و وەکو کۆرس بەشداریی لە زۆربەی گۆرانیبێژە ناسراوەکاندا کردووە.. مێردەکەی لە فەڵەستین لە شەری نێوان عەرەب و جوولەکەدا کوژرابوو و بە دیار منداڵەکانیەوە دانیشتبوو.. فەرمانبەرێکی بچووکی رادیۆ بوو و مانگانەیەکی کەمی وەردەگرت.. دوای دەوام لە سالۆنێکدا خەریکی دەلاکیی بوو و ئارایشتی بۆ ژنان دەکرد.. بووکەکانی دەرازاندەوە و هەندێ پارەشی لەوێ دەستدەکەوت.. شارەزاییەکی سەیری لە پیشەکەیدا هەبوو و هونەرمەندانە سیماکانی دەگۆڕی.. «فایزە»ی کچیشی دوای قوتابخانە بەردەستیی دەکرد و وردە وردە لێیەوە فێر دەبوو.. پێگەیشت و جێگای ئەوی گرتەوە.. لە ماڵەوە دانیشت و ویستی پشووێ بدات، کەچی تووشی ئەو نەخۆشیە بوو و بە ماکیاجی هەموو دنیا پەڵەکانی سەر پێستی نەدەشاردرانەوە.. شێوەی تەواو گۆڕابوو و کەس قێزی نەدەهات سەیری بکات.. نوێن و قاپ و کەوچکەکانیان بۆ جیاکردبووەوە و ئەوان لێی نزیک نەدەبوونەوە.. «سـامـاڵ» دەیبـردە حـەمـامـەکـە و رووتیدەکردەوە.. جوان جوان دەیشت و بە خاولی وشکیدەکردەوە.. جلەکانی لەبەردەکرد و قژی بۆ دادەهێنا.. چێشتەکانی لە بەردەمی دادەنا و وەکو منداڵ دەیکرد بە دەمیەوە.. گوێی بەو هەموو دومەڵ و کێمەی لامل و سەر شانەکانی نەدەدا و چاوەکانی لێیان نەدەنووقاند، بگرە ئەمە هەر خۆی مەبەستێک بوو و دەبوایە پێی بگەیشتایە.. هەستی دەکرد زۆر گۆڕاوە و هەر دەڵێی ئەو کچەی جاران نییە، کە قێزی لە هەموو شتێ دەهاتەوە و بەپارێزەوە دەچووە ماڵی هاورێ زۆر نزیکەکانیشی.. خواردنی دەستی کەم کەسی دەخوارد و هەر زوو زوو پارووەکانی ناو دەمی تفدەکردنەوە.. دڵی بەشێوەیەکی سەیر تێکهەڵدەهات و دەرشایەوە.. گیانی دادەهێزرا و مردنی بە چاوی خۆی دەدی.. دایکی دەیان دکتۆری شارەزای پێ کردبوو و چارەسەریان بۆ نەدۆزرابووەوە.. خۆیشی تا بڵێی بەم حاڵەتە سەغڵەت دەبوو و لە بەرچاوی ئەم و ئەودا تەریقدەبووەوە.. نەیدەزانی رۆژێک لە رۆژان ئاوا بەکەڵکی دێت و لەنێوان «رابردوو»ی لێوانلێو

لە گوناهـ و «داهاتوو»ی پڕ لە مەترسییدا شوێنێکی نیمچە ئارامی بۆ فەراهەم دەکات.. بەبێ ئەوەی کەسیش لێی تێبگات و پەی بە نهێنییەکانی ناخی بەرن.. «دادە نایلە»شی بە لاڕێدا بردبوو و وەکو فریشتەی راستەقینە سەرنجی لێی دەدا.. ئەو هەمیشە دەگریا و پێی دەوت:

ــ قوربانی ئەو دڵە پڕ لە سۆز و خۆشەویستیەت بم ساماڵەکەی رۆحم.. تۆ تاقە کەسیت بە تەنگمەوە دێیت و وەکو ئەوانی تر پشتم تێ ناکەیت.. بەڵام تکایە وازم لێبێنە و با بمرم، تووخوا با بمخەنە ژێر گڵەوە و چیتر بەم چاوانەم ئەم دنیا زاڵمە نەبینم.. ئاخر من ئەوە ناهێنم تۆیەکی جوان و میهرەبان بەخۆمەوە ماندوو کەم.. بڕۆ بە لای ئیشەکانتەوە و من وا لێرە، لە کونجی ئەم ژوورە چاوەڕێی مەرگی خۆم دەکەم.

بەڕۆژیش لەسەر شێوازی «نیتشە» جەستەی خۆی ماندوو دەکرد و تا دەیتوانی ئازاری دەدا، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو بۆ وەستاندنی بیرە پچڕپچڕ و ترسناکەکانی ناو سەر و خۆلێدزینەوەیان، نەک بۆ دەربازکردنیان لە تێکقژقژان و ئەنجام بەتێکستکردنیان.. وەرزش بۆ ئەم لەوە دەرچووبوو وەکو جاران حەزێک بێت و رێگایەکی دی بۆ دەربڕینێکی بێدەنگی رۆح، بەڵکو پێداگرتنبوو لەسەر بوونی «ئێستا» و گەمارۆدانی خەیاڵە سەرکێشەکان تێیدا.. تەریقبوونەوەش هەستێکی تر بوو و لە قێزکردنەوە چاکتر کاری خۆی دەکرد.. هەر بۆیە لای دۆست بوایە یان بێگانە قسەی هەلەقومەلەقی دەردەپەڕاند و زوو زوو رووشکێنیان دەکرد.. ئیتر ناخی دەورووژا و نەیدەتوانی بیر لە هیچی تر بکاتەوە.. تەواو سەغڵەت دەبوو و تک تک ئارەقی لێ دەچۆڕایەوە.. لەتاوا بەبێ ویست هەڵسوکەوتی بێمانای دەکرد و لەسەر شەقامە گشتییەکان قایم قایم پەنجەی دۆشاومژەی ئەم دەست و ئەو دەستی خۆی دەکرۆشت.. ئەمە «ئێستا»یەک بوو و نەدەکرا لەوە ئاسوودەتر تیایدا بژی.. بەبەراورد لەگەڵ «رابردوو» و «داهاتوو»شدا سەیرانی ئێوارانی قەراغ رووبارێکی دڵڕفێنی وەرزی بەهار بوو و حەزی نەدەکرد بەجێیبهێڵێت.. لە ماوەیەکی کەمدا دڵی دۆستە هەرە نزیکەکانی رەنجاند و لێی جیابوونەوە، چونکە بەشێوەی زۆر ناخۆش تەریقیدەکردنەوە و لە ناخەوە تێکیدەشکاندن..

ئەمـەش هـەر بۆئەوەی هاوکـات خـۆیشی هـەمـان هەسـتی لەلادا بخـوڵقـێت و پێوەی بتلێتـەوە.. «ئاسیا جاسم ئەلنوری»ی کەمانجـەژەنی بە خوشکی گەورەی دەزانی و رێزی دنیای لێ دەگرت.. ئەو جارێکیان بردبوویەوە بۆ ماڵی خۆیان و بەشـانـازییـەوە بە کـەسـوکـارەکـەی ناسـاندبوو.. «جـاسم ئەلنـوری»ی باوکی ئەفسـەرێکی فرۆکەوان بوو و چەند سـاڵێ لـەمـەوبەر لێیـانخسـتـبوو، چونکە نەیویستبوو لە دامرکاندنەوەی یەکێ لە شۆڕشـەکانی رزگاریی نیشتیمانییدا بەشـــداربێت.. ئـەو زۆر حـــەزی لە وەرزش دەکــرد و هـەمــیــشـــە هەواڵەکـــانی وەرزشیی لە گۆڤـار و رۆژنامەکاندا دەخوێندەوە، بۆیە پێشتر ئەمی بینیبوو و خـۆشـیـدەویست.. کـردیە باوەشـیـەوە و بەتوندیی سـەری نووسـاند بە سنگی خۆیەوە.. «ئاسیا» وێنەیەکی گەورەی ئەمی لە چوارچێوەیەکی جوان گرتبوو و لەسـەر مێزێکی فۆرمیکای سووچی ئەوسـەری ژوورەکەی دانابوو.. دەسـتی خستە سەر شانی و پێی وت:

ــ سـەیریکە.. ئەوە لە گـۆڤـارێکدا بڵاوکـرابووەوە.. من لێم کـردەوە و لەم چوارچێوەیەم گرت.

ئینجا وەکو منداڵ لە باوەشی خۆی گرت و بەشێوەیەکی چەند بڵێی خۆش پێی وت:

ــ کـچێ مـەیموون زۆر خـۆشـمـدەوێی زۆر..!! بـەس پێم بڵێ ئەو رۆحـە سووکەتت لە کوێ هێناوە..؟!

کەچی ئەو جارە ئەم دوای یاریی لەسەر کورسییەکی یاریگاکە دانیشتبوو و قـەیتانی کالە تازەکانی دەبەست، بۆئەوەی وەکو زۆر ئێوارەی دیکە قۆڵ بکات بە قۆڵی «ئالاء» و «وەلاء»ی خوشکی و سـووک سـووک لەژێر درەختـەکانی سـەر ئەو شـەقامـە بەرەو مـاڵ ببێتـەوە، ئەو هـات و لەدواوە دەسـتـەکانی خسـتە سـەر ئەم چاو و ئەو چاوی.. دەنگی خۆی گۆڕیبوو و پێی دەوت:

ــ دەی هەڵیبێنە، بزانە من کێم..!!

ناسیـەوە و پڕ بەدڵ حەزی دەکرد وەکو منداڵ بچێتە باوەشیـەوە.. سـەری بخاتە سـەر سنگی و دەیان ماچی ئەو روومەتە پەمـەیـیانەی بکات، کە هەر لە رەنگی پەشمەکی ناو فلینی کوڕە دەستفرۆشـەکانی ناو ئەو یاریگایە دەچن و

وردە دەمـارەکـانیـان وەکـو هـی مـاسـیـی جـوانیی نـاو حـەوزە رازێنـراوەکـان دەردەکەون، بـەڵام واینەکرد و خـۆی راپسکاند.. بەرِقـەوە سـەیرێکی کـرد و لە بەرچاوی ئەو هەموو خەڵکە بە لچهەڵقورتاندنێکەوە پێی وت:

ــ چی هەڵبێنم..؟! ئەوە کەی کاتی ئەو گاڵتە بێتامەیە تۆش..!!

رووی لێ وەرگێرِا و بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین لاسایی کردەوە:

ــ دەی هەڵیبێنە، بزانە من کێم..!!

«ئاسـیا» دەسـتـەخـوشـکێکیشـی لەگەڵ خـۆی هێنـابوو و ویسـتـبـووی پێی بناسێنێت.. ئەو ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و بە سەرزەنشتەوە پێی وت:

ــ ئا ئەمـە ئەو کچە بوو، کە بە هەق و ناهەق باسیت دەکرد و لای ئەم و ئەو پێتدا هەڵدەدا..؟!

بەڵام ئەوسا «ئاسیا» وەکو پەیکەر جووڵەی نەدەکرد و لە ناخی خۆی زیاتر نەیدەتوانی بیـر لە هیـچی دیکە بکاتەوە، کـە جـامی سـاف و چوارچێـوەی مەرمەرِی «مانا»کانی تێدا دەشکان و لە قووڵاییدا خـوێنێکی گەرمی خەست بۆ سـەرەوە فوارەی دەکرد.. تا ئاستی قورِگی دەهات و زمانی لە گۆ دەخست.. ئەمـەیە کاری تەریقبوونەوە و ئەم لە هەمـوو کەسێ چاکتـر لێی تێدەگات.. لای روونبـوو وا وەکـو قـازێکی پێکراوی خـەڵتـانی خـوێن لـەسـەر «ئێـسـتـا»دا پەلەقـــاژەیەتی و لەتاوی بـەئەبـەدیبـــوونـی ئەو ســـاتـە تـاڵانەوە دەناڵێنێت.. خـوشکەکـانی لێی رِادەمـان و ئـاخـیـان هەڵدەکێـشـا.. دەشـیـزانی لە مـاڵەوە سەرزەنشتـی دەکەن و تا درەنگ لێی نابرِنەوە، بەڵام گوێی نەدانێ و جانتاکەی کـردە شـانی.. دەیویست چی زووترە بەجـێـیـانبـهـێڵـێت و بەتەنیـا لەگـەڵ ئەو سـاتانـەدا بژی، کـە بـەشـێـوەیەکی سـەیر نـاخی دەورووژێـنن و خـۆشی و ناخـۆشـیـان بـەجارێ لێ دەبینێت.. شـەو تا درەنگ بەدەم هاتوچۆ لەمسـەر بۆ ئەوسـەری ژوورەکـەیەوە بیریان لـێ دەکاتەوە و تێیـاندا رۆدەچێت.. کاتێکیش راکـەراک تەواو گـیـانی شـەکـەت دەکـات و دیمەنی شـتـەکـان لە بـەرچاوە مـاندووەکانی دەگـۆرِێن، بەحـاڵەحـاڵ خـۆی دەگـەیەنێتـە ئەودیو و لە تەنیـشت «دادە نایلە»دا رادەکـشـێت.. چوار دیوار و بنمـیـچـێک و زەویی ژوورێکی لاکێشـەیی دوو کەسی تەواو «پێچەوانە؟؟»یان لـە خـۆیان گرتووە و ئەم دەبێت

بەدوای مـــانای دەرگـــا و کـــێلۆن و کلیل و پـەنجـــەرە و جـــامی پـەنجـــەرە و پارچەکـانی تریدا بگەڕێت.. بەڵام «دادە نایلە» خـۆی زۆر بە لێکدانـەوەی ئەو شتانەوە خـەریک ناکات و شـەوان بێخـەم لێی دەنوێت.. هـەناسـە یەک لەسـەر یەکەکانی، کە لە سیە ماندووەکانیەوە بەرێدەکەون و بەزەحمەت لەنێوان لێوە وشکهەڵاتووەکانیدا دەردەچن، دەنگێکی سـەیریان لێ بەرزدەبێتـەوە و رێک لە داگیرسـانی چەرخی مووبەقـەکـەیان دەچێت، کـە لە شـێوەی حـاجی لـەقلەق درووستکراوە و لەگەڵ پاڵنـانی دوگمە بچکۆلەکەی سەر سـەری گڕێکی سووری باریک لەنێوان دەنووکە سـپیـەکانی دێتە دەرێ.. پک کپ پک کپ خـۆیان بە کونی گوێچکەکانیدا دەکەن و گڕ لە پوش و پەڵاشی ناخی بەردەدەن.. پشتی تێدەکات و لە پەنجەرەکە دەڕوانێت.. گـوڵە فستقـیەکانی سـەر پەردە شینە کـاڵەکـە لەژێر تیـشکی رووناکیی گڵـۆپە سـوورە کـزەکـەدا وەکـو چەند پەڵە هەورێکی بچکۆلە دەردەکەون، کـە هـەر دەڵێی لە لمی بیابان پێکهاتوون و تەواو سیمای ژوورەکە دەگۆڕن.. بیر لەو شتە بێسەروبەرانە دەکاتەوە و لەناو خەیاڵە تێکشێواوەکانیدا تاوتوێیان دەکات، کە بە ئەقڵی هیچ کەسێکی دیکەدا نایەن و بەدزیی نۆرمی گرامـاتیک و لۆژیکەکـانەوە کـاتیـان لەگـەڵدا بەسـەر دەبات.. دەیەوێت لەناو تارمایی بێمـانایی شـتەکاندا شـوێنێکی ئارام بۆ خۆی دابین بکات و هیچ پەیوەندییەکی بە دەوروبەرەکەیەوە نەمێنێت.. ئەمـەش پێویستیی بە داهێنانی کۆمـەڵێ پیت و دەنگی تازەیە و دەبێت زمـانێکی دیکەی تایبـەت بە خۆیانی لێ بخوڵقێنێت.. بۆ بەیانیەکەشی کاردەکەنە سەر هەڵسوکەوتەکانی و وەکو کـەسێکی تەواو جیـاواز دەکەوێتـە بەر بینایی ئەم و ئەو.. «دادە نایلە» لەتەنیـشتـیدا گـیانـی دەرچوو بوو و تا درەنگ پێی نەزانی.. شـەو داوای لەم کـردبوو کـاسێتی هـەمـوو ئەو گـۆرانیـانەی بۆ بێنێت و لە ژوورەکە گـوێیان لێ بگرێت، کە خۆی لە وەختی کچێنییدا وەکو کۆرس بەشداریی تێدا کردوون و لەسەر قەوان تۆمارکراون.. ئەم دەبووایە بچێتە لای «دارا بارام»ی کۆنە دەنکی و یەک بە یەک لە تۆمـارگاکەی ئەودا هەڵیـانبـژێرێت.. دوای ئەوەی وازیـشـیـان لەیـەکـتـر هێنابـوو و پەیوەندیـەکـەیان هەڵوەشـانـدبووەوە، ئەم جـار جـار هـەر سـەردانی دەکـرد و چەند کـەڕەتێکیش لە باخی «مـایس» و لـە مـاڵـەکـەیاندا

یەکتریان بینیبوو.. پێی خۆشبوو ئەو نهێنیەکانی خۆی و «دلارام»ی دەنکی بۆ بدرکێنێت.. چۆن دەیبینێت و باسی چی دەکەن.. چۆن ڕایدەمووسێت و چۆن دەیگوشێت بەخۆیەوە.. لەزەتێکی سەیری لەوەدا دەبینی و دواتریش پێی دەتلایەوە.. سەرەتا «دارا» رازیی نەبوو و دەستی بە روویەوە نا، بگرە لێی تووڕە بوو و دەنگی لەسەر بەرزکردەوە.. دوایی ملی بۆ دا و ورد ورد هەمووی بە تەمسیل بۆ دەگێڕایەوە.. پێشتر هەموو ئەو شتانەیشی لەگەڵ ئەمدا کردبوو و شوێنە نووستووە دوور دوورەکانی ئەمپەڕ و ئەوپەڕی گیانی بەئاگاهێنابووەوە، بەڵام هەرگیز بەم رادەیە لەزەتی نەبینیبوو و ئاوا تەزووەکان بە ناخی ناخی دڵیدا رۆنەچووبوون.. هونەرێک بوو تایبەت بە خۆی و تێیدا قاڵبووبووەوە.. هونەری چێژوەرگرتن لە چێژی کەسانی دیکە.. دەبوو بە بیرۆکە و لەگەڵیدا گەورە دەبوو.. لە دووتوێی خەیاڵەکانیدا پەروەردەی دەکرد و پەرەی پێ دەدا.. هەر ئەم هەستەش بەردەوام توانای دیکەی پێ دەبەخشی و دەیتوانی لە جووڵە و هەڵسوکەوتەکان تێبگات.. لێزانانە بە ناخەکاندا ڕۆبچێت و لێکدانەوەی ڕاست و درووستیان بۆ بکات.. ئەنجام بە نهێنی پەلاماریان بدات و دەستیان بەسەردا بگرێت.. تەنها بەو هەڵسوکەوتانەی ئەو «دارا»یەی خستبووە ژێر دەستی خۆیەوە و بە ئارەزووی دڵی هەڵیدەسووڕاند.. لە کورێکی زۆر هێمنەوە گۆڕیبووی بۆ کەسێکی تووڕەی دەستوەشێن و «دلارام»ی کوشتبوو.. دوای ئەوەی بوون بە ژن و مێرد و لە ماڵێکدا دەژیان، خراپتر ئەشکەنجەی دەدا و ڕێگای هەموو شتێکی لێ دەگرت.. دەیان جار لە بەرچاوی ئەمدا خستبوویە ژێر لەقە و گیانی خەڵتانی خوێن کردبوو.. ئەو ئێوارەیە «دلارام» گەیشتە تینی و پێی وت:

ــ تۆ هەرچەند ساماڵ دەبینی، دەگۆڕێی بۆ کەسێکی دیکە، خۆزگە لەوە تێدەگەیشتم و دەمزانی چ مەبەستێکت هەیە.

کاتێکیش لە بەربەلووعەی دەستشۆری قەد دیواری حەمامەکە دەموچاوی شت و هاتەوە، ڕووی کردە «ساماڵ» و پێی وت:

ــ پێت ناخۆش نەبێ، من هیچ ئەو پەیوەندیە بە چاک نازانم، بۆیە تکایە با کۆتاییی پێ بهێنین.

ئەم بە سووکی، بەڵام بەبێ ئەوەی خۆی وا نیشان بدات هەستی بریندار بووە و لە ناخەوە پێی دەتلێتەوە، جانتاکەی کردە شانیەوە و بەجێیهێشتن.. لەمەوە نەیدەبینین و نەشیدەویست بیریان لێ بکاتەوە، کەچی ئەو کاتەی «ئالاء» و «وەلاء»ی خوشکی گیران و ئەوان لە ڕێگەی «سەرمەد»ی برایەوە زانیبوویان، هاتن بۆ لای و پەژارەی خۆیان بۆ ئەو کارەساتە دەربڕی، بەڵام ئەم زۆر ڕووی نەدانێ و بە چاکییش وەڵامی پرسیارەکانی نەدەدانەوە.. تەنانەت «دلارام» لە باوەشی گرت و پێی وت:

ــ ئارامت هەبێ دڵەکەم، بە خەم و خەفەت هیچ شتێک پێک نایەت، دڵنیابە ئێمەش هەرچیمان لە دەست بێت، دریغی ناکەین.

ئەم هێشتا شتێکی لە سیمای مۆنی نەگۆڕی و بایەخی بە قسەکانی نەدا.. ماوەیەکی کەم دوای ئەوەش شووی بە «فەرەیدوون»ی کۆنەدەنکی «دلارام» کرد و بۆ هەولێر گوێزرایانەوە.. ئیتر بە تەواوی لێیان دوورکەوتەوە و نەشیدەویست هیچیان لە بارەیەوە بزانێت.. چەند جارێکیش بە دەستی «سالار»ی برایدا نامەیان بۆ نارد و ئەم هەر وەڵامی نەدانەوە.. لەگەڵ یەکێ لە نامەکاندا وێنەی «ئارام»ی نۆبەرەشیان بۆ ڕەوانە کردبوو و ئەم لە جام و چوارچێوەیەکی جوانی گرت.. بە دیوارەوە هەڵیواسی و دەیان جار بە سەعات لە بەرامبەریدا دەوەستا.. لە سیمای وردەبووەوە و دەچووە خەیاڵی قووڵ قووڵەوە.. خۆیشی نەیدەزانی بۆچی بەم ڕادەیە خۆشیدەویست و ئەو هەموو جوانیە چی بوو لەو بزەیەی سەر لێویدا دەیبینی.. خەیاڵەکانی بە ناخی ڕابرووودا ڕۆدەچوون و بیرۆکەی سەیر سەیریان هەڵدەهێنجا.. لە ئاستیاندا دەحەپەسا و نەیدەزانی هیچیان لە بارەیەوە بڵێ.. «هاوژین»ی کوڕیشی هەر زوو زوو پێی دەوت هەڵیبرێت و ماچی بکات.. بە شێوەیەکی زۆر جوان دەمە بچکۆلەکەی دەخستە سەر کوڵمی و چەند بڵێی سەیر دەیوت:

ــ بەبەکە خۆشدەوێم.

ئێوارەیەک تازە لە حەمامەکە هاتبووە دەرێ و لە بەرامبەر ئاوێنەی ژوورەکەی قژە درێژەکەی وشکدەکردەوە، کاتێکی زانی «هاوژین» و کوڕێکی هاوتەمەنی خۆی لە دەرگا پەیدا بوون و ئەم لە ئاوێنەکەوە بینینی.. لەپڕ

هەستـایەوە و لای کردەوە.. ئـەمەی بەلاوە سـەیر بوو و سـەری لێ دەرنەدەکرد، بگرە هەندێکیش تووڕە بوو.. یانی چی کوڕەکەی وەکو دز خۆی دەکا بە ژووری نووسـتنەکـەیدا و کـەسـێکی دیکەیشی لەگـەڵ خـۆیدا هێناوە..!! سـەرنجی لە سیمای دا و بڕێک پەشـۆکاو هاتە بەر چاوی.. باڵابەرزێکی کەمێ باریک.. قژە ڕەش و خـاوەکـەی لەسـەر مـۆدێلی ئەو ڕۆژگـارە بڕیبوو و سـمێـڵـە تەنکەکەی لەگەڵ ئەو دەمـە بچکۆلەیەی و گـووپـە پـەمـەییـەکانی زۆر دەگونجـا.. بە کـورتی هەرزەکارێکی جوان و ڕێکپۆش بوو، بەڵام نابێ بزانێ بۆچی هاتووە..؟!

ــ دایە ئەم کوڕە ناناسی..؟!

ــ باوەڕ ناکەم، بەڵام دیارە هاوڕێیەکی تازەی تۆیە.

ئینجا بەدەم بزەیەکی دەستکردەوە لێی ڕاما و پێی وت:

ــ فەرموو با بچینە ژوووری میوانەکە.

«هاوژین» پڕکێشی کرد و بە دایکی وت:

ــ ئەم هاتووە بۆ ئەم ژوورە و ئیشی بێرەیە.

چەند جارێ بە شـێوەی جیاواز جیاواز و بە سەریەکەوە دووبارەی کردەوە، کە هـەر دەتوت لەنێوان وشـەکاندا بۆ نوقڵێکی شیـرینی لەزەتبەخش دەگەڕێت و دەیەوێت بیـدۆزێتـەوە، تا بیـخـاتـە سـەر زمـانی و بیـمـژێت.. ئیـتـر ئەم تەواو حـەپەسـا و دڵـی زیاتر کـەوتە خورپە، بەڵام بەسـەر خـۆی نەهـێنا و ویسـتی لە ڕێگەی گاڵتەوە لێی تێبگات:

ــ من ئامـادەم بۆ میـوانی ئاوا خـۆشـەویست، نەک ئەم ژوورە، بـگرە هەمـوو ماڵەکە چۆڵ بکەم.

هاوڕێکەی کە تا ئەو کاتە هـیچی نەوتبوو، چاکتر لە چاوەکانی «سامـاڵ»ی ڕوانی و وتی:

ــ هاوژین هـەندێ مـەسـەلەکەی گـەورە کـرد. من هاتووم بۆ بینینی تۆ، بەڵام حەز دەکەم سـەیری ئەو وێنەیەی منداڵیی خۆشم بکەم.

ــ کەواتە تۆ ئارامی..؟!

گـرتیــە باوەشــی و چەند مــاچێکی کـرد، بەڵام زۆر بە گـەرمی نـا و بە لای باسـی دایک و باوکـیـشـیـدا هەر نەچوو.. «ئارام» لە کـاتێکدا لە بەرامـبـەر

وێنەکەی خۆی وەستا بوو و لێی ڕادەما، بە «سامال»ی وت:

ــ وا بزانم زانیت ئەو ساڵە ماڵەکەمان سووتا و هیچی تێدا دەرباز نەبوو، بەڵام من لە هەموو شتێ زیاتر سوێم لە ئەلبوومەکان بوو.. هەر باشە ئەم وێنەیەم لای ئێوە ماوە.

«سامال» زانی کوڕەکەی لە ماڵی پوورەکانی لە بەغدا دیویەتی و ناسیویەتی، بەڵام لەوە تێنەدەگەیشت چی بە یەکەوەی کۆکردوونەتەوە.. دوایی زانی ئەو هەتیوە سەرەڕۆیە پشتی کردۆتە دایک و باوکی و بە دزیەوە هاتۆتە هەولێر.. لە هەڵسوکەوتەکانیشیان کەوتبووە گومانەوە و هەستی بە ترسێکی زۆر دەکرد.. شەو تا درەنگ نەدەنووستن و بە چپە دەدوان.. لەپڕ دەرگای حەوشەیان دەترازاند و بە ئەسپایی دەچوونە دەرێ.. هەستی دەکرد لەگەڵ کوڕەکەی خەریکی کارێکی یاساغن، بەڵام ڕێک نەیدەزانی ئەو شتە چییە.. زۆر جار لەپڕ بە فێڵی چا و نوقڵ و بستە و شتی دیکەوە خۆی دەکرد بە ژوورەکەیاندا و سەرنجی لە دەموچاویان دەدا.. تا جارێکیان یەک دوو کتێبی ڕەنگهەڵبزرکاوی پێ دین و لە بەشێکی مەسەلەکە تێگەیشت.. نەشیدەوێرا لێیان بپرسێ، چونکە کوڕەکەی تووڕە دەبوو.. فێری ئەوە بووبوو هەڕەشەی دەکرد و دەیوت ماڵەکە بەجێدێڵێت.. ئەو شەوەی «هاوژین» و یەک دووانێ لە هاوڕێکانی دیواریان نووسیبوو و کەوتبوونە بۆسەوە، ئەو ڕایکردبوو.. «سامال» لەوە زیاتر خۆی بۆ نەگیرا و لە ماڵەکەی بە دەر نا.. وێنەکەی لە دیوار کردەوە و خستیە ناو دەستی:

ــ بگرە و تۆوت لەم ماڵەی من ببڕێتەوە. خێرم لە دایک و باوکت نەبینی، هەتا لە تۆی ببینم.

دوای ئەوەی پەنای بۆ مێردەکەی «هیام» برد و دوا خانوو و ئۆتۆمۆبیلەکەی ژێر خۆیشی خستە سەر ناوی ئەو.. کوڕەکەیان بەردا و لە سەیداوە بوون بە کرێچی.. ڕۆژێکیان چوو بۆ لای «ئارام»، کە وێنەی کەسێکی لانەواز و سەرگەردان لەناو شوقە تەواونەکراوەکانی ئیسکان دەژیا، پێی وت:

ــ گیانی کوڕەکەمت خستە دۆزەخەوە و بەو موڵک و ماڵی هەمبوو کڕیمەوە.. ئیتر تکات لێ دەکەم وازی لێ بێنە، چونکە کرێچیەکم و بە هەزار حاڵ کرێم

پێ دەدرێ.. ئەمجارە دەبێ وەکو هەر دایکێکی تر سنگم بکوتم و قوڕی بۆ بپێوم.

کاتێ هاتەوەش چەند بۆی گریا.. دیمەنەکەی دەهێنایەوە بەر چاوی و فرمێسکی بۆ دەڕشت.. پەنجەرەکانی بە گوش و مقەبا گرتبوو و لە سەرما هەڵدەلەرزی.. ڕەنگوڕووی شێواو.. جلەکانی پەڕپووت و دڕاو.. وێنەکەی منداڵیی خۆی بەو دیوارەوە هەڵواسی بوو و دنیایەک تۆزی لەسەر نیشتبوو.. ئەو شەوە لە حەژمەتان تا درەنگ خەوی لێ نەکەوت، بۆیە بەیانی چوو بۆ لای و پێی وت:

ــ تۆ پێم ناڵێی چییت لەم ژیانە دەست دەکەوێ..؟! بۆچی ناچیتەوە لای دایک و باوکی خۆت..؟!

نانێکی بازاڕی لەسەر ئەژنۆی خۆی دانابوو.. جار جار کەمێکی لێ دەکردەوە و بەدەم ڕوانین لە چاوەکانی «سامال»ەوە دەیخوارد، کەچی هیچی نەدەوت.. ئەم زوو زوو دەچووە سەردانی و ئامۆژگاریی دەکرد، تا بینێرێتەوە لای دایک و باوکی، بەڵام ئەو هەرگیز زمانی لە ئاستیدا هەڵنەدەهێنایەوە.. ئەم هاوکات مەبەستی ئەوەش بوو بزانێ کوڕەکەی هامشۆی ناکات.. «هاوژین» ئەوسا دڵی بە تیری «هیام» پێکرا بوو و زۆربەی کاتی خۆی لەوێدا بەسەر دەبرد، مەگەر جار جار، ئەویش بە دەگمەن بهاتبا بۆ لای و بەدەم گریانەوە باسی موعاناتەکانی خۆی بۆ بکردایە.. یان بۆئەوەی بزانێ چی بەیاننامە و کتێبی تازە هاتووە و ئەرکە تازەکانیشی چیین.. خۆشبەختانە ئەو جارانەش دایکی نەیدەبینی.. ئێواران هەرچی هەرزەکاری وەکو خۆی و لە خۆی گەورەتر هەبوون لای کۆدەبوونەوە و ئاوەدانییان دەخستە ئەوێ.. کەس باوەڕی نەدەکرد ئەو ڕۆژێک لە ڕۆژان کوڕی ماڵێکی خواپێداو بووبێت.. بەرگەی برسیەتی و سەرما و نەبوونیی دەگرت و ژیانێکی تا بڵێی سەختی بەسەر دەبرد.. کتێبی لە کتێبخانەکانی بازاڕ دەدزی و لە کەلاوەکەی دەیخوێندنەوە.. دوایی بە نیوەقیمەت دەیفرۆشتنەوە و نانی پێ دەکڕین.. شیعری دەنووسی و بەو دەنگە بەسۆزەی بۆی دەخوێندنەوە.. زمانێکی ڕەوانی هەبوو و بە شێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش دەدوا، کە «هاوژین» زۆر پێی سەرسام بوو و هەندێ جار

لاسـاییـشی دەکردەوە.. بە کورتی لەو کوڕانە بوو، کە دەتوانن لە مـاوەیەکی کەمدا خۆیان بە خەڵکێکی زۆر بناسێنن و ببنە جێگای بایەخ و متمانەی ئەم و ئەو.. هـەر بۆیە کـاتێ ویسـتـیـان بیگرن و خـۆی گـەیانده شـاخ، بێـجگـە لە «هاوژین» دەیان هەرزەکـار و گـەنجی دیکەی گـەڕەکـەکـانی ئەو دەوروبەرە بە گـەڵی کـەوتن.. ئەو لە شـاخـیش بە شـێـوەیەکی جـیـا لە هاوڕێکانی دەژیا و هەڵسـوکـەوتـەکانی لە هـی چەکدار نەدەچوون.. ئـەرکـەکـانی بە چاکی ئەنجـام نەدەدا.. یاخی دەبوو.. زمـانی درێژ دەکرد.. ڕەخـنـەی دەگرت.. دەینووسـی و لە پەنا و پەسارەکان بە چاپی دەگەیاند.. ئەنجام گیرا و خستیانە ئەو بەندیخانە بەرزەی، کـە دەتوت لە ئاسـمـانەوە هـەڵیـانداوەتـە خـوارێ و شـاخـەکـان لە هـەر چوار لاوە گرتوویانەتەوە.. هـیچ کـەسێ نەیدەزانی وەکـو «شـاخـەوان جـەنگۆ»ی بەندیـەوانی وەسـفی بکات و کـەسـیش بە قـەدەر ئەو لەزەتی لـە جـوانـیـیـەکـەی نەدەبینی.. ئەمەش لەو نامانەدا دەردەکەوێت کە بەردەوام بۆ «ساماڵ»ی دایکی دەیناردن و هـەر جـارێ بەشێک لـە نهێنیی جـوانیی ئەوێی دەردەخـست.. لەوێوە بە تاقـە چـاوێکی کز و نەخـۆش دەیـتـوانی ئاسـۆ دوور دوورەکـانی هـەر چـوار لا ببینێت و خـەیاڵەکانی سـەرتاپای تەمـەنی بخـاتە کـار.. ئەو شـوێنـە توانایەکی گەورەی پێ بەخشیبوو و دەیتوانی بە قووڵاییی شتەکاندا ڕۆبچێت.. پێشبینیی کـارەسـاتەکان بکات و ورد ورد لێکیـانبداتەوە.. هـەر بۆیە هەمیـشـە ترسـێک ئابلۆقەی دابوو و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ژیانی بەرەو مەرگەساتەکان ڕاپێچ دەکرد.. ترسـی هـەرەسـی شـۆڕش و وێرانبـوونی سـەرجـەم بەهاکـان.. هەمـوو ئەمـانەش وایان لێدەکـرد ئەرکەکانی بە چاکی بەجێبێنێ و ڕێکوپێک دیسـپلینەکان لە بەرچاو بگرێت.. سـەرەتـا وەکـو کـارێکی بێبـایەخ سـەرنجی دەدا و وایدەزانی ئەمـە شـیـاوی ئەو نیـیـە، بەڵام دوایی بۆی دەرکـەوت لە هەمـوو کـاتێکی دیکە چاکتـر دەستەڵاتی بـەسەر گۆڕینی چارەنووسـەکاندا دەشکێ.. ئیشی دەکرد و وەسـتانی نـەبوو.. پەرەی بە ئەزمـوونەکانی دەدا و پێشـی لەو تۆفـانە دەگـرتەوە، کـە هـەر خـۆی دەیزانی کـاتێ هەڵدەکـات، چۆن ورد و درشت نقـووم دەبێت و ئاسـەواری ئەو ناوچەیە لـەسـەر زەوی دەسـڕێتـەوە.. جار جار پێشـبینیـەکانی دەنووسـیـیـەوە و بۆ گـۆڤـار و ڕۆژنامـەکـانی شـۆڕشی دەنارد، بەڵام لێی

تێنەدەگـەیشتن و بە چاوی سووک دەیانخـوێندنەوە.. گاڵتـەیان لێ دەهات و بە هانایەوە نەدەهاتن.. قسـەکانیـان وەکو نوکتە دەگێڕانەوە و کۆڕیان پێ گەرم دەکردن.. ئەمانەش ڕقیان هـەڵدەستاند و لە داخـا خـۆی دەخـواردەوە.. ئای لە نەفامـیی ئەوانەی لە خـوارەوە شـتـەکان دەبینن و سـەرپێیانە سـەرنجـیان لێ دەدەن.. هـەتا ئەگـەر بێنـە سـەرەوەش، ناتـوانن وەکو ئـەم ئەو هـەمـوو نهێنییـە ببـینن و نازانن چ وەیشـومـەیەک بە ڕێوەیە.. ئەوان کـاتێکیش دەگـەنە ئەوێ، سـەرتاپایان نوقـومـی تاوانە و دڵیان پڕیەتی لە گومـان و غـایەلـەی بەد، بۆیە لە بینینی نهێنییەکان مەحرووم دەبن و ناتوانن قووڵاییی شتەکان ببینن.. ئەمەش هـەر خۆی بەڵگەی زیندووە، کە ئەوان ناخیان تا چ ئاستێک پڕیبووە لە خراپە و ئەم زیاتر هـەق بە خـۆی دەدا ئەشکەنجـەیان بدات.. دڵی لە ئاسـتیـاندا بووە بە بەردی شـــاخ و بـەزەییی بە هـیـــچـیـــانـدا نایەتەوە.. ئـاخ ئەم نـاوچەیـە لە چ مـەترسـیـەکی گەورە دایە و کـەسـیش وەکو ئەم هـەسـتـی پێ ناکات..!! تەنانەت ئەو پیـاوانـەی لە خــوارەوە بە وڵاغی گــەورە گــەورە گـیــراوەکــان بەســەر ئەم بەرزاییــە دەخــەن و دەیانگەیننە دەست ئەم و «سـمکۆ قـەڵغـان»ی هـاوکـاری، لێرەشـەوە تەرمەکان، یان ئەوانەی تۆبەیان کردووە و پاکبـوونەتەوە، دەبەنەوە، ناتـوانن لەوە تێـبگەن ئەگـەر ئاوا بڕوات چارەنووسی ئەم شــۆڕشــە بە کـوێ دەگـات.. ئـەوان سـیـمـایەکی ئێـجگار عـەنتـیکەیان هـەیە و بە زمـانێکی زۆر ســەیریش دەدوێن.. کـەس نازانـێ تەمـەنیـان چەندە و چەندی دیکەش دەژین.. ئەم یەکـێکە لەوانـەی لێـیـان تێـدەگـات و باوەڕی وایە هـەمـوو کـەسـێکیش لە توانایدا نیـیـە بیانبـینێت.. ئیـتر چۆن شێت و هـار نەبێت و سـەری دنیـای لێ نەیەتەوە یەک.. بۆچی دەست لە گیراوەکان بپارێزێت و بەزەییی پێدا بێنەوە.. وا دەزانێت کرێکارێکە و لـە کارگەی بووکەشـووشـەدا کار دەکات.. «دلارام»ی دایکی «ئارام» هـات و بەسـەر دەست و قاچیـدا کەوت.. پاڕایەوە و قـژی خـۆی ڕنیــەوە.. گـریا و پڕ بـە هـەمـوو ژوورەکـان فـیـزاحی لـێ هـەسـتـا.. سـەری بە دیوارەکـاندا کـێشـا و بوورایەوە، بەڵام گـوێی لێ نـەگرت و لاشـەی شـێـواوی کــوڕەکــەی لـەگــەڵدا ناردەوە.. دوای ئـەوەی «ســمکۆ قــەڵغــان»ی هـاوکــاری بەجێـیـهـێشت و چەکی دانا، ئەم بەتەنیا مایەوە و ئیشـەکانی ئەویشی گرتە

ئەستۆ.. ئەم هەرگیز وازی نەدەهێنا و دەیویست سەرتاپای تەمەنی بۆ تەرخان بکات، بەڵام ئەو بەفرە زۆرە هەموو پلانەکانی گۆڕی و ناچار گیانی بە دەست چارەنووسێکەوە دا، کە هەرگیز بە شایانی خۆی نەدەزانی.. ئەو ڕێگایانە گیران و پەیوەندیەکان لەنێوان ئێرە و خوارەوەدا پچڕان.. گیراوی تازە نەدەهات.. پلانی تازە نەدەهات.. ئیعازی تازە نەدەهات.. ئازووقەی تازە نەدەهات.. سەری لێ تێکچوو.. شپرزە بوو.. ئەم سەر و ئەوسەری دنیای لێهاتەوە یەک.. ئەوە یەکەمجارە ئەو شوێنە بەفری لێ ببارێت.. دەڵێن لەوەتەی دنیا دنیایە ئێرە نە بەفر و نە باران و نە تەرزەی لێ نەباریوە.. لە کاتێکدا هەموو ئەو دەوروبەرە سپی دەچووەوە، ئەوێ ڕەنگی قاوەییی خۆی هەر ون نەدەکرد.. ئەدی ئەوە چی بوو..؟! ئەو بەفرە ئەستوورە چی بوو باری خودای گەورە..!! نیشانەی تۆفانەکەیە و هیچی دی.. ئا ئەمە ئەو کارەساتە بوو، کە لێی دەترسا.. دەبووایە بۆ یەکەمجار و لە خۆیەوە، بەبێ فەرمانی گەورەکانی خوارەوەی بڕیار بدات و جێبەجێی بکات.. لە مردنی خۆی چاکتری شک نەدەبرد، بەڵام دوای ئەوەی دەیتوانی بەردەوامیی بەندیخانەکەی مسۆگەر بکردایە.. ئەم لە دەستی دەهات هەموو بەندیەکان بکوژێت و خۆی بە تەنیا بمێنێتەوە.. ئیتر تا بەفرەکە دەڕەویە و ڕێگاکان دەکرانەوە، ئەو ئازووقەیەی لە ئەمارەکەدا هەبوو، بەشی دەکرد، بەڵام ئەمە سەرپێچی بوو لە فەرمانی گەورەکانی، چونکە گیانی ئەوان تا ئەوسا ساغ نەبووبووەوە ئاخۆ هی خۆیانە یان هی کێ.. ئەمە تەنها دوای ئەو ئەشکەنجەیە ڕووندەبووەوە، کە ئەم بە پێی پلانەکان ئەنجامی دەدان، بەڵام ژیانی خۆی دەمێک بوو بەخشی بوو و ئەوان ڕەزامەندییان لەسەر مردنی پیشان دابوو.. ئەوەتا دەست و قاچیانی کردەوە و سەرجەمی ئازووقەکەی بەسەردا بەشکردن.. دەرگاکەی بە کلیلەکە بەسەر داخستن و لەوێ بە خەنجەر ورگی خۆی هەڵدڕی، بۆئەوەی کاتێ بەفرەکە دەتوێتەوە و ڕێگاکان دەکرێنەوە، یەکێکی دی ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆی خۆی.

دانمارک ١٩٩٩

* ئەم چیرۆکە هەر لە سەرەتاوە خۆی لە هەموو ئەو چیرۆکانە جیاکردەوە، کە

رۆمـانی «ئای لەڤـیلیـا لەڤـیلیـا..!!»یان پێکهـێنا و ویسـتی بەجـیـا بژی، بەڵام پەیوەندیی دۆستانەی خۆی لەگەڵ ئەواندا پاراستووە.

سوپاس:
ـ بۆ برای هۆشـیـار و ئەدەبدۆست «کـاک هێـمن عومـەر»، کـە ئەم بەرهەمـەی لە هەڵەی چاپ پاککردەوە.
ـ بۆ هـاوڕێی خۆشـەویستم «کاک عەبدوڵڵا قادر دانسـاز»، کە لە چاپکردنی ئەم کتێبەدا یارمەتیی دام.
* بۆ بـرای هـۆشـیـار و ئەدەبـدۆست «کـاک هـاوار ئـالانی»، کـە دەسـتنووسی هەندێ لە چیرۆکە کورتەکانی لای خۆی پاراستبوو.

**بەرهەمی چاپکراوی نووسەر:**

ــ ئەسپیدیلۆن: کۆمەڵەچیرۆک، چاپی یەکەم، کتێبی ڕابوون، ژمارە١١، سوێد، ١٩٩٨.

ــ ئای لەڤیلیا لەڤیلیا..!! ڕۆمان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، کوردستان، ٢٠٠٠.

ــ مناڵیم ئاسکێک بوو بەسەر پەلکەزێڕینەکاندا بازبازێنی دەکرد، سەربردەی ژیانی مناڵیی نووسەر تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی، بەشی یەکەم و دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، کوردستان، ٢٠٠١.

**بەرهەمی چاپنەکراو:**

ــ خەوننامەی دادە سۆزی، کۆمەڵەچیرۆک